


نەجاتی عەبدوڵڵا

# کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی

لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی پەیوەندییە سیاسییەکاندا

١٦٣٩ - ١٨٤٧

بەرگی یەکەم

هەولێر
٢٠٢٢

# کوردستان و

# کێشەی سنووری ئێرانی ـ عوسمانی

لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی پەیوەندییە سیاسییەکاندا

١٦٣٩ - ١٨٤٧

بەرگی یەکەم

نەجاتی عەبدوڵڵا

# کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی - عوسمانی

لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی پەیوەندییە سیاسییەکاندا

١٦٣٩ - ١٨٤٧

بەرگی یەکەم


هەولێر
٢٠٢٢

بیروڕاگەلێك کە لەم کتێبەدا هاتوون، بەرپرسیارێتی سەرلەبەریان تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنی، ئەکادیمیای کوردی لێیان بەرپرس نییە.




* ناوی کتێب: کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی: لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی پەیوەندییە سیاسییەکاندا 1639-1847.
* نووسەر: د. نەجاتی عەبدوڵڵا.
* بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی (بەرگی یەکەم).
* بەرگ و سەرپەرشتیاریی هونەری: عوسمان پیرداود .
* خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
* نەخشەسازی: عیسام موحسین.
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (471).
* چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر.
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(398)ی ساڵی 2022ی پێدراوە.

**بۆ جگەرگۆشە خۆشەویستەکانم**

**ژوان و**

**ژینۆ و**

**هێلین**

**دیاریی و پێشکەشە**

## لە بری پێشەکی

ڕەنگە خوێندنەوە و دووبارە شەنوکەوکردنی مێژووی پەیوەندییە سیاسییەکانی ئێران و عوسمانی بەتایبەت لە سەدەی شانزەهەم بەولاوە بۆ ئێمە لەچەند سەرێکەوە گرینگ و پێویست بێت. گرینگ بێ لەبەرئەوەی لە سەدەی پانزەهەمەوە کوردستان تازە خەریك بوو بەدوای ئەوەدا دەگەڕا فۆڕمێك بۆ قەوارەی خۆی بدۆزێتەوە یان هەر هیچ نەبێ ئەوەی بە زمانی ئەمڕۆ وای پێی دەڵێن بەدوای کۆنفیدراسیۆنێکی خێڵەکیدا دەگەڕا، کە وەڵامی پێویستیە خێڵەکییەکان و دابەشبوونی جوگرافیایی خێڵەکانی بداتەوە. دروست لەو سەروبەندەدا بوو، کە جەمسەرێکی دیکەی زۆر بەهێزی (عەقایدی و مەزهەبیی) لەبەرانبەر جەمسەری دەوڵەتی عوسمانی سوننیگەرا قوتبۆوە. پێکدادان و بەریەککەوتنی ئەم دوو جەمسەرە زۆر دەمودەست و زۆریش خوێناوی بوو، ئەو لۆژیکەی ناکۆکییەکانی یەکلادەکردەوە تەنیا شمشێر و هێز بوو. دروست لەو کاتەدا کورد کە هێشتا لەو دەورانەدا فۆرمی (نەتەوە) یان (میللەت)ی وەرنەگرتبوو کاتێك کەوتە ناو بەرداشی ململانێی خوێناوی نێوان ئەم دوو هێزە گەورەیە، کە چ بە ژمارە و چ بە توانا و چ بە جوگرافیا و چ بە فەرهەنگ لەگەڵ کورد بەراورد نەدەکران. کوردستان لەبەرەبەیانی مێژووەوە سنوورێکی دیاریکراو و کۆنترۆڵکراوی نەبووە تا لەلایەن دەسەڵاتێکی کوردییەوە ناسنامەکەی بۆ هەموو لایەك بەرچاو و قەبووڵکراو بوویێت، بەڵکو هەمیشە وەك گروپگەلی بچووك و خاوەن ناسنامەگەلی جیاواز و پێکناکۆك

ژیاون و هەڵسوکەوتیان کردووە. ڕەوتی پەرەسەندنی مێژوویی ئەم میللەتە ئاوا هاتووە و ئەم فرە گروپیی و فرە ناسنامەییە دواجار بەوەدا شکاوەتەوە، کە هیچ کاتێك یەکێتییەکی نەتەوەیی بۆ دروست نەبێت و نەتوانێت دروستی بکات. بۆیە لە ڕەوتی ململانێی چوار سەدە زیاتری نێوان ئەم دوو هێزە گەورەیە، (کورد) یان ڕاستتر بلێین (کوردەکان) نەیانتوانیوە ببن بە ژمارە و لە گوریسگوریسێنی نێوان ئەم دوو هێزە تەنیا وەك گروپەیلی عەشایر و خێلی سەر بەم دەوڵەت یا بەو دەوڵەتی هاوسێ خۆیان نمایش کردووە.

کورد نەیتوانیوە سوود و بەهرە لە ئاین وەربگرێ. ئاین لای کورد تەنیا بۆ (عیبادەت) یان (پەرستن) بووە و بەس. هەرچی لای تورك و فارس و پێش ئەوانیش لای عەرەب بووە، ئاین هەم (دەسەڵات) و هەم (عیبادەت) بووە. ڕەنگە لە هەموو مێژووی کورددا، تەنیا دوو هەوڵدانی سەرنەکەوتوومان هەبێ، کە کورد ویستبێتی ئاین هەم وەکو (دەسەڵات) و هەم وەکو (عیبادەت) بەکاربهێنێت. یەکەم هەوڵ لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم تەقەڵای مەولانا خالیدی نەقشبەندی بوو، کە (ئەگەر) سەرکەوتوو ببوایە (ڕەنگە) هاوکێشەکە ئەمڕۆ بەجۆرێکی دیکە بوایە. دوای ئەوە هەوڵی دووەم و کۆتایی لە چارەگی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا بزووتنەوە چەکدارییەکەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری بوو، کە هەردووکیان ویستیان دوانەی (دەسەڵات) و (ئاین) لای کورد بەیەکەوە کۆبکەنەوە، یەکەمیان بە شێوازێکی ئاشتییانە و (بێ چەك)، هەرچی دووەمیان بوو بە شێوازی خەباتی (چەکداریی) و دواجاریش هەردوو هەوڵەکە شکستیان خوارد. بۆیە لە بۆشایی نەبوونی دەسەڵاتی کوردیدا، کورد ناچار بووە هەرهیچ نەبێ هاوسەنگەری هاومەزهەبەکانی بێ.

ڕەنگە هۆیەکی گەورەی هەموو شکستی هەوڵدانەکانی کورد زیاتر بەشێوەیەکی سەرەکی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەو سەردەمانەدا سروشتی

ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵی کوردەواری کە لەسەر بنەمای خێلەکی (هۆزگەرایەتیی) و لەسەر شێوازی بەرهەمهێنانی تایبەت بە کشتوکاڵ ڕێکخراو بوو و نەخواش لەسەر ئاژەڵداریی، کە لە کەشوهەوایەکی زۆربەی جار سەختی چیایی زۆر بە گۆشەگیرییەوە لەگەڵ یەکتر ژیاون. لەم شێوازە ژیانەشدا (تاك) ناتوانێ بەبێ هۆز و عەشیرەت هەبێ و ئەوە پەیوەندی خوێنە، کە ئەندامی هۆزەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و دواتریش وابەستەی ملکەچ بوونێکی بەردەوامیان دەکات بۆ سیستمی هۆزگەرایەتیی. بەو شێوەیە کورد هەمیشە لەناو ڕەوشێکی بەسەرخۆداشکاوە و گۆشەگیردا ژیاوە بێ ئەوەی شیمانەی ئەوەی ببێ بتوانێ لەناو پێکهاتەیەکی سیاسیی جیاواز بەدیاربکەوێ کە ڕێگەی پێ بدات لەم شێوازە بەرتەسکەی نوێنەرایەتیی کردن بچێتە دەرەوە[1]. بێگومان لەم ڕەوشەدا کاتێك کۆمەڵ و هێزی ناوەندیی نەتەوە دروست نابن و هێزی گۆشەگیری بچووك بچووك و پەرتبوو لە سیستمی دووجەمسەربەندیی بەهێزدا تەنیا یەك ڕێگەی بۆ دەمینێتەوە، ئەویش خۆ دانە پاڵ یەکێك لە یاریکەرەکانی سەرگۆڕەپانەکەیە و ڕازی بوون بەوەی ئەو یاریکەرە لەپەنای خۆیەوە لە دەستدرێژییەکانی لای بەرانبەر بیپارێزی و هەموو مێژووی کورد لە چوار سەدساڵی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بەم جۆرە بووە. بێگومان دەبێ ئەوەش لەبەرچاوبگرین جەنگ بۆ خۆی لای هۆزی کورد بەشێك بووە لە کولتووری جیانەبووەی هۆزایەتیی کورد و بەبێ ئامادەیی داگیرکەریش کورد هەر لەناوخۆیاندا خەریکی شەر و پەلاماری یەکتر دان بوون. بریتشاردز وای دەبینێ کە لەنێوان هۆزەکاندا جگە لە جەنگ شتێکی تر نییە و ئەمە جیهانی هۆز لەگەڵ جیهانی کارگێڕیی دەوڵەتیی جیادەکاتەوە، کە دەوڵەت بەگوێرەی ماکس

[1] Chagnollaud, Jean-Paul et Souiah, Sid-Ahmed, Les frontières au Moyen-Orient, Ed. L'Harmattan, Paris, 2004, p.45

ڤیبەر Max Weber مۆنۆپۆلی پراکتیزەکردنی شەرعیی زەبروزەنگ دەکات[1]. ئێرنست گیللنەر Ernet Gellner جوانی بۆچووە "ناسیۆنالیزم بەرهەمی نوێگەری و کۆمەڵی پیشەسازییە" و بەم پێیەیش بونیاتنانی نەتەوە بەرهەمی وەدیارکەوتنی کۆمەڵی مەدەنییە. بەپێچەوانەی ڕوانینی مارکسیستەکان گیللنەر لای وایە ئەوە کۆمەڵی پێش پیشەسازییە کە جیاوازی ئاسۆیی لەناو کۆمەڵەکان دروست دەکات لەکاتێکدا کۆمەڵی پیشەسازیی دیموکراتیەتی نەتەوەکان بەهێز دەکات، نەك چینەکان[2]. دواجار ئەندرسۆن لای وایە وەدیارکەوتنی نەتەوەکان لە ئەورووپا پەیوەند بووە بە سەرمایەداری و لەوێشەوە پیشەسازی و ڕۆژنامەوانی[3].

کورد لەمێژووی خۆیدا بە پرۆسێسێکدا ڕۆیشتووە ئەگەر بشێ ناوی بنێین دەتوانین بڵێین بە"لەبارچوون"ێکی بەردەوامی پرۆسیسی دروستبوونی "نەتەوە"دا ڕۆیشتووە، پرۆسیسێك کە هیچ کات زەمینەی لەدایك بوونی بۆ نەڕەخساوە. لە دروستنەبوونی (نەتەوە) و پێنەگەینی (من)ی کورد، سەرۆکهۆزی کورد بە ڕەعیەت و دەروێشی کوردەوە لەناو خاکی خۆیان شەڕیان بۆ سەروەری و شکۆی داگیرکەرەکانیان کردووە. دابەشبوونی عەقیدەیی لەناو کورد هەمیشە هۆکارێکی گەورەی یەکنەگرتوویی کورد بووە و لەبەرانبەریشدا هۆکارێکی بەهێزی نزیکبونەوەیان بووە لە داگیرکەرەکانی

---

(1) عبد الودود واد الشيخ، القبيلة والدولة في افريقيا، ترجمة: محمد بابا ولد أشفغ، منشورات الدار للعلوم والناشرين ومركز الجزيرة للدراسات، بيروت، 2013، ص 21

(2) Ernst Gellner, Nation et nationalisme, traduit de l'anglais par Bénédicte Pineau, Ed. Payot, Paris, 1994, p. 26.

(3) Bendict Anderson, L'imaginaire national, réflexions sur l'origine et l'essor du nationalisme, traduit de l'anglais par Pierre-Emmanuel Dauza, éditions la Découverte, Paris, 1996, p. 50.

خاکەکەیان. هۆزی کورد و سیستمی هۆزایەتیی کورد هێندە بەهێز و زیندوو و سەربزێوە هیچ هێزێك نەیتوانیوە لەناوی ببات و هەمیشەش بەردەوام خۆی نوێ کردۆتەوە و لەگەڵ هەر خۆ نوێکردنەوەیەکیش بەهێزێکی زۆر گەورەتر و چالاك تر و بەگوڕتر هاتۆتەوە مەیدان، بۆیە کۆسپی هەرە گەورەی بەردەم پرۆسەی بونیاتنانی نەتەوە لای کورد سیستمی عەشیرەتگەری و ئامادەیی هۆزە بووە، کە لەناو هەموو کایە و کێڵگە سیاسیی و کۆمەڵایەتی و جڤاتییەکانیی کۆمەڵی کورد بەبەردەوامی بە بینراو و بە نەبینراو ئامادە بووە. هەر بۆیەشە لە پرۆسیسی دووبارە داڕشتنەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دابەشکردنی ناوچەکە (1914-1920) کورد نەك هەر ئامادەنەبوو و خۆ ئەگەر دەنگێکی "کز"یشی هەبووبێ ئەوا دەنگی ڕووناکبیرانێکی دووره وڵات بوون، کە لە ڕاستیدا هیچ کاریگەری و شوێنەوارێکی ئاوهایان لەسەر کۆمەڵی کوردەواری نەبووە. بە کورتی نامەوێ بڵێم "بزووتنەوەی کورد" بەڵکو دەمەوێ بڵێم "بزووتنەوە کوردییەکان" هیچ کات بەرهەمی لەدایك بوونی سروشتی کۆمەڵی کورد و پەرەسەندنی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیی کورد و ناسیۆنالیزمی کورد نەبوون ئەوەندەی بەرهەمی دەرفەت و هەلی بەدەستهاتووی هەرێمایەتیی بوون، بۆیە کورد بەدرێژایی مێژوو خاك و سەرزەمینی خۆی هەبووە و لەسەریا ژیاوە بەڵام هیچ کات تاکێکی "کورد"ی نەبووە، کە خۆی بە ئەندامی جڤاتێکی گەورەتر لە خێل و عەشیرەتەکەی خۆی زانیبێ و گەورەتر لە خێڵ و دەڤەر و ناوچە و دیالێکت و مەزهەبی تایبەتی خۆی بیری کردبێتەوە. بەم جۆرە لە کۆمەڵگەیەکی ئاوها (بیری ڕزگاری نیشتمانی بۆ خۆی هیچ مانایەکی نابێ لەناو مێشکی خەڵکانێك کە ڕاهاتوون تەنیا وەکو ئەندامی گرووپێکی بچووك بیربکەنەوە کە ئەو کۆمەڵە بچووکانە بۆ خۆیان یاسای کۆمەڵایەتی تایبەتیی خۆیان هەیە و تەنیا لەگەڵ خۆیان دەگونجێ. لە ڕەوشێکی ئاوهادا دەستەبژێری

ڕێکخراو ئەوانیش هەر لەسەر هەمان سیستم بەڕێوە دەچن و ئەستەم دەبێ بتوانن ئەم میللەتە جۆش بدەن بەنیازی دامەزراندنی دەوڵەت، بۆیە لەوکاتە بیری ڕزگاریی نیشتمانیی جگە لە بیرۆکەیەکی سیاسیی لە ڕۆژئاواوە هاتوو هیچی تر ناگەیەنێ. واتە چەمکێك دەبێ بەمانای وردی وشەکە دوور دەبێ، کە ناتوانرێ وێنا بکرێ).

بۆیە دەبینین لە سەدەی نۆزدەهەم و هەروەها لە سەرەتای سەدەی بیستەمیش کاتێك بڕیارە چارەنووسسازەکان دران لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کورد چونکە لەناو کۆمەڵێکی پارچەپارچەبوو و لێکترازاو و لەبەر یەکهەڵوەشاوەی عەشیرەتیی ژیاوە، نەیانتوانیوە داخوازینامەی نەتەوەیی ڕاستەقینەی خۆیان دابڕێژن، گەرچی برێك لە سەرۆکەکانیان لە برێك کات ویستوویانە بەبێهوودەیی ئەمە بکەن[1]. دیارە نابێ لێرەدا هەرگیز ئەو ڕاستییە لەبەرچاو ون بکەین کە کورد هەمیشە وەك گرووپی هۆزگەل و کۆمەڵەی زۆر بچووك بچووکی پەرتوبڵاوی خاوەن تایبەت بە ناسنامە، دیالێکت و مۆدی ژیان و جیهانبینی تایبەتیی خۆیان ژیاون و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵە خەڵکە لەبەرەبەیانی مێژووە تا ئێستا ئاوها ڕۆیشتووە، بۆیە دەبینین هەر لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تا کۆتایی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی و دووبارە دارِشتنەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (1914-1920) هەردوو ئیمپراتۆریا زۆر بەئاسانی و سەرکەوتوویی توانیویانە وەکو گروپگەلی جیاجیا و شەڕکەر بە ئاسانی کوردەکان کۆنتڕۆل بکەن و بە ئامانجی خۆیان بەکاریان بهێنن و لەپێشەوەی جەنگاوەرەکانی خۆیان بەرانبەر بە یەك شەڕیان پێ بکەن و تەنیا وەك جەنگاوەری ئازا و شەڕکەر وەسپیان بکەن.

---

(1) Chagnollaud, Jean-Paul et Souiah, Sid-Ahmed, op.cit, p.46

خالێکی دیکە کە زۆر گرینگە لێرەدا پێی لەسەر دابگرین ئەوەیە کورد هەم لەڕووی زمان، هەم لەڕووی ئایین و هەم لەڕووی ئیتنیکیشەوە خاوەنی کۆمەڵێك ناسنامە و دابەشبوونی پەرشوبڵاوی مەزهەبی و گروپەیلی ئیتنیکیی زۆرە، کە ئەوە هێندەی دیکەی کێشەی دروستبوونی لەدایکبوونی (نەتەوە)ی دواخستووە. ئەم هەوڵەی ئێمە ڕەنگە هەوڵدانێکی زۆر بچووك بێ بۆ گێڕانەوە (ڕیوایەت)ێکی مێژوویی کوردیی بۆ مێژووی کورد لەناو گێژەنی پەیوەندییە سیاسییەکانی ئەم دوو هێزە گەورەیە لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تاوەکوو پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم. لە نەبوونی ئەرشیڤخانەی کوردی و نەبوونی سەرچاوەی نووسراوی کوردیدا، ڕەنگە ئەمە تەنیا هەوڵدانێکی پەرشوبڵاویێ بۆ ئەوەی لە پەراوێزی سەرچاوەگەلی جیاواز جیاواز و زمانەیلی جیاوازی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی بەدوای پارچە شکاوەکانی مێژوومانددا بگەڕێین، جا چەندە توانیومانە ئەو پارەچە زۆر و تێکشکاو و ونبوانەی مێژووی (کورد) لەم ماوە مێژووییەدا دوورودرێژەدا بدۆزینەوە، ئەوە بۆ حوکمدانی ئێوە و بۆ پسپۆرانی بواری مێژوو بەجێدەهێڵین و بەهیواین لەڕێگەی ئەم کتێبەوە پسپۆرانی دیکەی لەئێمە بەتواناتر و دەستڕۆیشتووتر بەدوای پارچە شکاوەکانی دیکەی ئەم مێژووە ونبووەدا بگەڕێن، تا دواجار تابلۆکە وێنەیەکی مێژووی (هەمووان) بەدەستەوە بدات، بۆیە هەرهیچ نەبێ با لەسەر (کاغەز) ئەم وێنەیە دروستبکەینەوە، ئەگەرچی ئەم وێنەیە وێنەیەکی تەواویش نەبێ، بەڵام هەر وێنەیەك دەبێ نزیك لە ڕووداوەکان و بەتەک ڕاستییەکان.

**نەجاتی عەبدوڵڵا**

**فەرەنسا- پواتیێ**

**11ی تشرینی یەکەمی 2020**

## بەرایی

### نووسینی پرۆفیسۆر فرانسیس دێمیێر *

نەجاتی عەبدوڵڵا نامەی زانکۆیی مێتریز و دوایی نامەی D.E.A و تێزەکەشی هەر لەژێر سەرپەرشتی مندا هەڵبژارد و ئەوە بۆ من مایەی پێخۆشحاڵییەکی زۆر بوو، کە لە زانکۆی پاریسی دەیەم پێشوازی لە قوتابییێک بکەم، کە لەناو هەموو ئەو بوارە فەرهەنگییانەی ئەوروپا پێشکەشی دەکات، بڕیار بدات لێکۆڵینەوەکەی خۆی لە پاریس و بە زمانی فەرەنسایی پێشکێشبکات. وێرای ئەوەی کە من پسپۆر نیم لە مەسەلەی کورد و لێکۆڵینەوەکانم لەبارەی مێژووی فەرەنسایە لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بەڵام چەند خاڵێکی هاوبەش لە یەکتریمان نزیکدەکاتەوە. لێکۆڵینەوەکەی نەجاتی عەبدوڵڵا مەبەستی بنەڕەتی ئەو پرسانەیە، کە لەگەڵ لە دایکبوونی نەتەوەدا خۆیان دەهێننە پێشەوە، کە ئەمە بەهەمان شێوە خاڵی سەرەکی وتووێژی نێوان مێژوونووسە فەرەنساییەکانیشە. نەتەوەی فەرەنسایی کەی لە دایک بووە؟ لەگەڵ کلۆڤیس چونکە نەتەوە لە کەسایەتی ئەو سەرکردەیەدا بوو بە مەسیحی و لەوە بەدوا نەتەوە بە کلێسەی کاتۆلیکیەوە ناسرایەوە؟ یان لەگەڵ پاتشاکانی سەردەمی کلاسیک چونکە ئەوان دەوڵەتیان بونیاتنا و بەرەبەرە هەرێمەکانیان یەکخست؟

* Prof. Francis Démier

یان لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسی، کە لەو دەمەوە فەرەنساییی بوون ویست و هەڵگری بەهاکانی سەربەستی و مافەکانی مرۆڤ بوون دژ بە ئەوروپای ئارستۆکراتی نەجیبزادەکان؟ یاخود نەتەوە زۆر درەنگتر لەوە لە سەدەی نۆزدەهەم لە دایک بوو وەختایەک هەموو فەرەنساییەکان لە زمانی نەتەوەیی خۆیان دەگەیشتن و بەو زمانە دەئاخفتن و پێیان دەنوسی و کولتوورێکیان لەناو خۆیاندا بەخشییەوە، کە زۆرینەی نەتەوەی فەرەنسایی ئەم کولتوورەیان لەگەڵ ڕژێمی کۆماریدا ئاوێتە کرد؟

مێژوونووسانی کۆمەڵگەی فەرەنسی هەر ئەوەندە چارەنووسی کوردەکانیان بەلاوە گرینگە کە مەسەلەکە بەسەریەکەوە لەژێر یەک پرسیاری گەورەدا ببیننەوە: ئایا نەتەوە چییە؟ لێکۆڵینەوەکەی نەجاتی عەبدوڵڵا پێ لەسەر ئەم خاڵە زۆر ناکۆک و ئیشکالیەتە ڕەسەنایەتییەکەیدا دەگرێ. ئەو یەکەمجار لەڕێگەی شارەزاییێکی بێوێنەی لە زمان و سەرچاوە پەرت و بڵاوەکانی نێوان چەندین پایتەخت، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ بەریتانیا. سروشتی پارچەپارچەبووی کوردستانیش بۆخۆی لەنێوان دوو ئیمپراتۆریادا: ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێرانی کە لەژێر قەڵەمڕۆی هێزەکانی بێگانە بوون پێویستیان هەم بە زانینی زمانە ناوخۆییەکان و هەم بە زمانە ئەوروپییەکانیشە. لە تارانەوە بۆ لەندەن، نەجاتی عەبدوڵڵا توانیویە مێژوویێکی پارچەپارچەبوو دووبارە دروستبکاتەوە لەناو ئەرشیڤخانەگەلێک، کە ڕەسەنایەتییەکە و خاڵە بنچینەییەکەی بریتییە لە ڕوانینی ئەوی دیکە بۆ پرسی کورد.

نووسیاری ئەم نوسراوە بەو واتەیەی کە کارەکانی لەسەر درێژەی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمن توانیویە یەک پرسگر(ئیشکالیەتی) نوێ وەدیاربخات. خەملینی هەستی نەتەوایەتیی کورد لەو دەمانە وەدیار کەوت کە ئیمپراتۆریای عوسمانی لەگەڵ شکستەکانی خۆیدا دەستی کرد بە خۆمۆدێرنیزەکردن و

ڕاسیۆنالیزەکردنی ڕێکخستن و ئۆرگانەکانی خۆی. لەژێر گوشاری دەسەڵاتکارانی عوسمانیدا، گوشارەکانی: بەڕێوەبەرایەتیی، باج و فەرهەنگیی، کە هۆزە کوردەکانی وریا کردنەوە و چەندین ڕاپەڕین لەژێر چاودێری سەرۆکە دەرەبەگەکانیاندا تەقییەوە. لاوازبوونی ناسنامەی عوسمانی لە سۆنگەی ڕووبەرێکی جوگرافیایی خراپ کۆنترۆلکراو ئەو زەمینەیە کە لەودیو پەرتەوازەبوونی هۆزەکانیشەوە هێشتاکە بابەتی پەرەئەستاندنی فۆرمێکی ناتەواوی هەستی نەتەوەیین.

کارەکەی نەجاتی عەبدوڵڵا هەروەها زۆر وردیشە چونکە هەوڵیداوە ناکۆکییەکان، ئاستەنگەکان و شکستە زۆرەکان کە دێنە سەر ڕێگەی ناسنامەی نەتەوایەتی بوونەوە شیبکاتەوە. لەناو ئەم ئاستەنگانەدا گەمەی گەورە هێزە ئەوروپاییەکان و بە تایبەتیش گەمەی بەریتانیا سەرەکییە. ئەمەی دوایی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سیاسەتێکی وای پیادە کرد کە ڕاستییەکەی زۆر هاوچەشن بوو لەگەڵ ئەو سیاسەتەی، کە لە ئەوروپا پیادەی دەکرد: دابەشکردنی دەوڵەتەکان و بە دژ یەکخستنیان لەبەرانبەر یەک، یاریکردن بە ناسیۆنالیزمی هەرەلاواز بۆ گۆتکردنی دەوڵەتی هەرە بەهێز، کە ئەمە هەمیشە وەک داوەرێک خۆی دەهێنێتە پێشەوە و لە دواساتدا هەمیشە نا هاوسەنگییە کاتییەکان چارەسەر دەکات. ئینگلیزەکان بە یاریکردن بە دژایەتیی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریا (عوسمانی و ئێرانی) لە سەرقاڵی ئەوانەوە لەگەڵ ئاستەنگی تا دەهات گەورەتر لەم خاڵەدا سەرکەوتن لەوەی دەست بەسەر ئەو ناوچەیەدا بگرن، کە لەژێر هەڕەشەی ڕووسیا دابوو. مەسەلەی کورد لەژێر دەستی ئینگلیز جگە لە ناوەندێکی گوشارهێنان لەناو گەمەیەکی دیپلۆماسی زیاتر هیچی تر نەبوو. ئەوە لەبەر ئەو هۆیە کە لێکۆڵینەوەکەی نەجاتی عەبدوڵڵا پێ لەسەر مەسەلەی سنووری نێوان هەردوو ئیمپراتۆریادا دادەگرێ. سنوورێک کە هەم ڕەمزی هاوسەنگییەکی بەدواداگەڕاوە لەناوچەکە (لەنێوان هەردوو هێزی

گەورەی ناوچەکە و هەروەها ڕەتکردنەوەی هەرێمێکی کوردیشە، کە ئەگەر هەبوایە پشتیوانی لە هۆشیاری نەتەوەیی دەکرد). لەڕووی ئەم خاڵەوە لە چەند ڕوییێکەوە بەراوردێک لەنێوان فەرەنسا و کوردستاندا هەیە. ڕاستییەکەی لە هەردوو باردا ناکۆکییەکانی سنوور وەکو ڕەتکردنەوەی هۆشیارییێکی بریندار بوو خۆیان بەدیاردەخەن (سنووری هەرێمە لەدەستچووەکانی فەرەنسا پاش ساڵی 1870 و سنووری لەتلەتکراوی هەرێمەکانی کوردستان) لەبارەی ناسنامەی نەتەوایەتییەوە خاڵی دەستپێکردنی یەک وردبوونەوەیە بۆ خۆی.

لێکۆڵینەوەکەی نەجاتی عەبدوڵڵا دەریدەخات کە تەنیا ئەوەندە بەس نییە بەدوای لێکۆڵینەوەیەکدا بگەڕێین لە زەوینەی مەسەلەی گەورە دیپلۆماتەکاندا. لێکۆڵینەوەی زۆر وردی لەبارەی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی هۆزەکان و ڕۆڵی سەرۆکهۆز و دابەشبوونەکانیان، کە ئەمە ڕێگەی بە هێزە گەورەکان داوە تا زۆربەی جار فراکسیۆنێک لە دژی فراکسیۆنێکی دیکەی گەل بەکاربهێنن. سنووردارییی ڕێکخراوە سەربازییەکانی هۆزەکان لەبەرامبەر سوپا مۆدێرنەکاندا بابەتێکن ئەوە دەهێنن، کە ڕێگە بدەن بۆ شۆڕبوونەوە بۆ ناو زەمینەی کۆمەڵایەتیی بۆ لێکۆڵینەوە لە هەستی نەتەوایەتیی کورد. لەم پێودانەدا نووسیار توانیویەتی بە وردەکارییەوە هەم هەموو زانیاری و کولتوورەکانی خۆی کە لە کوردبوونی خۆیدا هەیە بەکاربهێنێ و هەم بشگەڕێتەوە بۆ ئەو میتۆدانەی کە لە ماوەی ئەزموونی خۆیەوە لە زانکۆیەکی فەرەنسایی هەڵیهێنجاون. ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەی نەجاتی عەبدوڵڵا، بابەتی تێگەیشتنێکی نوێمان دۆزییەوە نەک هەر بۆ پرسی کورد بەڵکو بۆ ناوچەکە بە سەرلەبەرییەوە. ئێمە پێمان وایە ئەم لێکۆڵینەوەیە هەروەها بۆ خوێندەوارانی کوردیش بەسوودە.

**پاریس**

2001/2/9

## دەروازەیەك بۆ تێگەیشتن لە کێشەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانی: هۆکار و ستراتیژ و فاکتەرە شاراوەکان

ڕەنگە ئەگەر تەنیا لە ڕووکاری دەرەوە لە کێشەکانی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران بڕوانین، بەتایبەتی لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی سەفەویدا ڕەنگە بەڕوالەت بەو ڕاستییە چاوهەڵخەڵەتینە بگەین، کە پشکی گەورەی هۆکارەکانی ئەم پێکدادان و جەنگ و لەشکرکێشییە زۆروزەوندە و هەموو جەنگە خوێناوییەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بەشی زۆری تەنیا لە سۆنگەی هۆکاری مەزهەبی و جودایی جیهانبینی مەزهەبیی شیعەگەری-سوننەگەرییەوە بووە. یان هێشتا خراوتر لەوە ئەگەر بەو ئەنجامە بگەین، کە کێشەکان بخەینە قاڵبی نەتەوەیی و ناکۆکی نەتەوەییەوە. ڕەنگە هێشتا ڕۆڵی هۆکارەیلی مەزهەبی بەبەراورد بە هۆکارەیلی نەتەوەیی زۆر زیاتر بیت لە قووڵکردنەوە و بەیەکدادانەکان و کێشەکانی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت. ڕاستییەك هەیە ئەوەیش ئەوەیە، کە لە هەموو شەڕەکانی سەفەوی-عوسمانی هەر لە سەرەتای سەدەی شانزەهەم و سەدەی حەڤدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەم و دواتریش لە هەموو شەڕەکانی دەورانی ئەفشار و زەندییەکان و قاجارەکانیشدا لەگەڵ عوسمانییەکان تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم هۆکاری بنەرەتی هەموو جەنگەکان هۆکارەیلی

ستراتیژی، ئابووری و دەوڵەتیی بوون و ئەو هۆکارانە ڕۆڵی کارایان گێڕاوە لە بڕیارنامەکانی جەنگ یاخود ئاشتی لەنێوان هەردوولا، هەرچی فاکتۆری مەزهەبی بووە جگە لە سووتەمەنی یان شانۆیەك بۆ جوشدانی جەنگ زیاتر هیچی تر نەبووە[1]. هەموو فەتواداان و ئاگرخۆشکردن و هەڵگیرساندنی ئاگری ناکۆکی مەزهەبیی لەناو میللەت و خەڵکی سادە و خاکی، دواجار هەر تەنیا بە ئامانجی ئەوەبووە هەر یەکێک لەم جەمسەرانە سەرکردایەتیی جیهانی ئیسلامی و کۆمەڵگەی ئیسلامی بگرنە دەست ئا لەوەیشەوە فاکتەرە سەرەکییەکانی ململانێ و کێشەکان بە بۆیەکی مەزهەبیی بۆیەکرابوون و بەردەوام سووتویان بۆ ململانێیەکە دابین دەکرد و بەردەوامیان بە کێشە و ناکۆکییەکان دەدا. بۆیە ئەگەر ئەگەر بە وردی لە فاکتۆرەکانی ململانێی سەفەوی-عوسمانی وردبینەوە دەبینین بزوێنەرە شاراوەکانی لەسەر سێ ئاست وەستاوە:

یەکەم: فاکتۆری ستراتیژی، کە درێژبووەی کەوشەنی دەوڵەت دیاریی دەکات، واتە ئەوەی پێی دەڵێن جوگرافیای سیاسی.

دووەم: ڕێگەکانی پێکەوەگەیاندن، کە بۆ دەوڵەت بازرگانی، ئابووری و شوێنەکەی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئالوگوڕی بارزرگانی دیاریی دەکرد بەتایبەتی دوای دوو ڕووداوی مێژوویی گەورە ئەویش دۆزینەوەی کاپی چاك-هیوا* (رأس الرجاء الصالح)و دۆزینەوەی جیهانی نوێ بوو.

سێیەم: "شۆڕشی نرخ" لە جیهان، کە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بەدەستییەوە دەیناڵاند لە ئەنجامی هاتنی لێشاوی زێر و زیو و کرانەوەی بازاڕ بۆ کەلوپەلی

---

[1] وجیە کوثرانی، الفقیە والسلطان: جدلیة الدین والسیاسة في تجربتین تاریخیتین العثمانیة والصفویة-القاجاریة، المرکز العربي للابحاث ودراسة السیاسیات، بیروت، ط 4، 2015، ص 85

* Cap de Bonne-Espérance

ئەوروپایی، کە لەسەر شێوەی تەنگژەگەلی ئابووری یەك لە دوای یەك هەر لەسەدەی شانزەهەمەوە دووبارە دەبۆوە[1].

لەکۆی شانۆی شەڕەکانی سەفەوی-عوسمانی تێبینی ئەوە کراوە، کە جەنگە سەخت و دژوارەکان لەنێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر بڕێك ناوچەکانی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات بووە (ئەرزەرۆم-تەبریز) و هەروەها لەسەر عێراق (مووسڵ- بەغدا) بووە. لێکۆڵینەوە مێژووییەکان لەبارەی شوێنی ستراتیژی ئەم ناوچانە ئەوەیە، کە ناوچەی مووسڵ و ئەرزەرۆم دەروازەی سەرەکی هەموو ئەو فاتیحانە بوون، کە چ لە ڕۆژهەڵات یان چ لە باشوورەوە هاتوون بۆ دەست بەسەرداگرتنی پێدەشتەکانی ئەنادۆڵ. هەر لەم دەروازەیەشەوە "ڕێگەکان دەچنەوە بۆ ئیستەنبووڵ و سەر زەریا. هەروەها تەبریز چەقی ئەو ڕێگەیە، کە لە باکوورەوە بە ئەرمینیا و ئەنادۆڵ دەگات. هەر بۆیە هەموو لەشکرکێشییەکان و ئەو بازرگانانەی، کە لە ئەرمینیا یان ئازەربایجان دێن و دەیانەوی بۆ ئەنادۆل بڕۆن دەبێ بە ئەرزەرۆمدا بڕۆن. ئەمەش بە تەبرێزەوە دەگات و لەوێشەوە بە سیواس، دیاربەکر، مووسڵ، بەغدا، بەسرە و بۆ سەر خەلیج. لە دیاربەکریش ڕێگەیەکی لێ دەبێتەوە بۆ مووسڵ و بۆ حەلەب و ئەسکەندروون لەسەر زەریای ناوەڕاست، هەروەها ڕێگەیەکی وشکانیی لێدەبیتەوە بۆ ئیستەنبووڵ"[2]. هەروەك وتمان هەردوو قۆڵ یان ڕێگەی ئەرزەرۆم-تەبرێز و هەروەها مووسڵ بەغدا دوو خاڵی سەرەکی هەموو لەشکرکێشییەکان و شەڕەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بوو. " مووسڵ دەروازەیەکی دیکەی گرینگ بووە بۆ گەیشتن بە ئەنادۆڵ و هەروەها بۆ حەلەب و زەریای ناوەڕاست". بەم شێوەیە مووسڵ" ناوچەی پێکەوەگەیاندن

---

[1] وجیە کوثرانی، المصدر السابق، ص 86

[2] وجیە کوثرانی، المصدر السابق، ص 87

بووە لەنێوان چیا سەرکەشەکانی کوردستان و ئەو پێدەشت و بیایانانەی، کە لە باشووری مووسڵەوە دەست پێ دەکەن و تا کەنداو درێژدەبنەوە"[1]. ئەوە لێرەوەیە کە گرینگی ناوچە چیاییەکانی کوردستان بۆ دەست بەسەرداگرتنی ڕێگە بازرگانییەکان و دابینکردنی هێڵەکانی پشتەوە لەکاتی لەشکرکێشی بۆ سەر دەروازە گرینگەکانی شاڕێگەی ئاوریشم پڕ گرینگ بووە. لەم دیدگایەوە دەبینین هەردوو بەرەی (ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ) و (مووسڵ) چەند گرینگ و ژیانیی بوون بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی. هەربۆیەشە دەبینین، تا سەرەتای سەدەی شانزەهەم کاتێک دەوڵەتی سەفەوی هێشتا دروست نەبوو بوو، هەموو ئەو میرنشین و دەوڵەتۆکە بچووک بچووکانەی، کە هیچ کاریگەرییەکی جیۆستراتیژیان وایان نەبووە بۆ بەرەی ڕۆژهەڵاتی ئانادۆڵ لەسەر ئیمپراتۆریای عوسمانی بەهیچ شێوەیەك جێگەی بایەخ و نیگەرانیی عوسمانییەکان نەبوو. بەڵام هەرزوو کاتێک ناوەندێکی سیاسیی یەکگرتوو بەهێز بەدیارکەوت و بەتایبەت، کە درێژبووەیەکی چڕی مەزهەبی لایەنگیر و پەرەگیری شیعە مەزهەبی هەبوو لەو بەرەیەدا هەر زۆر زوو دەبوو هەرچی زووترە ئیمپراتۆریای عوسمانی دەستبەسەر قۆلی ڕۆهەڵاتی ئەنادۆڵدا بگرێ، کە بە دڵی ئیمپراتۆریای عوسمانی دادەنرێت. بۆیە دەبینین بزاوتی دەروێش و لایەنگیرانی شا ئیسماعیل لە ئەنادۆڵ تا دواڕادە عوسمانییەکانیان جاڕس کردبوو، تا ئەوەی سوڵتان بایەزیدی دووەم لەگەڵ ئەو هەموو نەرمی و سینگفراوانیی خۆی دواجار نەیتوانی بەرگەی ئەم بزاڤانە بگرێ و ناچار بوو هەرزوو بەشێکی زۆری

[1] وجيه كوثراني، الفقيه والسلطان: جدلية الدين والسياسة في تجربتين تاريخيتين العثمانية والصفوية-القاجارية، المركز العربي للابحاث ودراسة السياسيات، بيروت، ط 4، 2015، ص 87 . بۆ ئەم چەند لاپەرەیە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتمان بەو سەرچاوەیە بەستووە.

لە لایەنگیرانی ئەم بزافەی بۆ دوورگەی (مەروە) گواستەوە. دواتر لە دوو ساڵی کۆتایی تەمەنی سوڵتان بایەزیدی دووەم بزووتنەوەی شاە قوڵی خان، کە عوسمانییەکان ناویان نابوو (شەیتان قووڵی)، کە تا دوا ڕادە خۆیان بە لایەنگیری شا ئیسماعیل دەناسی و ئەم ڕاپەڕینە ئیمپراتۆریای عوسمانی هێنایە لەرزین و دەوڵەت بەسەختی توانی دایبمرکێنێتەوە. لە 9 ی نیسانی 1511 ی ز (10 ی موحەڕڕەم) لە یادی شەهیدبوونی ئیمام حوسێن ڕاپەڕینێك تەقییەوە. سەرۆکی ڕاپەڕینەکە بیوکلی ئۆغلی حەسەن خەلیفە (شا قووڵی) سەرکردایەتیی دەکرد، سەرەتا لە ئەنتالیا بەخۆیی و لایەنگیرەکانی هێرشیان کردە سەر کوتاهیە، پایەختی هەرێمی ئەناتۆلیا " مەترسییەکە هێندە گەورە بوو سەدری ئەعزەم خادم عەلی پاشا Hadim Ali Pacha خۆی سەرکردایەتیی لەشکرکێشی دەکرد بۆ سەر یاخیبووەکان و شەڕەکە لە (2 ی تەمموزی 1511ز) بۆ ماوەی چواردە ڕۆژ بەردەوام بوو[1] و ڕاپەڕینەکە تا دەهات بەرفراوانتر دەبوو و تا ڕاپەڕیوەکان ویلایەتی (سیواس) یان داگیرکرد، سوڵتانی عوسمانی ناچار بوو سەدەری ئەعزەم خادم عەلی پاشا بەهێزێکی 8000 جەنگاوەرەوە بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە ڕەوانە بکات[2] و خادم پاشا و هەموو سوپاکەی سەریان تێداچوو و تەنیا چەند ئینکشارییەك ڕزگاریان بوو. هێدەی نەبرد لە مانگی شوباتی 1512 ڕاپەڕینێکی دیکەی قزڵباش لە ئەنادۆڵ تەقییەوە، کە ئەمەیان ئەنجامەکەی بوو بەهۆی ئەوەی ڕاستەوخۆ سوڵتانی سەلیمی بە یاریدەی ئینکشارییەکان گەیاندە سەر عەرش.

---

[1] J-L Bacqué-Grammont, Les Ottomans, les Safavides et leurs voisins: Contribution à l'histoire des relations internationales dans l'Orient islamique de 1514 à 1524, Nederlands Historisch-Archaeologisch Instituut te İstanbul, Édit: Peeters, 1987, p. 27.

[2] ايناس سعدى عبدالله (د)، تاريخ العراق الحديث 1258-1918، دار عدنان، بغداد، 2014، ص 196

سوڵتانی عوسمانی شا ئیسماعیلی بەوە تاوانبار دەکرد، کە بەشێوەیەکی ئاشکرا بانگەواز بۆ مەزهەبێکی دەرچوو و لادەر لە پرەنسیپەکانی ئیسلام دەکات. هەروەها وای دەبینی، کە بەشێوەیەکی تایبەتی هۆکاریکی ترسناکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەنادۆڵی عوسمانی، هەروەك ئەوەی لەماوەی تەقینەوەی یاخیبوونەکانی قزڵباشەکان و ئەو یاخیبوونانەی لە دوای تەنگژەی خەلافەتی بایەزیدی دووەمەوە هاتنەئارا"[1] بەدیارکەوت. هۆکارێکی دیکەی ستراتیژی ئەوە بوو، کە ئەنادۆڵ کۆگەی دانەوێڵە و سەرەڕێگەی کاروانی بازرگانی ئاوریشم بوو، کە لەوێوەوە بۆ ئاوروپا هاوردە دەکرا. بۆیە یەکەم هەنگاوی سوڵتان سەلیم ئەوەبوو گەمارۆیەکی بارزرگانیی خستە سەر دەوڵەتی سەفەوییە و بەتایبەتی بۆسەر بازرگانی ئاوریشم کە بە زێڕ دەگۆڕدرایەوە و ئەمە وای کرد داهاتی سەفەوییەکان بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو کەم بکات[2].

دەبینین سوڵتان سەلیم هەر لەگەڵ هاتنە سەر حوکمڕانی لەسەر چەند ئاستێک کاری دەکرد، کە یەکەمیان گەمارۆ خستنە سەر بازرگانی ئێرانی بوو بەتایبەتی بازرگانی ئاوریشم، دوای ئەوە هەنگاوی دیکەی بریتیبوو لە بەتووندی دامرکاندنەوە و ڕیشەکێشکردنی هەموو ئەو لایەنگیر و گروپە ئێتنیکیانەی کە سەر بە شا ئیسماعیلی سەفەوی بوون. سوڵتان بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی قزڵباشەکان، کە بەسەرکردایەتیی شاه قولی لەناوچەی تەکەلو لە ئەنتالیا تەقییەوە بە پاڵشت بە فەتوای پێشوو، کە لەلایەن شێخ حەمزە سروغورز (927 ك/1522 مردووە)دەرچوو بوو، کە خزمەتی سوڵتان بایەزیدی دووەمی کرد لە ململانێ دژ بەسەفەوییەکان و ئاسانکاری بۆ نەفیکردنەوەیان بۆ (مەورە)

---

[1] روبير مانتران، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة: بشير السباعي، دار الفكر للدراسات والنشر والتوزيع، القاهرة، 1993، ج 1، ، ص 209

[2] ايناس سعدى عبدالله، المصدر السابق، ص 199

دەکرد و پاشان فەتوای کوڕی کەمال پاشا (873-940 ك/1469-1534ز) لە (پەیامێك لەبارەی بەکافرکردنی قزڵباشەکان) دەریکردبوو، کە ڕێگەی بە کوشتنی لایەنگیرانی شیعە عەلەوییەکان (قزڵباشەکان) دەدا. فەتواکەی سروغورز بەزمانی تورکی بوو، لەکاتێکدا فەتوای کوڕەکەی کەمال بە زمانی عەرەبی بوو[1]. ئەم دوو فەتوایە لەسەر بەکافرکردنی قزڵباشەکان و بەهەڵگەڕاوە ناونانیان و کوشتنیان و بەفەرزناسینیان بوو لەسەر هەموو موسڵمانیك. هەروەك لە فەتواکەی کوڕەکەی کەمال پاشادا هاتووە" تایەفەیەك لە شیعە بەسەر زۆر وڵاتی سونییەکاندا زاڵ بوون، تا ئەوەی مەزهەبی باتیل یان بەدیارخست و جنێودانیان بە ئەبوبەکر، ئیمامی عومەر و ئیمام عوسمان (بەخشندەیی خواداوەندیان لەسەربێت) نیشان دا. ئەوانە نکوڵی لە خەلافەتی خولەفاکانی ڕاشیدین و ئیمامەکانی دەکەن (جنێو بە موجتەهیدەکان دەدەن)، لەسەر هەمان ڕێگەی (سەرۆکەکەیان کە ناویان ناوە شا ئیسماعیل دەڕۆن)، "ئێمە گومانمان لە کافربوون و هەڵگەڕانەوەیان نییە و وڵاتەکەیان داری حەربە و نیکاحی نێرینە و مێینەیان بەتەواوی باتیڵە"، "ماڵ و ئەولادیان بۆ موسڵمانان حەڵاڵە و هەرچی پیاوەکانیانە واجب وایە بکوژرێن تەنیا ئەگەر موسڵمان بین، پێویستە ئەوەش بزانرێ، کە جیهاد کردنیان لەسەر هەموو ئەهلی ئیسلام فەرزە، لەسەر ئەوانەی کە دەتوانن شەڕیان لەگەڵ بکەن"[2].

بەخوێندنەوەی ئەم فەتوایانە و ئەو کەشوهەوایەی پێش لەشکرکێشی سوڵتان سەلیم بۆسەر چاڵدیران و نەفیکردنەوەی قزڵباشەکان بۆ (مەورە) و دواتر لە ئاستەنگکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی لە سەختی کۆنترۆڵکردن و

[1] محمد جمال باروت، الصراع العثماني-الصفوي وأثاره في الشيعية في شمال بلاد الشام، المركز العربي للابحاث ودراسة السياسيات، بيروت، ط 1، 2018 ص 105

[2] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، صص 105-106

دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی شا قولی، دەگەینە ئەو ڕاستیە تاڵەی، کە سوڵتان سەلیم سیاسەتی قەتلوعامکردنی قزڵباشەکانی پەیڕەوکردووە و لەچوارچێوەی ئەم سیاسەتەشدا قەسابخانەی بۆ قزڵباش و عەلەوییەکان و هەرکەسێك، کە لە ئەنادۆڵ گومانیان لێکردبێ ناوەتەوە، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەز یان تەمەن. قوربانییەکان بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان کە لیکۆڵینەوە نوێیەکان باسی دەکەن لەوانە لیکۆڵینەوەکانی ئینالجیك- چل هەزار کەس دەبن(نە منداڵێك، نە ژنێك و نە پیرێکیش) ڕزگاریان نەبووە، ئەوەش بۆ دستەبەرکردنی هەر یاخبوونێك بووە کە دەشی لە دوارۆژ ڕوویدات). وا دیارە ڕێڕەوی کوشتارگەکە لە پلەی یەکەم تورکمانە قزڵباشەکانی ئەنادۆلی گرتۆتەوە لە کاروانی لەشکرکێشییەکە بەرەو چاڵدیران، لە ئەزمیت بە لێژایی بەرەو لای باشوور بۆ قۆنیە، پاشان لە قۆنیەوە بەسەرەوە لە باکوورەوە بەرەو قەیسەری و سیواس و ئەرزەنجان، پاشان بەلێژبوونەوە بەئاڕاستەی باشووری ڕۆژهەڵات بەرەو چاڵدیران و بەوە دەکرێ ئەوە دەرئەنجام بکەین کە کوشتارگەکە تورکمانە (قزڵباش)ەکانی گرتۆتەوە، کە پێیان دەوتن سەفەوییەکانی (ڕۆملۆ) لە ئەنادۆڵ، نەك ناوچەکانی (شاملۆ) لە شیمالی وڵاتی شام[1].

بازرگانی دەرەوەی ئێران لە دەورانی سەفەوییەوە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بە ئاوریشم بەستبوو، کە "ناوبانگ و شۆرەتێکی زۆری لە ئەوروپا هەبوو" و کاروانەیلی بارزرگانی ئاوریشم ئەم ڕێگەیانەیان دەگرت:

- ڕێگەی وشکانیی بە عێراق و وڵاتی شام و لەوێشەوە بۆ ئەوروپا.

- ڕێگەی دەریایی بەجۆرێك ئاوریشمەکە دەنێردرا بۆ بەندەری هورموز لە باشووری خەلیج و لەوێشەوە بۆ زەریای هیندی یان بە ئاڕاستەی هیندستان یان بە ئاڕاستەی ئەوروپا لەڕێگەی کاپی چاك-هیوا* دەنێردرا.

[1] نفس المصدر ، صص 105-106

* Cap de Bonne-Espérance

- ڕێگەی سێیەم: لەڕێگەی خاکی ڕووسیاوە لەوێشەوە بۆ ئەورووپا[1].
دەوڵەتی عوسمانی دوای جەنگی چاڵدیران و داگیرکردنی وڵاتی شام و میسر و ڕوخاندنی حوکوومەتی مەمالیك دەیتوانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ تەحەکوم بە ڕێگەی یەکەم و دووەم بکات. سوڵتان سەلیم پەنای بردە بەر "گەمارۆی بازرگانی وەك یەکێک لە چەکەکانی جەنگ" دژ بە سەفەوییەکان، هەروەها پەنای بردە بەر دەست بەسەرداگرتنی کەلوپەلی ئێرانی لە دەست بازرگانە عەرەب و تورك و ئێرانییەکان، هەروەها هاوردەکردن و فرۆشتنی ئاوریشمی ئێرانی قەدەغەکرد، غەرامەی خستە سەر ئەوانەی کە دەیانفرۆشت. لەسەردەمی سوڵتان سولێمان دەوڵەتی عوسمانی لە گرینگی ئاوریشم و ڕێگەکانی تێگەیشت وەك چەکێکی فشارهێنەر. بۆیە سوڵتان سولیمانی قانوونی لەگەڵ گەیشتنی بۆ دەسەڵات ئەو ئابلۆقەیەی باوکی خستبوویە سەر ئێران هەڵگرت[2]. لەبریتی ئەوەی بازرگانییەکە قەدەغە بکات و ڕێگە نەدات بەناو ڕێگەکانی ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانیدا بڕوات، سوڵتانی عوسمانی پەنای بردە بەر جەنگ دژی تەهماسپ بۆ ئەوەی فشاری بۆ بهێنێ بەو مەبەستەی سوود لە بەرهەمی ئاوریشمی ئێران و بازرگانی زەریای هیندی وەربگرێ، بەجۆرێك لە پەیماننامەی ئەماسیە ( 29 ی ئایاری 1555) عوسمانییەکان تەبریز و عێراقی عەرەبی یان بۆخۆیان برد[3].
سوڵتان سەلیم بەگوێرەی -فاروقی- لە ساڵی 1512 بەنزیکەیی واتە لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی، قەدەغەی هاوردەکردنی ئاوریشمی ئێرانی کرد

[1] وجیه کوثرانی، المصدر السابق، ص 89

[2] Jean-Paul Roux, Histoire de l'Iran et des Iraniens: Des origines à nos jours, Fayard, Prais, 2006, P.398

[3] وجیه کوثرانی، المصدر السابق، ص 89

لە ڕۆژئاوای ئێرانەوە بۆ بۆرسا بە ئامانجی بێبەشکردنی شا ئیسماعیل لە داهات. وادیارە لە بەهاری 1514 پێش لەشکرکێشی بۆ چاڵدیران ئەم قەدەغەیە توندتر دەکات و لەم چوارچێوەیەشدا ناوچە عەرەبییەکانی مەملوکیش دەگرێتەوە مەبەستیشی بە پلەی یەکەم حەلەب و باکووری وڵاتی شام بوو و ڕایگەیاند، کە هەر تورکێك یان ئێرانی یا عەرەبێك ئاوریشمی ئێرانی لەدەست بگێریت، بارەکەی دەستی بەسەردا دەگێریت و بە بارتەقای کەلوپەلە دەست بەسەرداگیراوەکەش غەرامە دەکرێ و ئەو سیاسەتەی پیادە کرد. تاشکبری زادە لە چوارچێوەی گێڕانەوەی ژیاننامەی موفتی عەلائەددین ئەلجەمالی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە موفتی لەلای سوڵتانی عوسمانی شەفاعەتی کردووە بۆ ئازادکردنی چوارسەد بازرگان، کە بە گوریس بەستبوویانەوە هەر لەبەرئەوەی ئاوریشمیان کڕیبوو[1]. ڕاستیەکەی ئامانجی یەکەمی سوڵتان سەلیم لە دژی دەوڵەتی سەفەوی ڕێگەگرتن بوو لە تێکشکاندنی خواستە فراوانخوازییەکانی سەفەوییەکان لە خاکی دەسەڵاتی ئاق قۆینلۆی پێشوو و نەهێشتنی کۆنترۆڵیان بوو بەسەر پێگە ستراتیژییەکانی سەر ڕێگەی وشکایی تەبریز-حەلەب بۆ بازرگانی ئاوریشم. سوڵتان سەلیم ویستی ئەوە بە ئاشتی پێش دەستپێکردنی جەنگ بکات و هەوڵیدا شا ئیسماعیل ڕازی بکات دیاربەکری تەسلیم بکات، کە دوریانی ڕێگەی ئاوریشم بوو بۆ هەریەکە لە بۆرسە و حەلەب بەو پێیەی وەریسەی ئەوە، بەڵام شا ئیسماعیل وەڵامی دایەوە کە ئەوان بەزۆر ئەم هەرێمەیان داگیرکردووە تەنیا بە زەبری شمشێریش بەجێیدەهێڵن. لەکاتێک محەممەد خان ئوستاجلو، حاکمی دیاربەکری سەفەوی، دوای بەدەسەڵات گەیشتنی سوڵتان سەلیم وەك ئیستفزازێکی گەورە لە گومان کردن لە سەلامەتی

[1] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 103

عەقڵی دیاریی (تلیاك) ی بۆ ناردووە[1]. سوڵتان بڕیاری دابوو کۆنترۆلی ڕاستەوخۆ بەسەر دیاربەکر و جەزیرەی فوڕاتیی و حەلەبدا بکات. بۆ ئەم مەبەستە قەدەغەیەکی توندی خستە سەر ڕێگەی ئاوریشم بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە بەریەککەوتنی بازرگانە عوسمانییەکان بەو بازرگانە موسڵمانەی، کە لە ئێرانەوە دەهاتن و گومانی ئەوەی لێ دەکردن کە لایەنگیری شای ئێران بن[2].

ڕاستییەکی مێژوویی هەیە، کە هەموو ئەو لەشکرکێشییە عوسمانییانەی بۆسەر ئێران لە ناوەڕاستی نیوەی کۆتایی سەدەی شانزەهەم بۆ داگیرکردنی ئازەربایجان و دەستبەسەرداگرتنی تەبرێز (شاری کۆکردنەوەی ئاوریشم) بوو، بۆ بەردەوامبوونی "جەنگێکی ئابووری" فەرزکردنی گەمارۆی دووسەرە بوو بۆسەر سەرلەبەری ڕێگەکانی کاروانسەرا بازرگانییەکان لەکاتی ڕۆیشتنیان بەناو سنووردا. ئەمە لەگەڵ خۆیدا بوو بەهۆی پووکانەوەی داهاتی دەوڵەتی عوسمانی و سێ چارەگی دەستگا جۆلاییەکانی لەکار کەوتن-وەك ئەوەی لە بۆرسا ڕوویدا- بەهۆی ئەوەی ئاوریشمی بۆ نەدەهات، لەکاتێکدا داواکاریی بارزرگانە ئینگلیز و ئیتالیاییەکان بۆ ئاوریشم زیاتر دەبوو بەتایبەتی دوای زۆریی بەئامێربوونی ئاوریشمی چنین، بۆیە عوسمانییەکان دەستیان گرت بەسەر گەنجە و شێروان و ئەو دەروناوچانەی ئێران کە زۆرترین بەرهەمی ئاوریشمیان هەبوو، دوای ئەوە چوونە ناو شاری تەبرێزیش[3]. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو، کە لە پەیماننامەی فەرهاد پاشا (21 ی ئاداری 1590) عوسمانییەکان هەموو ئەم دەروناوچە دەوڵەمەندانەی بە ئاوریشمیان بۆ خۆیان هەڵگرت. بەم جۆرە دەبینین هەموو لەشکرکێشیی و پەلاماردانەکان ئامانجی

---

(1) نفس المصدر ، ص 101

(2) محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 102

(3) نفس المصدر ، ص201

ئابووریان لە پشتەوە بووە، بۆ نموونە هۆکاری سەرەکی داگیرکردنی بەغدا لە ساڵی 1534 لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە زیاتر بۆ دەست بەسەرداگرتنی ڕێگە بازرگانییەکانی بەسرە-بەغدا حەلەب بوو. کە بۆ مەبەستی دەستبەسەرداگرتنی بازرگانیکردنی ڕێگەی هاوردەکردنی بەهارات بوو بۆ ئەوروپا.

گەمارۆی سوڵتانی عوسمانی عەرەبەکانیشی دەگرتەوە گەرچی ئەوان سەر بە دەسەڵاتی مەملوکی بوون. بەڵام گەمارۆ بازرگانییەکە زیاتر لە هەموان زیانی بە ناوەندی بازرگانی بورسای عوسمانی گەیاند، بەجۆرێک کە لە هەموو شت زیاتر پشتی بە بازرگانی ئاوریشم بەستبوو. لەمەدا بازرگانی ئاوریشمی ئێرانی بۆخۆی زیانی پێنەگەیشت بەحوکمی ئەوەی ڕێگەکەی گواستەوە بۆ ڕێگەی تەبریز-حەلەب-ئەسکەندەروونە یان ئەنتاکیا کە لەژێر دەسەڵاتی مەملوکی بوو. بەم شێوەیە دەبینین کە ڕێگەی دیاربەکر-مووسڵ لە شوێنگەی ستراتیژییەوە گرینگیی و زیندوێتییەکەی لە قۆڵی ئەرزەرۆم-بۆرسا کەمتر نەبوو بۆ سووڕانەوە بەسەر گەمارۆی بازرگانی[1]. بۆیە دەبین هەر ڕاستەوخۆ دوای جەنگی چاڵدیران سوڵتانی عوسمانی هەوڵی داگیرکردنی خەتی دیاربەکر-مووسڵ-حەلەب دەدات و هێرشەکانی 1515-1516 ئەو ستراتیژییەی هێرشەکانی سوڵتانی عوسمانی بۆسەر دیاربەکر و لەناوبردنی مەملوك و داگیرکرنی وڵاتی شام و مووسڵ ولەوێشەوە کۆنترۆڵکردنی ناوچە چیاییەکانی کوردستانی عێراق ڕوون دەکاتەوە.

دوای جەنگی چالدێران ئیدی ئانادۆڵ و ڕێگە بارزگانییە سەرەکییەکانی بەتەواوی کەوتنە ناو بازنەی نفووزی دەوڵەتی عوسمانی و جگە لەوە شارەکانی ئەرزەرۆم، وان و دیاربەکر و هەرێمەکانی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتیی وەك بنکەی

---

(1) نفس المصدر ، صص 103-104

سەربازیی وا بوون بۆ ئەگەری هەر ئۆپیراسیۆنێك لە هەر شوێنێکی ئێران و عێراق و قەوقاز بێت لەسەدەی شانزەهەم بەکاربهێنرێت. جگە لەوە پێکەولکاندنی ئەو شارانە بە دەوڵەتی عوسمانی لەڕووی ئابورییەوە گرینگییەکەی لە لایەنە ستراتیژییەکەی کەمتر نەبوو. بەم شێوەیە عوسمانییەکان بەتەواوەتی دەستیان گرت بەسەر ڕێگەکانی تەبرێز-حەلەب-تەوریز-بۆرسا واتە ڕێگەی کاروانی ئاوریشم، جگەلەوە ئەو شارە دەوڵەمەندانەی سەر ڕێگەی بازرگانی داهاتێکی بێشومارییان بۆ خەزێنەی دەوڵەتی عوسمانی دابین دەکرد[1].

سوڵتان سەلیم یەکەم لەشکرکێشی لە دوای گرتنبەری دەسەڵات ئەوەبوو تەبرێزی داگیرکرد و پاشان سوورایەوە بۆ دیاربەکر و کیلیکا و حەلەب و دواتر بە داگیرکردنی شام و میسر ئەو پشتوێنە ڕۆژئاواییە قوولەی لەبەردەم پرۆژەی دەوڵەتی سەفەوی دا دروست کرد بۆیە ئاسایی بوو، کە دەوڵەتی سەفەوی خەمی بەزاندنی ئەم پشتوێنەی بێ لەڕێگەی فراوانخوازی لە ڕۆژئاوا لە ئەنادۆڵ و مووسڵ و عێراق و ئەمە ئەو قۆڵانە بوو، کە تاوەکو نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم پچرپچر ململانێیان لەسەر بوو[2] و دواتریش هەم لەسەردەمی ئەفشارەکان و زەندەکان و دواتریش زۆر بەگەرمی لەسەردەمی قاجارەکان زۆربەی لەشکرکێشی و شەڕەکان بەزۆری هەر لەم قۆڵانەوە دابووە. کوردستان و ناوچە کوردەوارییەکان، کە کەوتبوونە ناو چەقی ئەم ڕێگە سەرەکییانە و پێکەوەگەیاندنی ئەم قۆڵانە و سەرەڕێگەی هەموو لەشکرکێشییەکانیش بوون و ئەگەر هەمووشیان نەبوون ئەوا بەشی هەرە زۆریان هەر بەناو خاکی کوردستاندا تێپەڕیون. بەڵام کوردستان بۆخۆی ناوچەیەکی شاخاوی و چیاییە، هەرگیز

[1] ایناس سعدی عبدالله، المصدر السابق، ص 201.

[2] وجیه کوثرانی، المصدر السابق، ص 88.

شاری گەورەی بازرگانی و پیشەسازی نەبووە، بەڵکو هەمیشە زیاتر کاروانسەرا یان ئۆردوی یەکێک لەم دوو دەوڵەتانە بووە و پارێزگاری هێلەکانی پشتەوە و ڕێگەسەرەکییەکانی بازرگانی پێکراوە و بۆ ستراتیژیەتی ئەوەی پێی دەوترێت "کەوشەنی دەوڵەتیی" گرینگ و پیویست بووە.

بازرگانی ئاوریشم لەوسەردەمە سەرچاوەیەکی گەورەی داهات بووە چ بۆ دەوڵەتی سەفەوی وەك داهات و چ بۆ دەوڵەتی عوسمانی وەك سەرچاوەی باجی گومرگ لەبەرانبەر تێپەربوونی بەناو خاکی دەوڵەتی عوسمانییەوە. لە سەدەی پانزەهەم پیشەسازی ئاوریشمی ئەوروپایی فراوان بووبوو، بورسا بوو بوو بە بازاڕی جیهانیی بۆ ئاوریشمی خاو، بەم شێوەیە تاڵی ئاوریشمی نایاب، کە لە ئەستراباد و گەیلان لە شیمالی ئێرانەوە بەرهەم دەهێنرا لەوێدا دەفرۆشران.[1]. لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە بەردەوام نرخی ئاوریشم بەرز دەبۆوە. ساڵی 1476 فەردەی ئاوریشم بە پەنجا ئاقچە بوو، ساڵی 1488 بوو بە حەفتا ئاقچە، ساڵی 1494 بوو بە هەشتاودوو ئاقچە و یەك کاروان بە تێکڕا بۆ شاری بۆرسا دوو سەد فەردە ئاوریشمی دەهێنا. بۆیە ئەگەر سەیری ئەو خشتەیەی خوارەوە بکەین داهاتی ساڵانەی ئاوریشممان بۆ لێك دەداتەوە بە دۆقیەی زێڕ و وێنەیەکی بازرگانی ئەوکاتەی ئاوریشمیشمان لەناو دەوڵەتی عوسمانی بۆ نیشان دەدات:

| ساڵ | داهات بە دۆقیەی زێڕ |
|---|---|
| 1487 | 40.000 |
| 1508 | 33.000 |
| 1512 | 43.000 |
| 1521 | 13.000 |
| 1523 | 17.000 |
| 1557 | 24.000 |

[1] د.خليل اينجاليك، تاريخ الدولة العثمانية من النشؤء الى الانحدار، ترجمة: د.محمد الارناؤوط، دار المدار الاسلامية، بيروت، 2002، ص. 193.

دەبین ئەم داشکاندنە لە داهاتی گومرگ دوای ساڵی 1512 بەهۆی جەنگ بووە لەگەڵ ئێران و دواتر دوای پەیماننامەی ئاشتی ئەماسیە (1555) لەگەڵ ئێران هێلەکە جارێکی دیکە بەرز دەبێتەوە بەڵام هەر ناگاتەوە ئەو ئاستەیەی، کە لە سەدەی پانزەهەم تێیدابوو[1].

بۆیە "لەوساتەوە گرینگی ئاوریشم بۆ عوسمانییەکان دەرکەوت نەك وەك چەکێکی سیاسیی لەناوچەکانی، بەڵکو بەوپێیەی سەرچاوەیەکی داهاتی گومرگ" بوو. گرینگییەکەی وەك سەرچاوەیەکی پێدانیان بوو بە پارە بەجۆرێك بەگوێرەی پەیماننامەی 1612 سەفەوییەکان تەبرێزیان بۆخۆیان پاراست لەبەرانبەر پێدانی دووسەد باری حوشتر ئاوریشم و سەد باری کەلوپەل ساڵانە بۆ عوسمانییەکان. بۆ ڕێگەگرتن لەم خنکاندنە بازرگانییە شا عەبباسی سەفەوی بە پەیوەندی بەستنی راستەوخۆ لەگەڵ بەریتانیا و ئیسپانیا ویستی لە دەست فشاری عوسمانییەکان ڕزگاری بێ هەر بۆیە ئیمتیازاتی دایە هەردوو وڵات بەتایبەت بەریتانیا، ئیمتیازاتی بازرگانی لە ساڵی 1617 پێدا بەوەی ڕێگەی سێیەم (ڕێگەی مۆسکۆ) بۆ ئەوروپا بەکاربهێنن. بۆیە دەبینین سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم (1617) کاتێك شا عەبباس دوای ئەوەی کۆنترۆڵی خەلیجی کرد ویستی بازرگانە ئەوروپاییەکان بەوە ڕازی بکات کە بازرگانییەکانیان لەرێگەی هورمەزەوە بێت لەجیاتی ڕێگەی حەڵەب، کە یەکێك لەناوەندە بازرگانییە زیندووەکانی بازرگانی عوسمانی بوو، بۆ ئەوەی ڕێگەی بازرگانی لەناو خاکی عوسمانی بگۆڕێ و دەوڵەتی عوسمانی لە داهاتێکی بێشومار بێبەش بکات کە لەرێگەی دەرامەتی گومرگ بۆ سەر ئاوریشمی ئێران دەستیدەکەوت[2].

---

[1] د. خليل اينجاليك، المصدر السابق ، ص. 194.

[2] محمد جمال باروت، المصدر السابق، 204.

سەرچاوە مێژووییەکان چاودێری ئەوە دەکەن کە لەم سەردەمەدا هۆشیاری عوسمانی بۆ گرینگیی ئاوریشمی ئێرانی وەك سەرچاوەیەکی گومرك هاوکات بوو لەگەڵ ئەو تەنگژە ئابوورییەی، کە لەناوەوە تووشی دەوڵەتی عوسمانی بووبوو. یەکێک لە هۆیەکانی ئەوە دۆزینەوەی کاپی چاك-هیوا Cap de Bonne-Espérance بوو و گۆڕینی بازرگانی زەریای ناوەڕاستیی بوو بۆ هەردوو زەریای ئەتلەسی و هیندی. دەربەندی هورمز کەوتبووە دەست پورتوگالەکان، پاشان سەفەوییەکان بەیارمەتی کەشتیەکانی کۆمپانیای هیندی شەرقی بەریتانی دەستیان بەسەرداگرتەوە. دوای ئەوە ساڵی 1623 دەستیان بەسەر بەغدا داگرت. "هەڕەشەی ڕاستەوخۆی بڕینی ڕێگەکانی بازرگانی و دەرامەتی گومرك یان کرد، کە ئەمەبوو بەهۆی ئەوەی عوسمانییەکان جاڕی جەنگ بدەن. لەنوێوە ساڵی 1626 "فاتیحی نوێی بەغدا (شا عەبباس) ڕایگەیاند، کە ئەوان دەست بەسەر حەلەبدا دەگرن بۆ دابینکردنی کورتترین ڕێگە لە هورمزەوە بۆ بەسرە و پاشان بەغدا بۆ حەلەب"[1].

سوڵتان قانصۆ ئەلغوری (908-922 ك/1503-1516 ز) دەیویست لە ململانێی سەفەوی-عوسمانی (بێلایەن) بێ، پێشوازی لە وەفدێکی نزیکەی دووسەد کەسیی کرد، کە لەلایەن شا ئیسماعیلەوە نێردرابوو. سوڵتان قانصۆ ئەلغوری وەفدەکەی ئاگادارکردەوە، کە جەنگ لەنێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان لەسەر تەقینەوەیەدایە و وەفدەکەش داوای لە ئەلغوری کردووە هاوپەیمانیی ببەستن دژ بە سوڵتان سەلیم. سوڵتان سەلیم ئاگاداری مەسەلەکە بوو و ئەویش هاوکات شاندیکی نارد بۆ لای سوڵتان ئەلغوری و داوای لێ کرد دژ بە سەفەوییەکان هاوپەیمانیی ببەستن. هەر لە شاری حەلەب شەڕ لەنێوان

[1] وجیه کوثرانی، المصدر السابق، ص 90

هەردوو وەفدی شا و نێردراوەکانی سوڵتان سەلیم دروست بوو[1]. ئەم سیاسەتە نێوانییەی سوڵتان ئەلغۆری بەدڵی سوڵتان سەلیم نەبوو و لە دوایین نامە لە نێوان سوڵتان سەلیم و سوڵتان قانصۆ ئەلغۆری پێش ڕوودانی جەنگی مەرج دابق بەچەند ڕۆژێک نامەیەکی پڕ لە بریندارکردن و سوکایەتیی پێکردن و درێژداری بۆ نووسیوە. سوڵتان سەلیم ئامانجی خۆی لە لەشکرکێشییەکەی بۆسەر سەفەوییەکان بەدیارخستووە، کە بریتییە لە "زیندووکردنەوەی شەریعەتی ئیسلامی" و ئەلغوریشی بە "بەهێزکردنی ڕەوشی شا ئیسماعیلی گومڕای بێدین" و بڵاوکردنەوەی هێزەکانی لەسەر سنووری عوسمانییەکان تاوانبارکرد و داوای لە ئەلغور کرد خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگین ئامادە بکات. سوڵتان ئەلغوری هێزی میرنشینە تورکمانە مەملووکییەکانی سەربەخۆی لە باکووری وڵاتی شام ئامادەکرد و بۆ شەرعیەت پێدانی جەنگ دژ بە مەمالیکی (سوننە)، سوڵتان سەلیم پەنای بۆ شێخی ئیسلام زەمبەلی عەلی جەمالی برد بۆ دەرکردنی فەتوایەك، کە ڕێگە بە شەڕکردنیان بدات، کە ئەوانە ئەهلی قیبلەن- بە هۆی یارمەتیدانیان بۆ (گومڕاکان) مەبەستی شیعە قزڵباشەکانە و فەتوایەك لەمبارەیەوە دەرچوو[2].

سوڵتان هەر بەسوود وەرگرتن لەو فەتوا ئاینییە توانی لەشکر کۆکردنەوەی جەماوەری و عەسکەریی بۆ داگیرکردنی وڵاتی شام و میسر بەڕێوە ببات. بەم جۆرە هەنگاوی دوای چاڵدێران ئازادکردنی ڕێگەی دیاربەکر-حەلەب مووسڵ بوو. سوڵتان لە بەهاری 1515 هێزیکی عەسکەری گەورەی نارد بۆ یەکلاکردنەوەی جەنگی دیاربەکر، ناوەندی لق لێبوونەوەی ڕێگەی ئاوریشم بۆ هەریەکە لە قۆنیە و حەلەب، ئامەد ناوەندی ویلایەتی دیاربەکر، قەڵای ماردین

[1] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 108

[2] نفس المصدر ، صص 108-109

ملکەچ بوو و دەست بەسەر میفاریقین و تەواوی ناوچەکانی دیکە داگیرکرا. ئەوانە تاقە ناوچە بوون کە بەرگرییان کرد بەتایبەت قەڵای ماردین کە توانرا دەستیبەسەردا بگیرێت و بەم شێوەیە تەواوی هێلی دیاربەکر-ماردین-مووسڵ لەناوچە سەروویەکانی هەرێمی جەزیرەی فوراتییەوە، کە دەرگەی "ویلایەتی عەرەب" بوون لەبەرانبەر ئەنادۆلی تورکمانی کەوتنەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی عوسمانییەوە[1]. بەدەست بەسەرداگرتنی ڕێگەی دیاربەکر-حەلەب بازاڕی ئاوریشمی ئێران کە لەو ڕێگەیەوە بۆ ئەوروپییەکان دەڕۆیشت، ئەو ڕێگەیەش کەوتە ژێردەستی عوسمانییەکان. بۆیە دەبینین کاتێک عوسمانییەکان حەلەب یان داگیرکرد 1516-1517 هەموو ڕێگەکانی بازاڕی ئاوریشمی ئێران، کە بۆ ئەوروپاییەکان دەڕۆیشت کەوتە بندەستیان. لەماوەی سەدەی شانزەهەمدا عوسمانییەکان هەوڵیان دەدا ناوەندەکانی بەرهەمهێنانی ئاوریشمی ئێران لە باکوور (شیروان و گەیلان) بخەنە ژێر حوکمڕانی خۆیانەوە[2]. بەجۆرێک دوای تێکشکاندنی شا ئیسماعیلی سەفەوی لە جەنگی (چاڵدیران 23 ی ئابی 1514) و مەمالیك لە جەنگی مرج دابق (24 ی ئابی 1516) و داگیرکردنی میسر (1517) ئیدی دەوڵەتی عوسمانی دەستی گرت بەسەر دەوڵەمەندترین ناوەندەکانی تێپەربوونی ڕێگەکانی بازرگانی جیهانیی. بەم شێوەیە داهاتی دەوڵەتی عوسمانی دوو بەرابەر زیاد بوو و خەزینەی دەوڵەت پڕ بوو. لەسایەی هەموو ئەمانە سوڵتانی نوێ، سوڵتان سولێمانی قانوونی (1520-1556) پلانەکانی دادەڕشت بۆ داگیرکردنی جیهانیی[3].

---

[1] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 126

[2] د. خليل اینجالیك، تاريخ الدولة العثمانية من النشؤء الى الانحدار ص. 194

[3] نفس المصدر ص. 56

ڕاستییەکەی لەسەرەتای جەنگی چاڵدیرانەوە تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم ململانێی عوسمانی-سەفەوی زیاتر لەسەر دەستبەسەرداگرتنی ڕێگەکانی بازرگانی ئاوریشم بوو. بەڵام دوای ئەوە بەندەری هورمز دەکەوێتە بندەستی ئێران و ئیدی لەسەر ئاستی جیهانیی شوێنی ڕێگەکانی بازرگانی عوسمانی لەپاشەکشەدا بووە، بۆیە دەبینین هەر لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمەوە ململانێیەکە زیاتر لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە لەوەدا چڕ بۆتەوە چۆن "کەوشەنی دەوڵەتی" خۆیان بپارێزن لەوە بەدوا ململانێیەکە زیاتر لەسەر دیاریکردنی سنوور و سنووری سیاسیی بووە و لەم نێوانەشدا قوربانی یەکەم لەم دارکێشانەی نێوان هەردوولا تەنیا کوردستان بووە چ وەک خاک و چ وەک "نەتەوە" و ئەمە تا سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیی سیمای جیاکەرەوەی ناکۆکییەکانی سنووری نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بووە. بەم شێوەیە دەبینین هۆکارە ئابووری و ستراتیژییەکان ماوەی زیاتر لە دوو سەدە هۆکاری چەند لەشکرکێشی گەورە و جەنگی خوێناوی نێوان هەردوو لا بوو، بەتایبەت بەدرێژایی هەردوو سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەم و دواتریش لەگەڵ سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دوای ئەوەی دەوڵەتە کۆلۆنیالەکان بەتایبەتی ڕووسیا و بەریتانیا (لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمیش ئەڵمانیا) هێندە باڵادەست ببوون، کە تەواو کۆنترۆلی بازاڕەکانی ناوچەکەیان کردبوو و بەدوای بازاڕ بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلە بازرگانییەکانی خۆیانەوە بوون، تەواو ئەم دوو دەوڵەتەیان کردبوو بە نیمچە کۆلۆنییەکی خۆیان. بۆیە دەبینین کە هەر بە فشاری ئەم دەوڵەتە ئاوروپاییانە دوایین جەنگی عوسمانی-قاجاری 1821-1822 وەستا و پەیماننامەی یەکەمی ئەرزرۆم ( 28 ی تەمووزی 1823) هەر بەفشاری ئەوان مۆرکرا و دوای ئەوە ئیدی ئەم دەوڵەتانە بۆماوەی سی چارەگە سەدە بەبێ گوێدانە هیچ بەرژەوەندییەکی ئیتنیکی و لەبەرچاوگرتنی هەڵکەوتە و

دابەشبوونی ئیتنیکی لەناوچەکە تەنیا بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەناوی داوەریکردن دەستیان خستبووە ناو تەواوی ناوچەکە. یەکێکیش لەو گرووپە ئیتنیکییانەی کە لەناو گێژەنی چوار سەدەی کێشەکانی سنووری عوسمانی-ئێرانی هەمیشە سووتەمەنی بووە و هیچ حیسابێکی بۆ نەکراوە، کورد بووە. ئەم توێژینەوەی ئێمە لەم ڕوانگەیەوە سەرومر بۆ شوێنی کورد لە کۆی کێشەکانی سنووری عوسمانی-ئێرانی تەرخانکراوە و دەیەوێ لەگەڵ پەنجەنیشاندان لەسەر کێشەکان و شیکردنەوەی هۆکاری کێشەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانی شوێن و پێگەی کورد وەك گرووپەیلی نەتەوەیی (بێدەوڵەت)و کوردستان وەك خاك و سەرزەمین دەستنیشان بکات.

# بەشی یەکەم
## دەروازەیەکی تیۆریی

1-1 : پێشکوتن.

2-1 : دەروازەیەکی میتۆدۆلۆژی.

3-1 : لە سنووری سروشتییەوە بۆ سنووری دەستکرد.

4-1 : حەشارکەیەک لە مێژوونووسیی کورد.

## 1-1: پێشگوتن

ڕەنگە باسکردنی مێژووی کورد بەبێ باسکردنی کێشەی سنووری عوسمانی- ئێرانی هەر لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تا کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانیی باسێکی ناتەواو بێ، بەشێوەیەک کوردستان هەم فاکتۆرێک بووە بۆ زۆر لە کێشە و ناکۆکییەکانی سنووری نێوان هەردوولا و لە هەمان کاتیشدا فاکتۆرێک بووە بۆ پەیماننامە و گوتوبێژەکانی ئاشتی نێوان هەردوو دەوڵەت. بۆیە بەئاشکرا بەشی زۆری بڕگەکانی پەیماننامە، ڕێکەوتننامە و نامە ڕەسمییەکانی نێوان هەردوولا لەسەر دابەشکردن و دابڕینی ناوچە و دەڤەرە جیاجیاکانی کوردستان بووە.

ڕاستییەکەی سنووری ئێرانی-عوسمانی لە زۆربەی سەردەمەکاندا تەنیا سنوورێکی سەربازیی بووە و هەمیشە لە باری جەنگ و شەڕ و شۆڕدا بووە و خۆ ئەگەر بۆ ماوەیەکیش دەورانێکی ئاشتی بەخۆیەوە بینیبێت ئەوا تەنیا لە سایەی ترس و شەکەتی سەربازیی هەردوو لا بووە. بۆیە هەرکات لایەکیان هەستی بە باڵادەستیی خۆیی و نزمەدەستیی لای بەرانبەری کردبێ، بێ سێودوو پەلاماری داوە و بەشێکی خاکەکەی بۆ خۆی دابڕیوە، هەر بۆیە دەبینین دەورانەکانی ئاشتی هەمیشە دەرفەتێک بوون بۆ خۆسازدان و جەولەیەکی دیکەی جەنگ. خۆ ئەگەر ئامارێکی شەڕە گەورەکانی ئێرانی-عوسمانی بکەین لەوەتای جەنگی چاڵدیرانەوە (23 ی ئابی 1514) تاوەکو دوایین

جەنگەکانی 1822-1821 دەبینین بیست و چوار (24) جەنگی گەورە ڕوویانداوە ئەمە بێ ئەوەی جەنگە بچووک و لاوەکییەکان ئەژمار بکەین[1]. خۆ ئەگەر لە سەرێکی دیکەشەوە ئامارێکی وردی پەیماننامە و ڕێکەوتننامەکانی ئاشتی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریاش باس بکەین هەر لە پەیماننامەی ئەماسییە (29 ی ئایاری 1555) تاوەکو پەیماننامەی ئەرزەرۆمی دووەم (31 ی ئایاری 1847) دەبین نزیکەی هەشت (8) پەیماننامەی ئاشتی لەنێوان هەردوو وڵاتدا مۆرکراوە. پەیماننامەکانی ئاشتی بە ئاشکرا ئەوە بەدیاردەخەن کە ئەم سنوورە زیاتر سنوورێکی سەربازیی بووە لەوەی سنوورێکی سیڤیل بێ. بێگومان لە پشت هەموو ئەم جەنگانە ڕستێک فاکتەری بابەتی و خۆیی هەبووە. مێژوونووسیی ئێرانی (فەرەیدون ئادەمیەت) دەنووسێ کە وێرای ئەم هەموو پەیماننامانەی ئاشتی، کە مۆر دەکران کەچی دەبینین "ڕەگی کێشەکان هەر وەکو خۆیان دەمانەوە"[2] بە دڵنیاییەوە ئەوەی مێژوونووسی ئێرانی ئادەمیەت باسی دەکات بەشێکی زۆری "ڕەگی ئەم کێشانە" پەیوەستن بە پرسی کوردەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات لە ڕوانگەی مێژوویی و جیۆپۆلیتیکییەوە لە ڕەگ و ڕیشەی ئەم پرسە بکۆڵێتەوە.

کوردستان وەك سەرزەمینێکی پانوپۆر هەمیشە ناوەندی چاوتێبڕینی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران بووە و لەنێوان چنگوڕکی هەردوولا بووە و وەک هەمیشەش لە پەراوێزی سیاسی و فەرهەنگیی ئەم دوو

---

[1] نصر الله صالحی، اسناد از روند انعقاد عهدنامه دوم ازرنه الروم (1258-1268هـ ق)، انتشارات وزارت امور خارجه، مرکز چاپ و انتشارات، تهران، 1998/1337، مقدمه، ص 15.

[2] فریدون آدمیت، أمیر کبیر و إیران، شرکت سهامی انتشار، چاپ پنجم، تهران، 1956/2535، ص 67.

هێزەدا ژیاوە، بۆیە هەمیشە وەکو بەشێک لە دەوڵەتی عوسمانی و بەشێک لە دەوڵەتی ئێران سەیر کراوە. لەم سۆنگەیەوە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە مێژوونوسیەکانی ڕۆژهەڵات، بەتایبەت سەرچاوە مێژوونووسییەکانی ئەو گەلانەی ڕاستەوخۆ مێژووی هاوبەشیان لەگەڵ گەلی کورد هەبووە وەک فارس و تورک و عەرەب و هەروەها بەڵگەنامە و دەستنووس، نامە ڕەسمییەکان و کرۆنیکە مێژووییەکانی ئەم گەلانە باس و خواسی یەکجار زۆریان تێدایە لەبارەی مێژووی کورد و بۆ ئەم مەبەستە زۆر لایەنی تاریک ڕووناک دەکەنەوە، کە تا ئێستا لێکۆڵینەوەی سەربەخۆیان لەبارەوە نەکراوە.

هاوزمانە خۆشەویستەکانم ئەم باسەی ئێرە، کە تایبەتە بە کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی لە بنەڕەتدا درێژە و بە کوردیکراوی پوختەیەکی بەشی سەرەکی هەمان ئەو باسەیە، کە ساڵی خوێندنی 1999-2000 بە زمانی فەرەنسایی لە زانکۆی پاریسی دەیەم- نانتێر NANTERRE بۆ پێداویستییەکانی بڕوانامەی D.E.A (کە بەرانبەر ماستەر دەوەستێ لە عێراق) لە هەمان زانکۆ و بۆ بەشی مێژوو ئامادەکراوە*، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەم، کە ئەم کتێبە وەرگێراوی کوردیی دەقاودەقی تێکستە فەرەنسییەکە نییە، هەمان ناوەڕۆکە بەڵام بەشێوەیەکی جیاوازتر لە تێکستە فەرەنسییەکە دووبارە بە کوردی دارێژراوەنەتەوە و چەند فەسڵێک و بڕێک لە بەشەکانیش پاش و پێش کراون و جگە لەوەش سوود لە سەرچاوەی نوێ و تازە وەرگیراوە کە لە کاتی نووسینی نامەکەدا لەبەردەستدا نەبوون.

---

* Nation et frontière: le Kurdistan entre l'Empire Ottoman et l'Empire Perse dans la première moitié du XIX siècle, [Mémoire de D.E.A.], Paris: Université Paris X - Nanterre, 2000, (XVI-117 p).

لەم باسەدا بایەخێکی تەواو دراوەتە میتۆدی نووسین و پێڕەوکردنی بنەماکانی نووسینی ئەکادیمی، بۆیە تەواوی ئەم باسە لە چوارچێوەی باسێکی ئەکادیمی دەخولێتەوە. ئەم باسە کراوە بە چوار بەش ، بەشی یەکەم تایبەتە بە دەروازەیەکی تیۆریی بۆ پرسی سنوور و نەتەوە (ناسیۆن). هەرچی بەشی دووەمە تایبەتە بە خوێندنەوەیەکی خێرای پێشینەی ناکۆکییەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانی و لەم کلاوڕۆژنەیەشەوە هەوڵدراوە شوێنی کوردستان لە هاوکێشەی فراوانخوازی و پێکدادانەکانی ئێرانی-عوسمانی دیاری بکەین. بۆ ئەم مەبەستە لەم بەشەدا قامک خراوەتە سەر شوێنی کوردستان لە پەیماننامەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتدا، هەر لە پەیماننامەی ئەماسییەوە (29 ی ئایاری 1555) تاوەکو پەیماننامەی زەهاو (17 ی ئایاری 1639). بەشوێن ئەمە لە بەشی سێیەمدا لە ململانێی ئێرانی-عوسمانی لەسەدەی هەژدەهەم دەکۆڵێتەوە، واتە لەپەیماننامەی هەمەدان (13ی تشرینی یەکەمی 1727) ەوە تا پەیماننامەی کوردان* (4ی ئەیلوولی1746). لەم بەشەدا باسی لە بەریەکهەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی سەفەوی بەهۆی داگیرکردنەکانی ئەفغان و دواتر باسێکی سەربەخۆ لەبارەی پەیوەندییەکانی ئێرانی-عوسمانی لە دەورانی نادر شای ئەفشار و کەریم خانی زەندا باسکراون.

دواجار دواین بەش تایبەتە بە جیۆپۆلیتیکی پرسی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، ململانێی کۆلۆنیالیزمی ئاوروپایی بۆ دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران، پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم (28 ی تەمموزی 1823 ) و پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم (31ی ئایاری 1847).

ئەم باسە لە بنەواندا پرۆژەی سێ بەرگە کتێبە کە بەم شێوەی خوارەوە تەواو دەبێت:

* کوردان(کردان): کەوتۆتە نێوان قەزوین و تاران.

بەرگی یەکەم: کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی 1639-1847 کە تا پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم درێژدەبێتەوە.

بەرگی دووەم: کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی 1843-1932 واتە لە پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم تا پەیماننامەی ساڵی 1932ی نێوان ئێران و تورکیا درێژ دەبێتەوە.

بەرگی سێیەم: کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی- عێراقی 1932-1988 واتە تا کۆتایی جەنگی عێراق-ئێران دەگرێتەوە.

لە سەرێکی دیکەوە هەندێک زاراوە هەن کە بەڕاستی کوردییەکانیان ئەم چەمکە بە دەستەوە نادەن کە لە زمانە ڕۆژئاواییەکاندا هەیە، بۆیە بەبێ سڵکردنەوە بڕێک وشەی ڕۆژئاوایی لەم باسەدا بەکارهێنراون، کە من پێم وایە ئەم دەستەواژانە ئەگەر زمانەکەمان دەوڵەمەندتر نەکەن ئەوا هیچ زیانێکیشیان نابێ. من لەم باسەدا ناسیۆنالیزم-م زۆر پێ ڕاسترە لە وشەی نەتەوایەتی، کە لە هەموو زمانە زیندووەکانیشدا هەر ناسیۆنالیزم وەکو خۆی ماوەتەوە. هەر لەهەمان پێوداندا وشەی (کرۆنیک)* کە واتەی تۆماری ڕووداوگەلێکی مێژوویی دەگەیەنێ کە کورد هاوواتای ئەم وشەیەی نییە، بۆیە ئەگەر وشەی (کرۆنیک) وەکو خۆی بەکاربهێنین پێم وایە زۆر دروست ترە. دواجار ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێم بێگومان ئەم باسە لە کەموکوڕی بەدەر نییە، چونکە یەکەمجارە باسێکی ئاوەها تایبەت و سەربەخۆ لەبارەی کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی دەنووسرێ، بۆیە دەشێ هەڵە و پەڵەی تێدا هەبن و لە زانایانی بەوەج دەپاڕێمەوە وەکو شەرەفخان گوتەنی چاکەم لەگەڵدا بکەن و هەڵە و پەڵەکانم بۆ ڕاستبکەنەوە و باسەکەم بە لێکۆڵینەوەی زانستییانە فراوانتر بکەن.

---

*Chronique

## 1-2: دەروازەیەکی میتۆدۆلۆژی:

ئاڵۆزیی مێژووی کورد لە سروشتی مێژوو و سترەکتووری کۆمەڵگەی کوردی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ. قۆناغەکانی مێژووی کوردستان ئاڵۆز و پێکداداچوون، ڕووداوەکان یەک لەدوای یەک و زنجیرەیەکی پڕ لە کارەساتاوین. سترەکتووری ئایینی، دابەشبوونی خێڵەکیی، دەسەڵاتی بێگانە و جەنگی بەردەوام، بۆیە ئەم مێژووە زۆر ئاڵۆزە دەبێ چۆن و بەچ میتۆدێک بنووسرێتەوە؟ هۆکارە ئابووری و جوگرافی و سەربازییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان بینیووە لە تێکهەڵپڕژانی ڕووداوەکان و هەتاوەکو هۆکارە سروشتییەکانیش بەشدارییان تێداکردووە.

یەکەم گرفتی میتۆدۆلۆژی لەم پرسیارەدا زەق دەبێتەوە ئایا کورد وەکو نەتەوەیەکی (بێدەوڵەت) چۆن کاری لە پەیوەندییە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکان کردووە؟ ئایا کورد تا چ ڕادەیەک تاسیری لەسەر سیاسەتی دەرەوە و ناوەوەی دەوڵەتانی هاوسێدا داناوە؟ بۆ ئەم مەبەستە گەڕانەوە بۆسەر نامە ڕەسمییەکان، وتووێژی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران و تێکستی پەیماننامەکانی ئاشتی نێوان هەردوو دەوڵەت، سەرچاوەی ڕەسەنن کە دەتوانن زۆر بەوردی تاسیری ڕۆڵی گەلی کورد لە ڕووداو و پێشهاتەکانی ناوچەکە دیاری بکەن.

له لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد نابێ هەرتەنیا پێ لەسەر ڕووداوە سیاسی و جەنگییەکاندا بگیرێ، دەبێ ڕۆڵی جیۆپۆلیتیک و سترەکتووری سۆسیۆ-فەرهەنگیی کوردستان زۆر بەوردییەوە لەبەرچاو بگیرێن. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵمان داوە کەم تا زۆر مێژووی کورد لە ڕوانگەی جوگرافیاوە بناسین. لێکدانەوەی ڕۆڵی جیۆپۆلیتیکی کوردستان لە دیاریکردنی چارەنووسی سیاسیی کوردستان زۆر گرنگە، بۆیە گرنگترین بەشی ئەم باسە، کە بەشی چوارەمە پێ لەسەر ئەم پرسە دادەگرێ.

گرفتێکی دیکەی میتۆدۆلۆژی لەوەدایە کورد بۆخۆی وەکو نەتەوە بەڵگەنامە و ئەرشیڤخانەی نەتەوەیی تایبەت بە خۆی نییە، کە ئەمە ئاسۆی ڕوانینی کورد خۆی بۆ ڕووداوەکان لێڵ دەکات. مێژوونووسیی* کورد هێندە هەژارە کە مێژووی کورد لەناو تاریکاییدا نقوم بووە. بۆ ئەم مەبەستە گەڕانەوە بۆ سەر کرۆنیک و سەرچاوە مێژووییەکانی گەلانی هاوسێ (تورک، عارەب و فارس) ڕەنگە کەمێک دەستگیرۆییمان بکات بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی ڕووداو و ئەنجامەکان. مێژوونووسیی گەلانی هاوسێ، بە پێچەوانەی مێژوونووسیی کورد تاڕادەیەک دەوڵەمەندە. بەڵام لێرەدا هەمدیسان ڕووبەڕووی کێشەیەکی دیکەی میتۆدۆلۆژی دەبینەوە: ئایا (ئەوان) چۆن دەڕوانن‌ە (ئەوی دیکە) و چۆن لە کوردییان ڕوانیوە؟ پرسیاری لە هەمووی گرینگتر ئەویە چۆن بتوانین ئەم سەرچاوە مێژووییانە بەکاربهێنین؟ ئایا پشت بەستن بەو سەرچاوانە نامانباتەوە بۆناو بازنەی ڕوانینی (ئەوی دیکە) بۆ کورد؟ دواجار ئایا مەترسی ئەوە نییە ئەم سەرچاوانە بەرەو یەک میتۆدی نازانستیمان ببەن؟

---

*Historiographie

## سەرزەمینێکی بێ سنوور:
## کۆمەڵێکی فرەهۆز و نا هۆمۆژین لەپەراوێزی دوو ئیمپراتۆریادا

بە بازدان بەسەر هەموو قۆناغە مێژووییەکان ئەگەر لە دەورانی ئیسلامەوە دەست پێ بکەین، دەبین هیچ کاتێك کورد وەك "ئیتنی" یەکی جیاوازی هۆمۆژین و کوردستان وەك یەکەیەکی جوگرافی یا کارگێڕیی لەناو چوارچێوەی یەك سنووری نەتەوەیی بەناوی کوردستان، کە هەموو نەتەوەی کورد لەخۆوە بگرێت نەبووە، کە لە هاوسێکانی جیابکاتەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمیشە لەگەڵ هاوسێکانی تێکەڵ بووە و لە پەراوێزی دەوڵەتەکانی هاوسێیدا ژیاوە. لە بەرەبەیانی مێژووەوە ڕەوتی پەرەسەندنی ئەم نەتەوەیە ئاوا هاتووە، کە هەمیشە پەرش و بڵاو و چەند کۆمەڵە و گرووپی جیاجیا بووە و لەهیچ دەورانێکدا یەکێتیی نەتەوەیی نەبووە و هەمیشەش کوردستان وڵاتێکی بێسنوور بووە و ئەوەش پێی دەوترێت کوردستان مەبەست لێیی ئەو سەرزەمینە کە "کورد" یان "کوردەکان" لەسەری ژیاون و شوێنی مانەوە و ژیانیان بووە. ڕاستییەکەی کوردستان تەنیا وەسپێکی جوگرافیایی و ئیتنیکی بووە و وڵاتێك بە ناوی (کوردستان) بەسەروەریی و دەسەڵاتی کوردییەوە، کە هەموو خاکی کوردستان و سەرزەمینی کوردستانی گرتبێتەوە شوێنێکی لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا نەبووە.

کورد لە دەورانی ئیسلامدا لەماوەیەکی زۆر کەمدا چووەتە سەر ئایینی ئیسلام و ناوچەکانی وەك بەشێك لە دارولئیسلام حوکمڕانی کراوە و تا کۆتایی دەسەڵاتی عەباسیەکان لەژێر دوو ناوی هەرێمی (ئازەربایجان) و (جەزیرە) ناسراوە و لە هیچ نەخشەیەك لە سەرەتای وەدیارکەوتنی ئیسلامەوە تا کۆتایی دەسەڵاتی خەلیفەکانی بەغدا (1258) کوردستان وەك وڵاتێکی سەربەخۆی جیاواز ئاماژەی بۆ نەکراوە. لە دەورانی سەلجوقیەکانیش کوردستان بە "عێراقی عەجەمی" ناسراوە و لە سەرچاوە فارسییەکانیش بە (هەرێمی چیا) یان (وڵاتی چیا) ناسراوە و سەرچاوە عەرەبییەکانیش هەمان ناویان لە فارسییەوە کردۆتە عەرەبی. زانای زمانەوانی تورك مەحموود کاشغەری لە کتێبی (دیوان لغات ترك) ساڵی 466 ی کۆچی / (1073-1074 ی ز) لە نەخشەکەیدا ناوی (کوردستان) ی نەهێناوە وەك یەکەیەکی جوگرافیایی، تەنیا ئاماژەی بە خاکی کوردان و شوێنی کوردەکان کردووە. لە سەدەی چواردەهەمی زایینی لە نووسراوی مێژوونووسەکان ناوی کوردستان وەدیارکەوت و شوێنی ناونانەکانی دیکەی گرتەوە. هێرش و پەلامارەکانی سەلجوقی (1051) و مەگۆل (1231) و تەیمورلەنگ (1402) هێندەی دیکە کوردستانی وێرانتر و پەرشوبڵاوتر کردەوە. دواتر لە سەدەی چواردەهەم هەردوو هۆزی تورکمانی قەرەقۆینلوو و ئاق قۆینلوو بوون بە سۆنگەی دژایەتی زۆری هۆزە کوردییەکان و زیاتر پەرشوبڵاوکردنەوەی هۆزەکان. عوسمانییەکان لەسەدەی چواردەهەم بالکان یان گرت و پاشان ئەنادۆڵ-کە تورکی موسڵمان و مەسیحی بێزەنتینی ئۆرتۆدرکسی تێدابوو- و دواتریش بەتایبەت دەستیان بەسەر کۆنستانتینۆپل دا گرت (1453). لەسەرەتای سەدەی شانزەهەم ئیمپراتۆریای عوسمانی بەرەو وڵاتی ئێران، کورد، عەرەب ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەڵکشا: مەبەست لەوە زیاتر نەهێشتنی کێبەرکێیی ئێرانی و هەڕەشەی ئایینی شیعەگەریی بوو، کە کۆنترۆلی ڕێگە بازرگانییەکانی کردبوو، کە زەریای هیندی بە زەریای سپی

ناوەڕاست دەبەستەوە[1]، هەر ئەوەش یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی هێرشی سوڵتان سەلیم بوو بۆ سەر ئێران لە جەنگی چالدێراندا. دوای سەرکەوتنی سوڵتان سەلیم لە جەنگ بەشی گەورەی کوردستان وەك خاك، کوردەکان وەك گرووپگەلی پەرشوبڵاو و هۆز و وەك باوەڕداریی سوننە گەرچی کێشەشیان لەگەڵ تورك هەبوو، بەڵام لەنێوان سیستمی دووجەمسەریی ناوچەکەدا هیچ بوارێکیان نەبوو و ناچار دەبوو جەمسەرێك هەڵبژێرێن، بۆیە بەدڵنیاییەوە کورد وەك باوەڕداریی سوننە جەمسەریی هاوپەیمانیی کردنی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هەڵبژارد و ئەم هاوپەیمانییەش لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم درێژەی کێشا. لەم سیستمە دوو جەمسەرییەدا بەشی زۆری خاکی کوردستان دوای جەنگی چالدێران بەر دەوڵەتی عوسمانی کەوت و دواتریش لە پەیماننامەی زەهاو (1639) کوردستان بە ڕەسمی لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریا دابەش کرا. وەك ئەوەی کوردستان ناوچەیەکی شاخاوی سەخت بووە، بۆیە هەردوو دەوڵەت جۆرێك لە دەسەڵاتی ناوخۆییان بە سەرۆك هۆزە کوردەکان بەخشیوە تا بەناوی ئەوانەوە حوکمڕانی بکەن. حوکوومەتی عوسمانی لە حوکمرانی دوو ناوچە کێشەی هەبوو کە ئەوانیش لوبنان و کوردستان بوو، کە هەردووکیان دوو ناوچەی شاخاوی سەخت بوون. بۆیە لەهەردوو ئەم ناوچەیە سیاسەتی حوکمی ناڕاستەوخۆی بەکارهێنا بەو پێیە، کە ئۆتۆنۆمی دابووە سەرکردە ناوخۆییەکان چ بۆ درووزەکان لە لوبنان و چ بۆ سەرۆکهۆزەکان لە کوردستاندا[2].

---

(1) Anne-Marie Hattingois-Forner, Jean Hubac et Nadine Viver, Le Moyen Orient de 1876 à 1980, Amphi Histoire, Bréal, 2016, p.13.

(2) بروس ماسترز، عرب الامبراطورية العثمانية تاريخ ثقافي واجتماعي 1516-1918، ترجمة: عبدالجكيم ياسين، دار الرافيدين، 2018، ص 204.

کورد لەناو دەوڵەتی عوسمانی خۆی بە گەلێکی داگیرکراو نەبینوە و ئیمپراتۆریا بۆ کورد هەر بەردەوام پێدەری هەژموونی ئایینی ئیسلام بووە. بۆیە دەبینین ئینتیمای ئایینی هەمیشە ناسنامەی ئیتنیکیی بووە لای ئەو گەلانەی کە خاوەن پێناسێکی بە کۆمەڵ بوون لە ئیمپراتۆریای عوسمانی وەك : کورد، عەرەب، ئەڵبانی و بۆسنیە و تورکەکانیش.[1]

کورد هیچ کێشەی نەبووە چونکە کورد نە خاوەنی دەستەبژێری سیاسیی و فەرهەنگی بووە و نە فەرهەنگی نووسراویشی بەزمانی کوردی هەبووە، بەڵکو زیاتر لەوە کۆمەڵەیەکی نا هۆمۆژین بووە، هەر بۆیە لای کورد دەسەڵاتی عوسمانی بە کێشەیەکی ئاوا گەورە سەیر نەکراوە تا ئەوکاتەی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتی عوسمانی کەوتە بێبەشکردنی سەرۆکهۆزەکان لەدەسەلاتی پشتاوپشتیان، لێرەوە زنجیرەیەك بەرەنگاربوونەوەی سەرۆکهۆزەکان سەریان هەڵدا، کە هەموویان کەم و زۆر دامرکێنرانەوە و نەیانتوانی بەرگری بکەن.

لە قۆناغی یەکەم جەنگیی جیهانیی و دابەشکردنەکانی ناوچەکە لە ڕێکەوتنامەی نهێنی سایکس پیکۆدا، کوردستانی عوسمانی لەنێوان ڕووسیا و فەرەنسا و بەریتانیا بەنهێنی دابەش کرا. لە جیهانی دوای جەنگ، کورد گەرچی نوێنەری هەبوو لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس، بەڵام لەسەر زەمیندا کورد لە هەموو کوردستانی عوسمانی (جگە لە سلێمانی) هێچ هێزێکی لەناوچەکانی خۆیدا نەبوو تا وەك یاریکەرێك لە گۆڕەپانەکە لە کاتی پاکتاوکردنی پرسەکانی دوای جەنگ حیسابێك بۆ کورد بکرێ.

---

[1] بروس ماسترز، المصدر االسابق، ص 23

## 3-1: له سنووری سروشتییەوە بۆ سنووری دەستکرد

سنوور چەمکێکی زۆر ئاڵۆزە و هەر لەدێر زەمانەوە هەر هەبووە، بەڵام چەمکی سنوورێکی سیاسیی دەوڵەتێك دیاردەیەکی نوێیە و تەنیا لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەت-نەتەوە لە ئەوروپاوە لە سەدەکانی سیانزەهەم و چواردەهەم سەریهەڵدا. بۆیە دەبینین لە ئیمپراتۆریای ڕۆمەوە تاوەکو سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست[1] هیچ سنورێك بەمانا سیاسییەکەوە لەنێوان وڵاتان و سەرزەمینەکاندا نەبووە. ئەوە لە سەدەی پانزەهەم- شانزەهەمەوە لەگەڵ لە دایك بوونی پادشاییە نەتەوەییەکان و دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرن لە ئەوروپا، ئیدی سنوور وەك هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان دوو قەوارەی جیا و سەربەخۆ بەدیارکەوت. دوای ساڵی 1648 سنوور ئەو هێڵە بوو، کە دەستنیشانی ئەوەی دەکرد سەرووەریی وڵاتێك لەکوێوە دەست پێ دەکات و لە کوێشەوە کۆتایی دێت.

بەم جۆرە بەشێوەیەکی گشتیی مێژووی سنوورە نێودەوڵەتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەدەی نوێ، وشەی

---

[1] سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ ساڵی 476ی زایین، واتە لەگەڵ ڕووخانی ئیمپراتۆریای ڕۆم دەست پێ دەکات.

سنوور Frontière بەم شێوەیەی ئەمڕۆی، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم. بەم پێیەیش چەمکی سنوور لە کۆنسێپتی فەلسەفیدا چەمکێکی سەقامگیر و جێگیر نییە. ژاک ئانسێل* جوانی بۆچووە، کە نووسیویە چەمکی سنوور هەزار حەقیقەت بەخۆیەوە دەگرێ[1]. سیمیل لای وایە "سنوور حەقیقەتێکی شوێنیی نییە بە کارتێکردنی کۆمەڵایەتی، بەڵکو حەقیقەتێکی کۆمەڵایەتییە و شێوەیەکی شوێنیی وەردەگرێ[2]. جوگرافیناسی ناوداری فەرەنسایی میشێل فۆشێر Michel Foucher زۆر جوان پێناسەی سنووری کردووە:

"سنوور بریتییە لە ستراکتۆرگەلێکی شوێنی سەرەتایی، لەسەر شێوەی هێڵ، بەگوێرەی دابڕانی جیۆپۆلیتیکی و دەست نیشانکردن، خاڵی بنچینەیی لەسەر سێ بنەما دەچەسپێت: واقیعیەت(سنووربەندیی شوێنیی بۆ پیادەکردنی سەروەریی)، ڕەمزیی (ناسنامە، ئینتیما بۆ کۆمەڵەیەکی سیاسیی لەناو هەرێمێکدا)، خەیاڵیی (پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی دیکە، دراوسێ، دۆست یا دوژمن، لە ئەنجامدا پەیوەندی خۆی لەگەڵ مێژووی تایبەت بە خۆی، بە ئەفسانە دامەزرێنەکانییەوە)[3].

ئیمپراتۆریاکانی ڕۆمانی و فەرەنسایی کۆن، لەسەر بنەمای تیۆری سنووری سروشتییەوە دەڕۆیشتن، بەم پێیەیش سنووری ئەم ئیمپراتۆریایانە دەبوایە لەگەڵ درێژبوونەوەی سروشتی دیاردە سروشتییەکانی وەک: چیا، زەریا،

---

* Jacques Ancel

(1) GUICHONNET, P & RAFFESTIN, C, Geographie des frontieres, PUF, Paris, 1974, pp.7-11.

(2) Riccardo Bocco, Daniel Meier, Penser la notion de frontière au Moyen-Orient, in A contrario 2005/2 (Vol. 3), pages 4

(3) Pierre-Charles Pupion, Stéphane Trébucq, La question des frontières : un enjeu majeur pour les managers publics et le management public, In *Gestion et management public* 2019/2 (Volume 7), n° 4, p.6.

بیابان و دارستانەکان بڕۆیشتبایە، کە ئەمە زیاتر بیرێکی فراوانخوازانە بوو. پاتشای فەرەنسا، فیلیپ لۆبیل* باوەڕی بە تیۆریای سنووری سروشتی هەبوو بەوەی، کە ئەوە سروشتە سنووری دەوڵەت دیاری دەکات. ئەم بیرە فراوانخوازییە بەو ئامانجە بوو تا سنووری فەرەنسا بگەیەنێتە سنووری وشکانیی و بۆ ئەمە چاوی بڕیبووە سەر ڕووباری ڕاین، بۆیە هەر بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتای سەدەی چوارەدەهەمدا کەوتە هاوپەیمانێتی دروستکردن لەگەڵ میرە هاوسێکانی ڕووباری ڕاین و شارەکانی کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری ڕاین[1]. بەگوێرەی ئەم عورفە باوە ڕووباری ڕاین Rhin و زنجیرە چیاکانی پیرینێ Pyrenees بوون بە سنووری سروشتی فەرەنسا. لەم پێودانەوە زنجیرە چیاکانی پیرینێ Pyrenees سنووری مێژوویی نێوان فەرەنسا و ئەسپانیا بوون و بە سنووری ئەزەلییان immorail دەژمارد، (بێلمان) زۆر جوانی وتوە: ئیمپراتۆریا سنووری بۆ نییە. بەم جۆرە هەموو سنوورەکان بەگوێرەی پێناسەکردن، بریتین لە سنووری دەستکرد[2].

لە ئەنجامی ڕووخانی ئیمپراتۆریای ڕۆمانی لە ساڵی 476 ی زایینی، هێرشی یەک لە دوای یەکی هۆزە گێرمانەکان، کە ڕۆما نەیتوانی بەرەوڕوویان بوەستێتەوە، ئاشوویی زۆری لەناو چەند بەشێکی وڵاتدا دروست کرد، کە سەر بە ئیمپراتۆریای ڕۆمانی بوو لە ئەنجامی دەست بەسەرداگرتنی هۆزە بەربەرەکان barbares بەسەریدا. لە ئەنجامی ئەوە ئیمپراتۆر کۆنستانتین-کە یەکەم ئیمپرۆاتری مەسیحی بوو- ناچار بوو پایتەخت لە ڕۆمەوە بگوازێتەوە بۆ

---

*Phillippe le Bel

[1] د. جابر الراوي، الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الإيرانية، بغداد، 1975، ص72.

[2] Roger Brunet et alii, Les Mots de la géographie. Dictionnaire critique, Paris, Reclus-La Documentation française, 1993 (2e édition), p. 228.

کۆنستەنتین (بێزەنس) لەسەر کەناری بۆسفۆر و بەم شێوەیە ئیمپراتۆریای ڕۆژئاوایی ڕۆم لەناوچوو[1]. دواجار لە دەورووبەری سەدەی دەیەمی زایینی لەگەڵ چەسپاندنی سنوورەکان، شارەکان مکوم بوون و دواتریش شارەکان لەناوچە سنوورییەکان دروستکران. ئەم شارانە بوون بە ناوەندی بازرگانیی لەنێوان ئاسیای ناوەند، ئێران، سووریا و جیهانی عەرەبی و بە تایبەتیش سەرنجی تورکە سەلجوقیەکان و تورکمانەکانی ئاسیای ڕاکێشا[2].

هەرچی بیرۆکەی سنوورە لای ئیسلام، ئەوا زانا فیقههییەکانی موسڵمان، جیهان دابەش دەکەن بۆسەر دوو قەڵەمڕۆ: وڵاتانی جەنگ و وڵاتانی ئاشتی. وڵاتانی جەنگ ئەوەیان هەموو ئەو سەرزەمینانە دەگرێتەوە، کە موسڵمانەکان دەسەڵاتیان بەسەرەوە نییە و ئەحکامەیلی شەریعەتی ئیسلام تێدا نییە و ڕەعیەتەکانی بە جەنگییەکان ناودەبرێن. هەرچی وڵاتانی ئاشتییە ئەوا بریتییە لەو هەموو ئەو سەرزەمینانەی وڵاتانی ئیسلامی کە ملکەچن بۆ ئەحکامەیلی ئیسلام، جا ئەگەر موسڵمان یان زمییەکانی تێدا بن. بۆیە بۆیە وڵاتانی ئاشتی هەموو ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە، کە ئەحکامەیلی شەریعەتی ئیسلامی تێدا پیادەدەکرێت، هەتا ئەگەر ئەو وڵاتانە پێکەوەش بەند نەبن –و وڵاتانی جەنگ- لەیەکیان جیابکاتەوە، کە تێیدا موسڵمانەکان یەکگرتووی ئایین یان ڕەگەزنامەی ئیسلامی بەیەکەوەیان دەبەستێت، وا دەبێ وڵاتانی ئاشتی (وڵاتانی ئیسلام) موسڵمان و هەروەها غەیرە موسڵمانیش بەخۆوە دەگرێت وەک زمییەکان[3].

---

[1] د. جابر الراوي، الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الايرانية، بغداد، 1975، ص65.

[2] Soheila Ghaderi Mameli, Quelles frontières pour le Moyen-Orient? Les frontières des États nés de la partie asiatique de l'Empire Ottoman 1913-1939. Thèse de Doctorat (sous la dir. De) Jacques Thobie, Université de Paris I Panthéon Sorbonne, Paris, 1996, p. 27.

[3] د. جابر الراوي، الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الايرانية، بغداد، 1975، صص74-75.

لەگەڵ سەرەتای دەورانی مۆدێرندا هەموو توخمەکانی دروستبوونی دەوڵەتگەلی نوێ لە ئارادابوون. لەوە بەدوا هەرێمەکان پشتیان بە نەتەوەکان دەبەست، بەجۆرێک دەکرێ بڵێین لە سەدەکانی دوانزە-سیانزەدا نەتەوە لە ئەوروپای ڕۆژئاوا ڕێکخراوی سیاسیی کۆمەڵگە بوو، کە دواتر ڕێگەی بۆ سەرهەڵدانی دەسەڵاتی دەوڵەت خۆش کرد. هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی سەرمایەداری و سەرهەڵدانی دەوڵەتی ناوەندیدا، گرنگی سنوور بۆ پاراستنی هەرێمەکان زیاتر بە دیارکەوت. بەقسەی هال سنووری دەوڵەتیی لەلایەنی مێژووییەوە لە هەردوو سەدەی شانزەهەم و سەدەی حەڤدەهەمدا وەدیارکەوتووە. یەکەمین هەوڵدان بۆ دیاریکردنی هێڵی سنووریی، ئەوەی پاپا ئەسکەندەری شەشەم بوو لە ساڵی 1494 بۆ هێلکێشانی سنوور، کە تێیدا جیهانی نوێ (ئەو زەوی و زارانەی لەدەرەوەی ئەوروپا دۆزرابوونەوە) لەنێوان پورتوگال و تاج قەشتالە لە پەیماننامەیەکدا کە لەڕووی مێژووییەوە بە پەیماننامەی توردیسیلاس* (7 ی حوزەیرانی 1494) ناسراوە لەنێوان ئەسپانیا و پورتوگال دابەشکرا. ئەو هێلەی کە لە پەیماننامەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە وەك هێلێك نەبوو بۆ دابەشدانی مومتەلەکاتەکان بەگوێرەی چەمکی نوێ، بەڵکو مەبەست لەوە دیاریکردنی هیلێک بوو بۆ دەستنیشانکردنی ناوچەکانی نفووز، کە هێلێک بوو لە قوتبی شیمالییەوە بۆ قوتبی جنوویی درێژدەبۆوە بە مەسافەی سەد فەرسەخ بە ئاراستەی ڕۆژئاوا و باشوور لە کەنارەکانی ئۆزو و دوورگەکانی کابۆ ڤێردی(Cape-Vede) . لەدەرەوەی ئەم هێلە هەموو زەویوزارەکان موڵکی هیچ میرێکی مەسیحی نین و پەیماننامەی توردیسیلاس لەسەر نەخشە -لە 7 ی حوزەیرانی ساڵی 1494 سنوورێکی کێشا، کە هاوجووت بوو لەگەڵ فەرمانی

*Tordesillas

پاپایی پێش ئەوەی دەوڵەتەکان دەستی بەسەردابگرن[1]. بەڵام دوای پەیماننامەی وێستفالی Westphalie 1648، لە کۆتایی سەدەی حەڤدەمەوە زۆر جەنگ و پێکدادانی ڕوویاندا. لە ئەنجامی جەنگەکانی لویسی چواردەهەمدا، لە ساڵەکانی 1643ەوە تا 1715 زۆر پەیماننامە لەنێوان فەرەنسا و وڵاتانی هاوسێیدا مۆرکران. بە نموونە پەیماننامەی پیرینێی Pyreneesی ساڵی 1659 جەنگی فەرەنسیی- ئەسپانی نەهێشت و چەند ناوچەیەکی بە فەرەنسا بەخشی. هەروەها پەیماننامەی ئوتریخت Utrechetی ساڵی 1713 لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسا، کە تێیدا فەرەنسا ناوچەی کۆلۆنی ئەکادی* بۆ بەریتانیا جێهێشت[2].

بە ڕوویێکی گشتیی تاوەکو کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم، چەمکی سنوور چەمکێکی ناڕوون و ئاڵۆز بوو بۆیە هەر لایەنێک بەگوێرەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی تەفسیر و لێکدانەوەی بۆ پەیماننامەکان دەکرد. دەکرێ بڵێین ئەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمەوە بوو، کە بیرۆکەی سنووری سروشتی بە بیرۆکەی هێڵکێشانی Delimitationی سنوورەوە بەسترایەوە.

جەنگی سی ساڵە[3]ی ئەوروپا (1618-1648) و دواتر پەیماننامەی وێستفالی Westphalie، کە لەوێوەوە سەروەریی دەوڵەت بەدیارکەوت، ئیدی پرەنسیپی سنوور بەم شێوەیە خۆی هێنایە پێشەوە: دەوڵەت دەسەڵاتی تاقانە و تەواوەتی هەیە بەسەر ئەو سەرزەمینە و ئەو خەڵکەی لەناو ئەم سنوورەدا

---

[1] د. جابر الراوی، الحدود الدولیة ومشکلة الحدود العراقیة..ص 74

* Acadie

[2] د. جابر الراوی، الحدود الدولیة.. ص 81

[3] جەنگی سی ساڵە (1918-1648) لەنێوان پاشا کاتۆلیکەکانی ئاڵمان و پرۆتێستانەکان ڕوویدا و دواتر تەشەنەی کرد و زۆر وڵاتی دیکەی ئاروپایی گرتەوە، ئیمپراتۆری پیرۆزی ڕۆم-گێرمانی، فەرەنسا، سوێد و ئیسپانیاش هاتنە ناو جەنگەکە.

دەژین. پەیماننامەی وێستفالی Westphalie (1648) بۆ یەکەمین جار پەیوەندی نێوان دەوڵەتانی دیاری کرد لەسەر ئەوەی ڕێز لەسەروەریی نێوانیان بگرن. لەسەدەی حەڤدەهەم تا سەدەی بیستەم بەپێی بیرۆکەی دەوڵەت-نەتەوە: دەبێ سەرزەمینەکان یەك بخرێن و سنووری ناوخۆیی بەقازانجی سەرزەمینێکی یەکگرتوو دەسرێتەوە و هەرێمەکان یەکد دەخرێن و سنووری دەرەکی دیاری دەکرێت و دەکێشرێت. ڕاستییەکەی دوای پەیماننامەی وێستفالی نەخشەی جوگرافی و کارتۆگرافی بەشێوەیەك پێشکەوت، کە ئەمە ڕێگەی بۆ دیاری کردن و دەستنیشانکردنی سنوورەکان خۆش کرد. لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمەوە فەرەنسا لەسایەی پێشکەوتنی کارتۆگرافیدا، توانی سنوورەکانی لەگەڵ دراوسێکانی دیاری بکات و کەوتە دروستکردنی نەخشەیەکی ورد بۆ فەرەنسا، بەم پێیەش جیاوازییەکی زۆر لەنێوان نەخشەی سرووشتی ساڵی 1525ی فەرەنسا و نەخشەی ساڵی 1798 هەبوو بە نیسبەت سنوورەوە. نەخشەکەی ساڵی 1798ی فەرەنسا بەتەواوی پشتی لە بیرۆکەی سنووری سرووشتی کرد بوو و پشتیوانی لە سیاسەتی هێلکێشانی سنوور کردبوو و ئەمەش زیاتر لە سۆنگەی شۆڕشی فەرەنساوە بوو، کە زیاتر ئەم ئایدیایەی ڕەگاژۆ کرد. ڕاستییەکەی لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسا (1789) گۆڕینکاریی گەورە ڕوویان دا و خەڵك نەیاندەویست چیتر تەنیا پاتشایەك بڕیار بدات، بەڵکو (تاك)ەکان بوون بە (هاووڵاتیی) و خاوەن ماف و دروشمی (ئازادی و یەکسانی)یان بەرزدەکردەوە. ئەوکاتە ئیدی سنورەکان گرینگییەکی دیکەیان وەرگرت و لەمەولا سنوورەکان "تەنیا سەرزەمینێك دیاری ناکەن تەنیا بۆ سەرۆك بێ بەڵکو هی هەموو هاووڵاتیانی وڵاتە".

میشێل فۆشێر لای وایە کە "ئەوە لە فەرەنساوە بوو، بیرۆکەی ژاکۆبییانە بڵاوبۆوە، کە سنوورەکانی دەوڵەتێك پێویستە هاوجووت بێ لەگەڵ

سنووره‌كانی یه‌ك نه‌ته‌وه و یه‌ك زمان و یه‌ك فه‌رهه‌نگ"[1]. راستییه‌كه‌ی وه‌دیاركه‌وتنی سیستمی ده‌وڵه‌ت-نه‌ته‌وه كه له ئه‌نجامی كارلێك كردنێك بوو، كه له ئه‌نجامی كارلێكركردنی نێوان خاك (سه‌رزه‌مین) و نه‌ته‌وه پێكهات (نه‌ته‌وه به‌مانای نوێ واته كۆمه‌ڵی مه‌ده‌نی، كه خۆی وه‌كوو بنچینه‌ی سه‌روه‌ریی سیاسیی ده‌بینی). ئه‌مه به‌و مانایه نییه كه سیسته‌مه سیاسییه‌كانی دیكه هیچ سیاسه‌تی هه‌رێمایه‌تیان نه‌بووه، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌ت-نه‌ته‌وه، سه‌رزه‌مین بوو به میراتێكی كۆمه‌ڵه‌یی و پارێزگاری لێكردنیشی بوو به ئه‌ركی ده‌وڵه‌ت[2].

سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌م كۆنگره‌ی ڤیه‌ننا 1815، بۆ ئه‌وه به‌سترا ده‌وڵه‌تی نوێ دابمه‌زرێنێ دوای ئه‌وه‌ی هێرشه‌كانی ناپلیۆن* نه‌خشه‌ی ئاوروپای گۆڕی بوو. به‌شێوه‌یه‌كی دیكه كۆنگره زیاتر به ئامانجی دووباره رێكخستنه‌وه‌ی فۆرمی ده‌وڵه‌تیی وڵاته ئه‌وروپاییه‌كان بوو دوای ئه‌و گۆڕینكاریانه‌ی به‌هۆی داگیركردنه‌كانی ناپلیۆنه‌وه دروست بووبوون. له دوادواییه‌كه‌ی سه‌ده‌ی حه‌ڤده‌هه‌م و سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌مدا ئایدیای ناسیۆنالیزم و ده‌وڵه‌ت-نه‌ته‌وه Etat-Nation به پێویستییه‌وه شوێنی ده‌وڵه‌تی ده‌ره‌به‌گایه‌تیی گرته‌وه.

له كۆتایی سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌م ئایدیای جوگرافیای سنوور درووست بوو. له ئه‌ڵمانیاوه له لایه‌ن فریدریك ڕاتزل Friedrich Ratzel ( 1844-1904) و له فه‌ره‌نسا ژاك ئانسێل Jacques Ancel (1879-1943) و له به‌ریتانیا هالفۆرد ژی. ماكینده‌ر Halford J. Mackinder (1861-1947) بیرۆكه‌ی جوگرافیای سنوور

---

[1] Michel Foucher, *Fronts et frontières. Un tour du monde géopolitique*, Paris : Fayard, 1988, p.97

[2] Michel Foucher, *Fronts et frontières. Un tour du monde géopolitique*, Paris : Fayard, p.61.

*Napoleon

هاتە ئاراوە. دوو چەمکی دژ بە یەك لە ئارادبوو. چەمکی یەکەم لەلایەن بیریارە فەرەنساییەکان وەك بونیادێکی سیاسیی سەیریان دەکرد، کە لەوانەیە لەسەر بنەمای توخمگەلێکی سرووشتی ( چیا، ڕووبار) سەرچاوەبگرێ یان نا. ئەم چەمکە بەشێوەیەکی تایبەتیی لەلایەن ژاك ئانسێل وەك یەك هێلی بەیەکگەیشتنی دوو هێزی سیاسیی دژ بە یەك، هێزی دوو دەوڵەتی ململانێکار، کە لەسەر خاك دژ بەیەك بن کۆنسێپیتوالیزە (چەمکسازی) کرابوو. هەرچی چەمکی ئەڵمانی بوو، پەیوەست بوو بە پەیوەندی نێوان خەڵك و فەزا. سنوور لەڕوانگەی ئەم جوگرافیناسانەوە زیندوو و لەناو کات دا جولاو بوو. سنوور وەك نیشانەیەکی شوێنیی کاری جیۆ-سیاسیی دەوڵەت بە دوو قۆناغی بەرفراوانبوون دادەنرێ. درێژبووەی دەوڵەتێك و فۆرمی (پەراوێز یان هێل) ی سنوورەکانی، کە هەمیشە بەگوێرەی نووسەرەکانی ڕادەوستێتە سەر ڕادەی (شارەستانیی بوون) (پەرەئەستاندنی فەرهەنگیی و هێزی ئابووری هتد).

بەدرێژایی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم ناسیۆنالیزم و بزاڤە ناسیۆنالیستیەکان لە ئەوروپا یەکێتیی هەرێمە دەرەبەگەکانی لەسەر بنەمای نەتەوەیی چەسپاند. دواتر ڕیفۆمی ئایینی و بزاڤی ناسیۆنالیزم دەرفەتی ئەوەیان بۆ بیرۆکە ناسیۆنالیستەکان ڕەخساند تا دەوڵەتی نەتەوەیی شوێنی دەوڵەتە دەرەبەگییەکان بگرێتەوە و ئەوە ناسیۆنالیزم بوو، کە سنوورە نەتەوەییەکانی لەسەر بنەمای یەکێتیی نەتەوەیی دەستنیشان دەکرد. بەم شێوەیە ئیتاڵیا بوو بە دەوڵەتێکی یەکگرتوو، ئەڵمانیاش بەهەمان شێوە، هەروەها زۆر دەوڵەتی دیکەش سەربەخۆ بوون: یۆنان، سێربیا و ڕۆمانیا لە ئیمپراتۆریای عوسمانی جیابوونەوە و پاشتریش دوای یەکەم جەنگی جیهانیی زۆر دەوڵەت و نەتەوەی دیکە لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی بەشێوەیەکی ئاشتییانە لە دایک بوون. بەم جۆرە دواجار پەیماننامەی ڤێرسای (1920)، کە لە دوای یەکەم جەنگی جیهان بەڕێوەچوو، دووبارە نەخشەی ئەوروپا و

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دارشتەوە و لەم دابەشکردنەوەیەدا کە دواین دابەشکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو و دیاری کردنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێکی گرینگی کارەکانی بوو، کورد (بەدەر لە ناوچەی سلێمانی) هیچ ئامادەبوونێکی سیاسیی-چەکداریی وەك بزاوتێکی سیاسیی ناسیۆنالیستی ئاوها بەرچاوی نەبوو و نە هیچ قسەکەرێکیشی هەبوو کە بەناوی بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی کورد پێ لەسەر داخوازینامە نەتەوەییەکانی دا بگرێ و لەسەر ئەرزی واقیع جێگە و سنوورێکی دیاریکراوی لەبندەست بووبێ.

زۆر بەدەگمەن ڕێک دەکەوێ سنوورە ڕەسمییەکان لەگەڵ سنوورە نەتەوەییەکان یەکگرتوو بن. دەوڵەتە نەتەوەییەکان هەمیشە و هیچ کات لەگەڵ ئەو سنوورانە جووت نابنەوە، کە لەسەر پێوانەی (ئیتنیک، زمان و کولتوور) بیناکراون[1]. ئەمە نهێنی ئەوە لێکدەداتەوە بۆچی تا ئێستە بزاڤی ناسیۆنالیستی گەلانی بێدەوڵەت هێشتا هەر زیندووە. بەقسەی تیۆریناسی ناسیۆنالیزم، ئێرنست گیللنەر* هەشت هەزار گرووپی زمانەوانی و ئیتنیکی لە جیهان هەیە، ڕێژەی دەوڵەتانی-نەتەوەیی کە خاوەنی دەوڵەتن و هەروەها ئەو نەتەوانەی بە ئامانجی نەتەوەیی نەگەیشتوون (کە نەیانتوانییوە ببن بە خاوەنی دەوڵەت) یەک بۆ دەیە[2]، واتە لە هەر دە گرووپەیلی ئیتنیکی دەبینین تەنیا یەک نەتەوە خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیەتی، کە ئەمە نهێنی تاوسەندنی ناسیۆنالیزم لێکدەداتەوە: شەپۆلی ئیتنیکی، شەپۆلی کەمینەنەتەوەکان و شەپۆلی ناسیۆنالیزمی گەلانی بێدەوڵەت، کە لەناو تەلبەندی سنووری دەوڵەتانی فرە نەتەوەدا دەژین و زۆر بە توندی لە دەرگای سبەینێی مێژوو دەدەن.

---

[1]Nation et nationalisme, Les dossiers de I'Etat du monde, editions Ia Decouverte, Paris, 1995, p.13.

*Ernest Gellner

[2] فالح عبدالجبار، القومية مرض العصر أم خلاصه؟ دار الساقي، لندن، 1995، ص 93.

## 4-1: حەشارگەیەک لە مێژووی کورد

تێکڕایی درێژی سنووری ئێرانی-عوسمانی کە لە کەنداوی فارسەوە تا چیاکانی ئارارات درێژ دەبێتەوە نیزیکەی 1180 میل دەبوو، کە لەو سنوورە دوورودرێژەدا 700 میلی بەناو خاکی کوردستاندا ڕەت دەبوو[1]، واتە نزیکەی لە 60%ی سنووری هاوبەشی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریا لەناو خاکی کوردستان بووە، کە دواتر عێراق نزیکەی (920) میلی لەو سنوورە بۆ مایەوە لەگەڵ ئێران، لەوەیاندا (440) میلی ئەو سنوورە بەناو خاکی کوردستاندا ڕەتدەبێ، کە کاریگەریگەرییەکی قووڵی کردۆتە سەر هەڵکەوتەی ئەم گەلە لەسەر هەردوو لای سنووی دەوڵەتییەوە[2]. بێگومان ئەمە لەگەڵ خۆیدا زۆر بە زەقییەوە تاسیری لەسەر ژیانی سیاسی، ڕۆحی و فەرهەنگیی ئەم دوو پارچەیەی کوردستان داناوە و ئەم دابەشبوونەی خاکی نیشتمان هەمیشە هۆیەک بووە لە هۆیەکانی بێ ئارامی سنووری هەردوولا و کێشە و ململانێی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریا.

ئەم باسە حەشارگەیەکی گەورەیە لە مێژوونووسیی کوردیدا و تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیی سەبەخۆ بە هیچ زمانێکی ڕۆژهەڵاتی و

---

(1) EDMONDS, C,J., Kurds, Turks and Arabs, travel and research in North-Eastern Iraq 1919- 1925, London, Oxford university press, 1957, p. 125.

(2) Ibid, p.125.

ڕۆژئاوایی سەرومڕ بۆ ئەم باسە تەرخان نەکراوە، هەر ئەم حەشارگەیەش بوو هانی ئێمەی دا بەشدارییەک بکەین لە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتەدا. کوردستان لە زۆربەی جارەکاندا هۆیەک بووە بۆ شڵەژان و پشێوییەکانی سنووری نێوان ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێرانی و دواتر ئەم ڕەوشە بۆ خۆی شوێنکاری لە هەمووان کاریگەرتری لەسەر ژیانی سیاسی، ڕۆحی و فەرهەنگیی خەڵکی کورد جێهێشتووە. لە سەرێکی دیکەوە جەنگی بەردەوام هەموو بنەوانێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کوردستانی وێران کردبوو. مێژووی پەیوەندییەکانی ئێرانی-عوسمانی بەشی زۆرترینی هەمیشە بریتی بووە لە جەنگ و فراوانخوازی بۆ داگیرکردنی کوردستان. کورد وەکو نەتەوەیەکی ئازا و شەڕکەر، کوردستان وەک شوێنێکی ستراتیژی بۆ پاراستنی ناوچە سنوورییەکانی هەردوو ئیمپراتۆریای ئێرانی و عوسمانی لە هێرشی یەکتر گرینگییەکی گەورەی هەبووە.

بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی پەیوەندییەکانی ئێرانی-عوسمانی دەبێ پەنا بۆ ئەو هێندە سەرچاوە و دەکومێنت ببەین تا بتوانین باسێک لەسەر کێشەکانی سنوور، واتە کوردستان و کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی ئامادە بکەین. مەخابن تائێستا مێژوونووسانی کورد توخنی باسێکی ئاوەها ناسک نەکەوتوون. ئێمە لەم باسەدا ئاستەنگی زۆرمان هاتە سەر ڕێگە، یەکەمیان: نەبوونی هیچ سەرچاوەیەکی تایبەت بەم باسە کە تۆزێک دەستمان بگرێ لەم بوارەدا، دووەمیان: پەرش و بڵاوی سەرچاوەکان کە دەبێ لە پەڕاوێزی سەرچاوە مێژوویی و کرۆنیکەکانی گەلانی هاوسێ و ئەرشیف و نامە ڕەسمییەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێرانی کەڵک وەربگرین.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ پڕکردنەوەی ئەم حەشارگە گەورەیەی لە مێژوونووسیی کوردیدا هەیە، حەشارگەیەک کە دەبێ پڕبکرێتەوە، ئەمڕۆ چ

دەکۆمێنتەکانی ئینگلیز، ئێران و عوسمانی، هەروەها سەرچاوە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکانیش بە زمانەکانی ڕۆژهەڵات لەبەر دەستدان و دەتوانن یارمەتییەکی زۆری مێژوونووس بدەن بۆ نووسینەوەی مێژووی کوردستان لە کڵاوڕۆژنەی کێشەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانییەوە، ئەو سنوورەی کە بەناو دڵی کوردستاندا دەڕۆیشت و بۆ کورد خۆی تەنیا بوو بەهۆی جەنگ وماڵوێرانی و بە پاشکۆبوون.

# بەشی دووەم

## عوسمانی و سەفەوی:
## فراوانخوازی و پێکدادان

1-2 : لەدایکبوونی دوو بلۆکی دژ بەیەک.
2-2 : جەنگی چاڵدێران: هاوپەیمانیی کورد و عوسمانی.
2- 3 : لە پەیماننامەی ئەماسیەوە–1555 تا پەیماننامەی سەراو–1618.
2- 4 : پەیماننامەی زەهاو 1639: یەکەم دابەشبوونی ڕەسمیی کوردستان.

## 1-2: لەدایکبوونی دوو بلۆکی دژ بەیەک

لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی ساسانی لەساڵی 651 ی زایینی تا دوادواییەکەی سەدەی پانزەهەم، وڵاتی ئێران بەتەواوی پارچە پارچە و وڵاتێکی فرە دەرەبەگایەتی بوو و هەر پارچەی لەژێر دەسەڵاتی دەرەبەگێکدا بوو. شەڕی نێوان ئەم دەرەبەگانە ڕێگەی لە یەکێتی سیاسیی وڵات گرتبوو و دواجار لە کۆتایی سەدەی پانزەهەمەوە کۆنفێدراسیۆنی خێڵەکانی ئاق قوینلو* ئیدی نەیدەتوانی لەمە زیاتر وڵات بەڕێوە ببات. شایانی گوتنە لە سەرەتای سەدەی پانزەهەم لە هەموو ڕۆژهەڵاتی موسڵماندا تەنیا سێ دەسەڵاتی سیاسیی هەبوو: یەکەمیان کۆنە سوڵتانە مەملوکەکانی میسر و وڵاتی شام، دووەمیان سوڵتانانی عوسمانی لە ئەنادۆڵ و سێیەمیشیان میرایەتی تەیمورلەنگ لە ئێران.

لەگەڵ سەرەتای سەدەی شانزەهەم، تەرازووی سیاسیی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گۆڕا، دروست لەو کاتەدا لە ئێران، شا ئیسماعیلی سەفەوی (1524-1501 ز) دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوییە بەردی بناغەی بناغەی دەوڵەتی سەفەوی داڕشت و توانی ئێران لەژێر یەک سەرکردایەتیی یەکگرتوو کۆبکاتەوە و لە پارچە پارچەیی بیپارێزێ. شا ئیسماعیل مەزهەبی شیعەگەریی دوانزە ئیمامی کرد بە بنەما و ئایینی ڕەسمیی دەوڵەت (1501) و

---

*AK Koyounlou

ڕێبازی حوکمڕانییەکەی لە بەڕێوەبەردنی وڵاتدا. بەگوێرەی تۆمارە مێژووییەکان شای گەنج (14 ساڵ)، شا ئیسماعیل شەوی جومعە لەگەڵ داروودەستەی دەوڵەتەکەی کۆبۆتەوە و ئەم مەسەلەیەی لەگەڵدا باس کردوون. بڕێکیان هەر بەراستی ترسیان لەو مەسەلە ترسناکە هەبووە، کە سێ چارەگی دانیشتوانی تەبرێز ئەهلی سوونەت بوون و لەوانەیە پەرچەکرداریی میللی یان ببێ و بوونی (شا)یەکی شیعە ڕەت بکەنەوە. بەڵام شا ئیسماعیل بەیانییەکەی هەینی پرسەکەی بەلادا خست و داوای لە خەتیبێکی شیعەی هەڵکەوتوو کرد ، کە لە مینبەری مزگەوت ڕۆژی هەینی خوتبە بەناوی ئیمامەیلی ئەهلی بەیت بخوێنێتەوە[1]. بەم جۆرە لە یەکەم هەینی دوای تاج لەسەرنانی بەناوی دوانزە ئیمامەیلی شیعەوە[2] خوتبەی خوێندرایەوە و هەر بەناوی ئەوانەیشەوە پارەی لێدا و لەسەر ڕووی پارەکانیش نوسرابوو (لا الله الا الله، محمد رسول الله، علي ولي الله) و لە دیوەکەی دیکەیدا نووسرابوو (السلطان العادل الكامل الهادی الوالی ابو المظفر شاه اسماعیل بهادر خان الصفوی خلد الله تعالی ملكه وسلطانه) و لە کەناری پارەکەش ناوی چواردە مەعسومەکە هەڵکەندرابوو[3]. بێگومان ڕەگ و بنچینەکانی ئەم دەوڵەتە سەفەوییە تیۆکراتییە دەگەڕێتەوە بۆ

---

[1] عباس حسن الموسوی (کمال السید)، نشوء وسقوط الدولة الصفوية (دراسة تحليلية)، ايران، قم، 2005، ص 35

[2] دوانزە ئیمامەیلی شیعەی جەعفەریی بریتین لە: عەلی کوری ئەبی تالیب، حەسەن، حوسەین، عەلی زینەلعابدین، محەممەد باقر، جەعفەر سادق، موسا کازم، عەلی ڕەزا، محەممەد جەواد، عەلی ئەلهادی، حەسەن عەسکەری، محەممەد مەهدی مونتەزیر (ئیمامی ون).

[3] هاشم حجازی فر، شاه اسماعیل اول و جنگ چالدران، انتشارات سازمان اسناد ملی ایران، چ اول، تهران، 1374، ص 53.

ئەو تەریقە سۆفیگەرییەی، کە شێخ سەفی دینی ئەردەبیلی (651 ك/1252 ز-736 ك/1334ز) دایمەزراند. لەوە بەدوا بنەماڵەی شێخ سەفیەدین هەر مانەوە و ڕۆژ بەڕۆژ لە دەورانی داگیرکارییەکانی مەغۆل و تورکمان و تەیموورییەکانی ئازەربایجان بەهێزتر دەبوون و تا لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم بوون بە مەزنترین هێز لە ناوچەکەدا[1]. شێخ صەفی ئەلدین ئیسحاقی ئەردەبیلیی توانی تەریقە سەفەوییە لە تەریقەیەکی تەنیا لۆکالییەوە بگۆڕێت بۆ بزووتنەوەیەکی ئایینی کە نفووز و کاریگەرییەکەی تەنیا لەناو سنووری ئێران گیرنەخوات، بەڵکو بیلادی شام و ئەنادۆڵیش بگرێتەوە[2].

دوای تێپەڕبوونی چوار وەچە لە دامەزراندنی تەریقەی سۆفیگەریی سەفەوییەوە، لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمەوە جونەید یەکەم سەرکردەی سەفەوی بوو، کە لە پاڵ ئەوەی پیری ڕۆحیی سەفەوییەکان بوو، خۆشی بە "پادشاه" ناساند و بۆ وەدیهێنانی ئەمە جونەید بزووتنەوەی سەفەوی لەسەر بنەمای سەربازیی ڕێکخست و لایەنگیرەکانی ئەوهێندە پیرۆزیان کردبوو تاڕادەی پەرستن[3]. ڕاستییەکەی گۆڕینی تەریقەتی سۆفیگەریی سەفەوی لە تەریقەیەکی سۆفیگەریی ئاشتیخوازەوە بۆ بزووتنەوەیەکی سەربازیی، کە پشت بە پرەنسیپی داگیرکردن ببەستێ، گۆڕینێکی گەورە بوو و جگە لەوە شێخ جونەیدی سەفەوی هەنگاوێکی دیکەی گرینگی نا بەوەی لە مەزهەبی

---

(1) طه ثلجي الطراونة، النزاع الصفوي العثماني حول العراق، في حوليات آداب عين شمس، مصر، المجلد 31 (يولية-سبتمبر 2003)، ص 53

(2) إبراهيم خليل أحمد (د)، و خليل علي مراد (د)، إيران وتركيا: دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، 1982، ص 17

(3) نفس المصدر، ص 18

سونتییەوە چووە سەر مەزهەبی شیعەگەریی دوانزە ئیمام[1].

دیارە دەبێ ئاماژە بەوە بدەین، کە یەکەمین کاری شا ئیسماعیل (1501-1524) تەواوکەری کارەکەی جونەید بوو، بە جاڕدانی مەزهەبی شیعە بوو وەك مەزهەبی ڕەسمیی دەوڵەتی سەفەوییە، شا ئیسماعیل بەزۆر و بە زەبروزەنگ ئەم کارەی سەپاند و ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی ئاینی، کە دژ بەوکارە بوون کوشت و بڕێکی تریشی ناچار کرد لە وڵات ڕابکەن. بەڵام هیچ بەڵگەیەکمان لەبەردەست نییە ئەوە بسەلمێنێ کە شا ئیسماعیل لە سەپاندنی تەشەیوع بەسەر کۆمەڵی ئێرانیدا سەرکەوتوو بووە، زیاد لە چەند ئاماژەیەك هەیە کە ئەم پرۆسێسە لە قۆناغەکانی دواتری دەورانی سەفەوییەدا تەواو بووە و ڕەنگە لە سەدەی هەژدەهەم بوویێت.[2] وەک لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە دوای ئەوەی شا ئیسماعیلی سەفەوی مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامی کرد بە مەزهەبی ڕەسمیی دەوڵەت فەرمانی بۆ هەموو خەتیبی مزگەوتەکان دەرکرد تا خوتبەکانیان بەناوی ئیمامەیلی دوانزە ئیمام بخوێننەوە. شەهادەی تایبەت بە شیعە بهێنن کە دەڵێ (أشهد ان لا اله الا الله، واشهد ان محمدا رسول الله، وان عليا ولي الله) و سەرباری ئەوە ڕستەی (حي على خير العمل) لە بانگداندا زیاد کرا. ئیسماعیل هەر لەگەڵ یەکەم ساتی دانیشتنی لە تەبرێز هەموو کۆششی خۆی تەرخان کرد بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی شیعەگەری و هەتا سڵی لەوەش نەدەکردەوە، کە بۆ بڵاوکردنەوەی شیعەگەریی بەناو ئێراندا زەبروزەنگیش بەکاربهێنێت[3]. تەنانەت هەندێک لە سەرچاوە مێژووییەکان زۆر

---

[1] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 54

[2] إبراهيم خليل أحمد (د)، و خليل علي مراد (د)، المصدر السابق، ص 21

[3] توفيق حسن فوزي، رؤية الوثائق والمصادر التركية للصراع العثماني والصفوي ومقدماته في عهدى بايزيد الثاني وسليم الاول، رسالة ماجستير في الآداب من قسم اللغة التركية، جامعة عين الشمس، 1986، ص35

بەزێدەڕۆییەوە باس لەوە دەکەن، کە شا ئیسماعیل هەر کەسێک ڕەتیبکردبوایەوە بچێتە سەر مەزهەبی شیعە دەیکوشت و هیچ کەس لەم یاسایە بەدەر نەبوو، منداڵ بوایە یان ژن و قوربانیانی ئەم زەبروزەنگە زیاتر لە ملیۆنێک کەس بووە[1]. زەبروزەنگییەکەی تا ئەو ڕادەیە بووە "فەرمانی دەرکردبوو لاشەی مردووی سەرۆکەکانی ئاق قۆینلو لەناو گۆڕ دەربهێنن و بیانسووتێنن"[2]

بەڵام سەرباری هەموو ئەوانەش هێشتا ناکرێ ململانێی نێوان سەفەوی و عوسمانی هەرتەنیا بە ململانێیەکی مەزهەبی ڕووت بناسین. ڕاستییەکەی مەزهەبی شیعەگەریی زیاتر بەرتەکی کولتووری سیاسیی و ڕۆحیی ئێرانی بوو لە بەرامبەر کولتووری ترادسیۆنی مەزهەبی سوننەگەرای دەسەڵاتی خەلیفەکانی عەرەبی و دواتریش ئیمپراتۆریای عوسمانی و ڕۆڵێکی یەکجار گرینگی گێڕا لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییەدا. بەم شێوەیە شا ئیسماعیل لە مەزهەبی شیعەگەری گۆچانی ڕزگاریی بۆ ئێران دۆزییەوە، کە ئەمە ڕزگاری کرد لە پارچەپارچەبوون و جەنگی ناوخۆیی و تەشەیوع بوو بە کۆکەرەوەی ئێرانییەکان و هەموان بەرگرییان لێ دەکرد بەو پێیەش عەقیدەی ئاینیی و سیاسیی بوو لە یەک کاتدا، کە دواتر بوو بە بنەوانی مێژوویی دەوڵەتی نەتەوەیی ئێران بێ ئەوەی ئەوە لە بیربکات سوود لە بنەچەکی خانەوادەکەی وەربگرێت جا چ بەلای ئالی بەیتدا بێت یان بەلای ئاق قۆینلو بووبێت لە پڕۆژەی سیاسییەکەی بۆ دەوڵەتی سەفەوییە[3].

---

(1) محمد عبدالطيف هريدي، الحروب العثمانية الفارسية واثرها في انحسار المد الاسلامي عن اوروبا، دار الصحوة للنشر والتوزيع، القاهرة، 1987، ص 44

(2) محمد سهيل طقوش، تاريخ الدولة الصفوية (في إيران) 907-1148 ه/1501-1736م، ط 1، بيروت، دار النفائس، 2009، ص 55

(3) د. طالب محيبس حسن الوائلي، الصفويون. من الطريقة الصوفية حتى تاسيس الدولة، دار تموز، ط 2، دمشق، 2011، صص181-182

شا ئیسماعیل هەموو هەوڵی ئەوەبوو سەرتاپای سەرزەمینی ئێران لەژێر یەک دەسەڵاتی یەکگرتوو کۆبکاتەوە و هەموو هەوڵی بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەک بوو بۆ یەکخستنەوەی ئەو سەرزەمینانە. دوای ساڵێك لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەی، شا ئیسماعیل هێزێکی بۆ ڕەدوونانی مورادی کوڕی یەعقووبی کوری ئۆزۆن حەسەنی حاکمڕانی فارس و عێراق و دوایین میرەکانی ئاق قۆینلوو نارد و لە نزیك هەمەدان تێکگیربوون و شکستی پێهێنا و میری ئاق قۆینلوو ڕای کردە بەغدا و هەرێمی فارس کەوتە چوارچێوەی موڵکی سەفەوییەوە. ئەم پەل کێشانەوەیەش بە یەکەمین هەڵکشانی سەفەوی لە قوڵاییی بانی ئێراندا هاتە ژمار و ئەو ناوەندەشی گرتەوە، کە حوکوومەتەکانی ئێران بەدرێژایی مێژوو بە دەورییەوە مۆڵ بووبوون[1].

وەك گەڕۆك و دیپلۆماتی ئیتالیایی کاتیرینۆ زینۆ[2] لەبارەی ئەم جەنگەوە نووسیویەتی "لەم شەڕەدا زیانی سوڵتان مورادی ئاق قۆینلوو زۆر بێشومار بوو ژمارەی کوژراوەکانی 30.000 هەزار کەس دەبوو و شا ئیسماعیل لاشەکانی لە گۆڕەپانی جەنگ کردبوو بە گردۆلکە و هەرچی موراد بوو لەگەڵ حەفتا کەسی دڵسۆزی خۆی ڕای کرد بۆ بەغدا و دواتر بۆ حەلەب و پاشان عەلاء ئەلدەولەی زی ئەلقەدر بەگەرمی پێشوازی لێ کرد و هێز و ورەی وەبەرنا و هانی دا سوپاکەی دابمەزرێنێتەوە بۆ ئەوەی شانشینەکەی بگرێتەوە، نەك هەر ئەوە بۆ نیشاندانی خۆشەویستی زیاتری و ڕق لێبوونەوەی لە شا ئیسماعیل یەکێك لە کچەکانی خۆیشی لێ مارە کرد. سوڵتان موراد ویستی بەرەیەکی سەربازیی لەگەڵ مەمالیك دژ بە سەفەوییەکان دروست بکات بەڵام سەرنەکەوت"[3].

---

[1] محمد سهيل طقوش، تاريخ الدولة الصفوية، المصدر السابق، صص 55-56

[2] Caterino Zeno

[3] علي شاكر علي (أ.د)، الاصول التأريخية للكيانات السياسية في الشرق الادنى

دیارە پێویستە لێرەدا ئاماژە بەو ڕاستییە بکەین، کە لە سەرەتاکانی دەیەی یەکەمی سەدەی شانزەهەم پێوەندی نێوان دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی تا ڕادەیەك ئارام بووە و "هێمنی" باڵی بەسەرداکیشاوە ئەگەر بشێ وای پێ بڵێین و سوڵتان بایەزیدی دووەم (1471-1512) پیاوێکی ئەدەبدۆست و مۆزیکخواز و ئاشتیخواز بوو و لایەنگیری پشتگیریکردنی ڕاگرتنی پەیوەندی باشی سەفەوی-عوسمانی بوو. جا لە سۆنگەی سیاسەتی نەرمی سوڵتان بایەزیدی دووەم و کەسێتییەکەی کە حەزی لە زانست و ئەدەبیات بووە بڕێك لە مێژوونووسەکان ناوی بایەزیدی سۆفی یان لێ نا بوو[1]. بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان سوڵتان بایەزیدی دووەم تا ئەو ڕادەیە لەگەڵ شا ئیسماعیل نەرم بووە، کە ساڵی 1508ز نامەی پیرۆزبایی بۆ ناردووە بەبۆنەی داگیرکردنی عێراق و ئێران و بە (پادشاهی هەرە مەزن و هەرە بەڕوومەت، پادشای مەمالیکی عەجەم و کۆردیناتۆری نوێی وڵاتەیلی تورك و دەیلەم. شا ئیسماعیلی سەفەوی خوداوەند بناغەی دادورییەکەی پایەدار و تەمەن درێژی بکات و پشتگیریی بکات بۆ سەرکەوتنەکانی) ناوی بردووە نامەی پیرۆزبایی بۆ نووسیوە و داوای سەرکەوتنی بۆ کردووە[2] و تەتەرێکیشی بەناوی محەممەد چاوەش باڵابان بۆ لای شا ئیسماعیل ناردووە بە دیاریی زۆرەوەوە[3]. وا دیارە کە ئەو ئامانجی

---

الحديث (دولة الاق قوينلي (الخروف الابيض) في الاناضول والعراق 1378-1508م/780-914 هـ مجلة جامعة كركوك للدراسات الانسانية، المجلد 7، العدد 3، لسنة 2012 ، ص 19

[1] حفيظلة مفتي و سعيدة بوقرة، العلاقات العثمانية-الصفوية خلال القرن 10 هـ/16م، جامعة الدكتور يحي فارس بالمدية، 2014-2015، ص 22.

[2] علي شاكر علي (أ.د)، ولاية الموصل العثمانية في القرن السادس عشر، دراسة سياسية-ادارية-اقتصادية، منشورات دار غيداء للنشر والتوزيع، عمان، ط 1، 2011، ص 47

[3] ايناس سعدى عبدالله، المصدر السابق، ص 194

ئەوەی بووە پەیوەندییەکی نوێ لەگەڵ شا ئیسماعیل دابمەزرێنێ، بەبێ ئەوەی درك بەو مەترسییە بکات کە بۆسەر دەوڵەتەکەی دروستی دەکات، جا کاتێك شا ئیسماعیل دەستدرێژیی کرد لە ئازاردانی موسڵمانە سوننەکان و هەڵاتنی ئەوانە بۆ ناو خاکی عوسمانی، سوڵتان نامەی بۆ نووسی و داوای لێ کرد ئاوەزمەندانە لەگەڵ ئەهلی سوونەت مامەڵە بکات چ زیندوو و چ مردوویان و بەشوێن ڕێچکەی پێشینە گەورەکان و مێژووی ئێران و شارەستانیەتە کەونارایەکەی بڕوات[1].

سەفەوییەکان سیاسەتی ئاشتیخوازانەی سوڵتان بایەزیدی دووەمیان بەرانبەر بە ڕۆژهەڵات قۆستەوە و هەوڵیان دا مەزهەبی شیعەگەریی لەناو هۆزە تورکمانەکانی ئانادۆڵ بڵاوبکەنەوە و بڕێك لە هۆزە تورکمانەکان بە پیر بانگەوازەکەی شا ئیسماعیلەوە چوون و ئەویان بە بەرگریکاری خۆیان دەناسی. هەر بۆیە سوڵتان بایەزیدی دووەم ناچار بوو ساڵی 1502 ئەوانەی مەیلی شا ئیسماعیلی سەفەویان هەبوو لە خاکی ئەنادۆڵ و چەند هەزار شیعەیەکی لە ئەنادۆڵ گواستەوە بۆ نیمچە دوورگەی (مۆریە Morea) و دووریان دووربخاتەوە[2] و سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتیشی داخست بەمەبەستی دابڕانی شا ئیسماعیل لە بنکەی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات، بەڵام ئەمە سوودی نەبوو و لایەنگیرەکانی شا ئیسماعیل سوودیان لەڕێگەپێدانی کاروانی بازرگانەکان وەردەگرت، کە بەناو ئەنادۆڵدا ڕەت دەبوون[3].

---

(1) محمد سهيل طقوش، تاريخ الدولة الصفوية، المصدر السابق، ص 69

(2) بوكريطة سارة وبن رابح لامية، الدولة الصفوية (906 هـ/1500 م-982/1576 هزم)، جامعة الجيلالي بونعامه خميس، 2017، صص 47-48. "Michael J. McCaffrey; ČĀLDERĀN", *Encyclopaedia Iranica,* Vol. IV, Fasc. 6, 1990, p. 656

(3) ايناس سعدى عبدالله، المصدر السابق، ص 195

ڕاستییەکەی دەتوانین بڵێین ئەنادۆڵ لە بندەستی دەوڵەتی عوسمانی نەبوو بەڵکو زیاتر شوێنگەی پروپاگەندەی لایەنگیرانی سەفەوییە بوو و ئەمەش سەرچاوەی نیگەرانیی و نائارامی بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی[1]. لایەنگیرانی شا ئیسماعیل لە هەموو ئەنادۆڵ هەتا لە باڵقانیشەوە بانگخوازی هەبوو، لایەنگیرەکانی لەناو دەوڵەتی عوسمانی بە هەزاران سەردانیان دەکرد، تا بوو بە سەرکردەی ئاینی و سیاسیی هەموو تورکمانەکان. بەم شێوەیە بزووتنەوەی قزڵباش بە نیسبەت حوکومەتی عوسمانی لە کێشەیەکی ناوخۆیی زیاتر بوو[2]. ڕاستییەکەی وێرای هەڵمەتی چەوساندنەوە کە عوسمانییەکان دەرهەق بە شیعەکانی ئەنادۆڵ دەیانکرد و هەوڵدان بۆ لەناوبردنیان، بەڵام ڕەوتی شیعەگەریی هەر بەردەوام بوو لە بەرگریی، ئەمە پاڵی بە عوسمانییەکان وەنا تا فەتوای کافرکردن شیعەکان دەربکەن[3].

فەرووخ یەسار یەکێك لە حاکمڕانە دوژمنە هەر سەرسەختەکەی شا ئیسماعیل بوو، بۆیە هەر دوای بەدەستگرتنی دەسەڵات، یەکەمین کاری شا ئیسماعیل تۆڵەسەندنەوە بوو لە شا فەرووخ یەسار، حاکمی شێروان. بۆیە یەکەمین کاری سەربازیی کە شا ئیسماعیل کردی، بریتبوو لە تۆڵەسەندنەوەی کوشتنی حەیدەری باوکی. لە (جەمادی یەکەم/کانوونی یەکەمی 1500 ز) هێرشی بۆ سەر شێروان بەخۆیی و لەشکرێکی قزڵباش، کە حەوت هەزار جەنگاوەر دەبوون پەلاماری پایتەختەکەی شەماخی دا و حاکمڕانەکەی فەرووخ یەسار شای دەستگیر کرد و کوشتی. شا ئیسماعیل لەم لەشکرکێشییەدا تا ئەوپەری ڕادە توندوتیژی و زەبروزەنگی بەکارهێنا، لاشەی فەروخ یەسار

---

[1] عباس حسن الموسوی (كمال السيد)، المصدر السابق، ص 41

[2] د. خليل اينجاليك، تاريخ الدولة العثمانية من النشوء الى الانحدار، ص. 52

[3] عباس حسن الموسوی (كمال السيد)، المصدر السابق، ص 44

شای سووتاند و گۆڕی حاکمانی شێروانی تێك وپێك دا و گۆڕی خەلیلی باوکی فەرووخ یەسار شا و بکوژی جونەیدی باپیری هەڵدایەوە و لاشەکەی دەرهێنا و سووتاندی، منارەیەکی لە کەللەسەر درووست کرد و موتەلەکات و موڵك و ماڵ و قەڵای خانەوادەکەی بەتاڵان برد و کۆتایی بە حوکمڕانیان هێنا، پاشان بەدوای سوڵتان ئیبراهیمی کوڕی فەروخ یەسار شا کەوت کە توانیبووی ڕا بکات و دەستی بەسەر شاری باکۆدا داگرت[1].

دوای لەشکرکێشی بۆ سەر شێروان و لەناوبردنی حوکمی ئاق قۆینلوو، شا ئیسماعیل خۆی زۆر بەخێرایی دەستی کرد بە فراوانکردنی نفووزی، ئەلوەند بیستی چی لە شێروان ڕوویداوە، ترسا لەوەی کە ئەو ئامانجی دووەم بێت، ویستی بە پێش داگیرکردنی ئازەربایجان بکەوێتەوە بە هێرشی بۆ سەر نەخچەوان، هەردوو سوپای و ئاق قۆینلوو لە نزیك نەخچەوان بەیەك گەیشتن، ئاق قۆینلوو لەسەر دەستی هێزێکی سەفەوی بە سەرکردایەتیی بێری بەگی قاجار شکا. شا ئیسماعیل بەردوام بوو لە بەرەوپێشوەچوونەکەی و بەهێزێکی سەرەکی سەفەوی لە شرور/سرور ئەلوەندی تێکشکاند[2]. شا ئیسماعیل بوو بە تەنیا سەرداری ئازەربایجان و هەرچی پاشماوەی وڵاتی فارس و عێراقی عەرەبی بوو دوای دە ساڵ لە شەڕی سەخت دەستیان بەسەردا گیرا (907ك/1501ز-916ك/1510ز)[3].

شا ئیسماعیل دوای لە شکرکێشی بۆسەر شێروان و دواتر لەناوبردنی حوکمی ئاق- قۆینلو کەوتە پەلهاوێشتن و فراوانخوازی و هەرزوو ساڵی 1507 کەوتە هەڵپەی داگیرکردنی میرنشینی (عەلاء ئەلدولە) لە ئەنادۆڵ و یەکەم

(1) محمد سهيل طقوش، تاريخ الدولة الصفوية، المصدر السابق، ص 53

(2) علي إبراهيم درويش ، المصدر السابق،ص 83

(3) نفس المصدر، ص. 84

دەستپێکردنی هێرشەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی بۆ سەر کوردستان داگیرکردنی دیاربەکر و خارپووت بوو[1] و ڕاستییەکەی شاری دیاربەکر، بەبێ بەرگرییەکی ئاوها خۆی دا بەدەستەوە و محەممەد خان ئۆستالجو کرا بە حاکمی دیاربەکر و ئیدی ئەم شارە بوو بە ناوەندێک بۆ هێرشە عەسکەرییە دواترییەکانی سەفەوی چ بەرەو ڕۆژئاوا و چ بەرەو باشوور[2] و بەم جۆرە دەبینین بەماوەیەکی کورتی مێژوویی هەموو دەوڵەتۆکە کوردییەکان و هۆزە تورکییەکانی چیای تۆرۆسی بچووک و کەمەنەتەوە مەسیحییەکان لە ئەرمینیا ملکەچ بوون، کە ئەمانە هەموویان بوون بە مومتەلەکاتی شا ئیسماعیلی سەفەوی بەگوێرەی بانگاشەی سەفەوییەکان، لەبەرانبەردا سیاسەتکارانی ئیستەنبوڵ ڕایانگەیاند، کە دەوڵەتی سەفەوی دەستدرێژیی کردۆتە سەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی بەوەی عێراق و کوردستان و ئەرمینیای بەخۆیەوە لکاندووە[3]. شایانی گوتنە کاتێك شا ئیسماعیل لە 20 ی جمادی دووەمی ساڵی 914 ی ك/16 تشرینی یەکەمی 1508 بەغدای داگیرکرد، مەولا حوسێن- خزمەتکارە تایبەتییەکەی خۆی- کرد بە خەلیفەی خولەفاکان و ناوی نا ئەبا مەنصور، وەك گاڵتەپێکردن بە خەلیفە مەنسووری عەبباسی و خەلیفەی عەباسییەکان، گۆڕی ئیمامی حەنەفی ئەلنوعمانی هەڵکەند و ئێسکوپروسکی

---

[1] حسن بیگ روملو، أحسن التواریخ، تصحیح: د. عبدالحسین نوائی، ج2، انتشارات اساطیر، ص1، تهران 1384ه. ش، ص1017-1019.

[2] علي شاكر علي (أ.د)، ولاية الموصل العثمانية في القرن السادس عشر، دراسة سياسية-ادارية-اقتصادية، منشورات دار غيداء للنشر والتوزيع، عمان، ط 1، 2011، صص 44-45

[3] علاء نورس، العراق في العهد العثماني، دراسة في العلاقات السياسية، 1700- 1800م، بغداد، 1979، ص 22.

هێنایەوە دەرەوە و سوتاندی و وەك سەرچاوەكان دەگێڕنەوە بۆ چەند ڕۆژێك سەگێكی لە شوێندا ناشت[1]. دوای داگیركردنی بەغدا، شا ئیسماعیل هێرشی كردە سەر هەرێمی حەوێزە لە عەرەبستان بۆ سەر ئەمارەتی مەشعشەعین[2] و سوڵتان فەیازی مەشعشەعی نەیتوانی بەرگری لەبەرانبەر شا ئیسماعیل بكات و لە پایتەختەكەی ڕای كرد و شا ئیسماعیل ئەمارەتەكەی داگیر كرد و یەكێك لە پیاوەكانی خۆی كرد بە حاكم و دوایی دەستی بەسەر لووڕ و خوڕەم ئابادیشدا گرت و بەمە هەموو ناوچەی عەرەبستانی كەوتە ژێردەست و لە ساڵی 916 ك/1510 ی ز شا ئیسماعیل بە داگیركردنی مووسڵ هەموو عێراقی كۆنترۆڵ كرد[3] و بەم شێوەیە ئیدی دەوڵەتی سەفەوی وەكو دراوسێیەكی بێزراو بەرانبەر بە عوسمانییەكان بەدیاركەوت. ڕاستییەكەی عوسمانییەكان زیاتر لەوەی سەفەوییەكان وەك مەترسی بزانن بۆسەر عەقیدەكەیان، بەڵكو زیاتر پێیان وابوو هەڕەشەیەكی سیاسییە و هەڕەشە لە كۆنترۆڵكردنی عوسمانی دەكات بۆ سەر ئەنادۆڵ[4].

ڕاستییەكەی فراوانخوازییەكانی سەفەوی سەرچاوەی نیگەرانییەكی گەورەی سوڵتانی عوسمانی بوون، بەجۆرێک عوسمانییەكان نەیاندەتوانی لەبەرانبەر داگیركردنی بەغدا بێدەنگ بن و گرێدانی عێراقی عارەبی و

---

[1] شوقي ابوخليل (الدكتور)، تشالديران، سليم الاول العثماني وأسماعيل الصفوي، دار الفكر، دمشق، 2005، ص 19

[2] ئەمارەتی عەرەبیی مشعشەعین: شێخ محەممەد كوری فەلاحی ئەلمشەعشیی دایمەزراند (840 ك/1436 ز) و حەوێزە، كە كەوتبووە سەر ڕووباری كەرخە كرد بە پایتەختی خۆیی و دەسەڵاتی بەسەر عەرەبستان ڕاگەیاند. بڕوانە طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص : 73

[3] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق،ص 54

[4] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 54

کوردستان و ئەرمێنیا یان بە بەزاندنی سنووری دەوڵەتی عوسمانی و پێشێلکردنێکی ئاشکرای قەڵەمڕۆیەکەی دەناسی[1]. بەم جۆرە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سنووری دەوڵەتی سەفەوی ئەوهێندە بەرفراوان بوو بوو، کە دەگەیشتەوە سنووری جارانی ئیمپراتۆریای ساسانی و بوو بووە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ و ڕاستەقینە بۆسەر ئیمپراتۆریای عوسمانی[2]. سنووری دەوڵەتی تازە درووستبووی سەفەوییە هێندە بەرفراوان بووبوو لە ڕووباری جەیحون (ئاموداریە) تا بەسرە (شەتی عەرەب) و لە ئەفغانستانیشەوە تا ڕووباری فورات درێژ دەبۆوەوە بەم شێوەیە دەوڵەتی سەفەوی شیعە بوو بە هاوسێ و هاوسنووری دەوڵەتی عوسمانی سوونە[3]. بەم شێوەیە ئیدی سنووری دەوڵەتی سەفەوی شیعە مەزهەب بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی سوننی مەزهەب بۆ دروست بوو، کە ئەمەی دوایی وەک لە ئایین دەرچوو حسێبی بۆ دەوڵەتی سەفەوییە دەکرد.

سیاسەتی دەمارگیریی مەزهەبیی شا ئیسماعیلی سەفەوی ناکۆکی قووڵی خستە نێوان پەیوەندییەکانی کورد و ئازەر لەلایەک و تۆوی ناکۆکییەکی قووڵی مەزهەبیی نێوان شیعە و سوننە و ناکۆکییەکی قووڵی نەتەوەیی کورد و عەجەمی لەلایەکی دیکەوە چاند[4]. سیاسەتی شا ئیسماعیل لەبەرانبەر کورد لە سیاسەتی ئۆزۆن حەسەن دەچوو، هەردووکیان زۆر لە سەرۆک هۆزەکانیان لا بردن و پیاوەکانی خۆیان لەشوێنیاندا دادەنا. وەک ئالتەرناتیڤی ئەمە، وەختایەک

---

[1] LONGRIG, S, H., Four centuies of modern Iraq, Oxford, London, 1925, p. 19.

[2] ساڵح محەمەد ئەمین، کورد و عەجەم: مێژووی سیاسیی کوردەکانی ئێران، کوردستان، هەولێر، 1992، لا 23.

[3] شوقی ابوخلیل (الدکتور)، المصدر السابق، ص 20

[4] ساڵح محەمەد ئەمین ، هەمان سەرچاوە، ل 25

دەسەڵاتی ناوخۆیان دەدایە دەست خەڵکی ناوخۆ، بەوە ددانیان بە خێزانە خێڵەکییە کۆنەکان دا نەدەنا، بەڵکو پایەکی نزمتریان پێدەبەخشین. جولانەوە یاخیبووەکان کە سەرکردە کوردەکان ئەوانەی کە دژایەتی ئەم سیاسەتەیان دەکرد سەرکردایەتییان دەکرد و ئەوانەی کە هەوڵیان بوو سەربەخۆیی خۆیان بهێڵنەوە یان سەربەخۆ بن، بەرەورووی داپلۆسینەوەیەکی وەحشییانە دەبوونەوە و وەفدێک کە پێکهاتبوو لە دوانزە سەرۆکی کورد، ڕێککەوتبوون ملکەچیی خۆیان بۆ شا ئیسمایلی سەفەوی ڕابگەینن و جاری بەیعەتی خۆیانی بۆ بدەن لە بارەگای زستانەی لە خوی (لە ساڵی 1501 یان نزیک لەو مێژووە)، دەستبەسەری کردن و پاشان شا ئیسماعیل سەرکردەگەلێکی بڕواپێکراوی لە هۆزەکانی قزڵباش دانا بۆ زەوییەکانی ئەو میرانە بە ئامانجی کرۆنۆش پێ بردنیان[1]. بەم جۆرە دەبینین دەوڵەتی سەفەوی وەختایەک ئەمارەتە کوردییەکانی داگیر دەکردن میر و پادشای قزڵباشی ئازەری لێوە دەکردن بە فەرمانڕەوا و ڕاستەوخۆ بە دەسەڵاتی ناوەندیی ئیمپراتۆریای سەفەوییەوە دەیبەستنەوە.

دەکرێ بڵێین، دەرکەوتنی بلۆکی ئیمپراتۆریای سەفەوی لە ناوچەکە و بەڕەسمیکردنی مەزهەبی شیعە وەکو ئایینی دەوڵەت، لە بنەڕەتدا دابڕانێکی تەواو بوو لە بلۆکی ئیمپراتۆریای عوسمانی سونّی مەزهەب و دەرکەوتنی هێزێکی دیکەی عەقایدی بوو لە ناوچەکە لەبەرامبەر ئیمپراتۆریای عوسمانیدا.

ڕاستییەکەی مەزهەبی شیعە بۆ ئێرانییەکان بەرلە هەرچی شێوەی تایبەتیی دەسەڵاتی ئێران بوو بۆ نەتوانەوە لەناو دەسەڵاتی عەرەبی ئیسلامی سونّی و پاراستنی ڕۆحانیەتی نەتەوەیی ئێران بوو، بۆیە دەشێت وەرگرتن و چەسپاندنی شیعیزم لە ئێران وەکو پرۆسەیەکی سەرلەنوێ دروستبوونەوەی یەکێتیی ژیانی

---

[1] BRUINESSON, M, V., Aga, Shaikh and state, the social and political structures of Kurdistan. Editions Zed Books Lid, London, 1992, p. 140.

ڕۆحیی دابنرێت، کە ئێرانییەکان بەو هۆیەوە توانیان بەتەواوەتی و تاسەر خۆیان لە یەکێتیی ژیانی ڕۆحیی گەلانی تری ئیمپراتۆریای عارەبی و دواتر عوسمانی جودابکەنەوە و ئازادانە کەسایەتی و کولتووری خۆیان گەشەپێبدەن[1]. بەجۆرێک لە جۆرەکان دەکرێ بڵێین دەوڵەتی سەفەوی گەڕانەوەی یەکێتی و سەروەری و ناسنامەی ئێران بوو دوای نۆ سەدە لە داگیرکاری و پارچەپارچەبوون هەر لە داگیرکردنی ئیسلامەوە و ئەوە یەکەمجار بوو دوای ئەو مێژووە ئێران ببێتەوە دەوڵەتێکی ناوەندی و یەکگرتوو.

لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمدا دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی هەردووکیان لەوپەڕی هێز و توانای خۆیان دابوون و هەریەکەیان دەیویست لەسەر حیسابی ئەوی دیکە هەنگاوی فراوانخوازانە بهاوێ، کوردستان لە هاوکێشەی ئەم مململانێ سیاسیی- عەسکەرییەدا بوو بە شانۆی جەنگ و پێکدادانی نێوان هەردوولا و زۆربەی شەڕەکانیان و لەشکرکێشییەکانی هەردوو ئیمپراتۆریا بەناو خاکی کوردستاندا تێپەڕ دەبوون. ڕەنگدانەوەی هەموو ئەم جەنگ و لەشکرکێشییەی نێوان هەردوولا لە ناوچە کوردەوارییەکاندا هیچ بوارێکیان بۆ گەشەسەندنی فەرهەنگ و دامەزراوە سیڤیلەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری نەهێشتەوە. کێشەکە ئەوەبوو کە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی کۆنترۆلکردنی کوردستان یان بە خاک و گەلەوە بە کارەیلی ستراتیژی و چارەنووسساز دەزانی کە ناکرێ فەرامۆش بکرێت، بۆیە هەر لایەک کۆششی بوو خاکی کوردستان بخاتە ناو بازنەی نفوزی خۆیەوە. دیارە نابێ لەهەمان کاتدا ئەوەش لەیاد بکەین کە ململانێیی عوسمانی-سەفەوی زیاتر ململانێیەکی ئابووری بوو بەتەک ئەوەی مەزهەبی و جوگرافیایی بوو و کوردستان بۆ ئەوان گرینگ بوو، چونکە چەند بەشێک لە ڕێگەی جیهانیی ئاوریشم بە کوردستاندا

---

[1] ڕەفیق سابیر، ئیمپراتۆریای لم، سوید، 1997، لا: 110

تێپەردەبوو[1]. لەلایەکی دیکەوە بەو پێیەیش، کە کوردستان ناوچەی سنووری جیاکەرەوە بوو لەنێوان هەردوو دەوڵەت و دەرگایەکی کراوەش بووە بۆ لەشکرکێشییەکانی ئێران بۆسەر عێراقی عارەبی، کە شوێنە پیرۆزە ئایینییەکانی شیعەی بەخۆیەوە گرتبوو و هەمیشە بۆ ئێرانییەکان مەڵبەندێکی ڕۆحی یەکجار پیرۆز بووە. بەم جۆرە شارەکانی عێراق بە تایبەت شارە پیرۆزەکانی نەجەف و کەرەبەلا و بەغدا بۆ ئێرانی شیعە گرینگییەکی گەورەی هەبوو چ لەسەر ئاستی سیاسیی و چ لەسەر ئاستی ئایینییەوە. بێگومان دەبێ ئەوەشمان لەبەرچاوبێت، کە ڕەگی سۆفیگەریی سەفەویی زیاتر ڕەگێکی ئەنادۆلییە و قوڵایی شیعەگەریی سەفەوییە هەمیشە لەدەرەوەی ئێران بووە، لەناو ئانادۆل و زۆر بەتایبەتیش لەناو عێراق بووە. دیارە ئەگەر بزانین لە کۆی دوانزە ئیمامەیلی شیعە گڵکۆی شەش لەو ئیمامانە لەناو عێراق دایە لەوانە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە نەجەف، کوڕەکەی حوسێن لە کەربەلا، موسا کازم و جەواد لە کازمییە، عەلی نەقی و حەسەن عەسکەری لە سامەرا، ئەوسا لەوە تێدەگەین بۆچی سەفەوییەکان پێداگرییان دەکرد لە لکاندنی عێراق بە دەسەڵاتی خۆیان و بۆچی ئەم هەموو لەشکرکێشی و پەلکوتانە بۆسەر عێراق[2] و بەم جۆرە شارەکانی عێراق بە تایبەت شارە پیرۆزەکانی نەجەف و کەرەبەلا و بەغدا بۆ ئێرانی شیعە گرینگییەکی گەورەی هەبوو چ لەسەر ئاستی سیاسیی و چ لەسەر ئاستی ئایینییەوە. بێجگە لەوەش لەڕووی جیۆستراتیژییەوە عێراقی عارەبی تاکە دەڕووی ئێران بووە بۆ سەر زەریای ناوەڕاست[3].

---

[1] د.احمد محمود الخليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، دار ئاراس و دار الساقي، بيروت، 2013، ص 224.

[2] طه ثلجي الطراونة، النزاع الصفوي العثماني حول العراق، في حوليات آداب عين شمس، مصر، المجلد 31 (يولية-سبتمبر 2003)، ص 69

[3] د. سەعدی عوسمان هەروتی، چەند لایەنێکی مێژووی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و

لەولای دیکە بەو پێیەیش، کە لەسەدەی شانزەهەمدا ئیمپراتۆریای عوسمانی لەدەورانی زێڕینی هێزدابوو و نەیدەتوانی لەبەرانبەر فراوانخوازییەکانی ئیمپراتۆریای تازە گەشەسەندووی شیعەی سەفەوییە بێدەنگ بێ. لەنێوان ئەم دوو بلۆکبەندییە ناکۆکە مەزهەبی- نەتەوەییەدا، میرو بەگە کوردەکان کە زۆربەیان بە مەزهەب سوننی بوون نەیانتوانی ببن بە هێزێکی سێیەم لە ناوچەکەدا. لێرەدا پرسیارێکی بەجێ خۆی قووت دەکاتەوە: باشە بۆچی کورد نەیتوانی سنووری وڵاتی خۆی بپارێزێ؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە دڵنیاییەوە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ تێگەیشتن لە هۆکارە سۆسیۆ-کولتووری و جیۆپۆلیتیکییەکان، دەکرێ بڵێین کەوا کورد نە ئەم کولتوورە ڕۆحانییە بەهێزە و نە شوێنە جوگرافیەکەشی ڕێگەیان بۆ خۆشنەکردووە تا یەک دەسەڵاتی ناوەندیی یەکگرتوو لە کوردستان دابمەزرێنێ. مێژوونووسی کورد، شەرەفخانی بەدلیسی لە زاری مەلا سەعدەددین کە فێرکاری سوڵتان مورادی سێیەم (1574-1595ز) بووە لەناو مێژووە تورکییەکەیدا کە بۆ عوسمانییانی داناوە لەبارەی سیفەت و خەسڵەتی کوردیشەوە دواوە و دەڵێ: (میر و پادشا کوردەکان هەریەکەیەکیان لەلایەکەوە بۆخۆی بە تاکی تەنیا ئاڵای ستەمکاری بەرزکردبۆوە و وای پێ باشتر بوو لەسەر دوند و ترۆپکی کەژ و کێوان ژیانێکی سەربەخۆی ئازاد بژی، لە خوا بەیەک زانین بەولاوە هیچ جۆرە یەکێتییەکیان لەناودا نەبوو)[1].

---

ئابووریی کوردستان لەسەردەمی عوسمانیدا، هەولێر 2013، ل11. هەروەها بڕوانە: عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا، منشورات دار الكتاب العربي، القاهرة 1963، ص327.

[1] شرفخان البدليسي، شرفنامه في تاريخ الدول والامارات الكردية، ترجمه الى العربية: محمد علي عوني، دار الزمان، 2009، الجزء الاول، ص 61.

هێرشی سەفەوییەکان بۆسەر کوردستان و تالان و بڕۆیی و کوشتوکوشتاری خەڵکی کوردستان و سیاسەتی دژە-کوردانەی شا ئیسماعیلی سەفەوی و هەوڵدان بۆ نەهێشتنی میرایەتی پاشا و بەگە کوردەکان، هەر هێندەیان بۆ کورد هێشتەوە کە بکەونە داوی پاڵپشتیکردنی دەوڵەتی عوسمانی بۆ خۆوەدوورگرتن لە ستەم و جەوری سەفەوییەکان، کە ئەمە ئەم خۆگرتنەوەیە بە دەوڵەتی عوسمانی یەکەمین هەنگاوی دیاردەی پاشکۆیەتییێکی* ناچاریی بوو لای کورد، کە دواتر بوو بەترادسیۆنێک کە هێشتاکەش ئاسەوارەکەی هەرماوە. دەوڵەتی عوسمانی کە یەکەمین هێزیی جیهانیی بوو تا سەرەتای نیوەی یەکەمی سەدەی شانزەهەم بەرەو ئاوروپا هەڵدەکشا و خەریکی داگیرکردنی ئاوروپا بوو، لەوەبەدوا ڕووی هێرشەکانی وەرگێڕایەوە سەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ویستی سنوورێک بۆ فراوانخوازییەکانی دەوڵەتی سەفەوی دابنێ، کە لە نزیکەوە هەڕەشەیان لە دەوڵەتی عوسمانی دەکرد. سوڵتان سەلیمی یەکەم (1512-1520) دوای ئەوەی لە جەنگی چاڵدێران لە (23ی ئابی 1514) بە هاوکاری و بەشداری ڕاستەوخۆی میر و بەگە کوردەکان توانی شا ئیسماعیلی سەفەوی ئاوەها بشکێنێ کە تەبریزی پایتەختیش داگیر بکات. دوای ئەم جەنگە بەشی زۆری کوردستان کەوتە ژێر قەڵەمڕۆی دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەمەی دوایی بە پێچەوانەی سیاسەتی دەوڵەتی سەفەوی ڕێگەی بە میر و بەگە کوردەکان دا ئازادی کاروباری ناوخۆیی میرنشینەکانیان بپارێزن و لە سنووری ناوچەکانی خۆشیاندا حوکمڕانی ناوخۆیی خۆیان بکەن.

بەشێکی زۆری لەشکرکێشی و پێکداهەڵپڕژانەکانی نێوان ئەم دوو بلۆکە هەر لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تا کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانیی، لەسەر خاکی کوردستان بووە، لە مێژووی خوێناوی چوار سەدە زیاتری نێوان دەوڵەتی

---

*Clientelisme

عوسمانی و ئێراندا، ڕەنگە زیانی مرۆیی و ماددی کورد بەتەنیا لە هی هەردووکیان زۆرتر بێ. هەموو ئەم جەنگ و هێرشانە هێندەی دیکە یەکێتیی نەتەوەیی کوردیان پارچە پارچەتر کرد. ئیدی بەم تەرزە هەردوو دەوڵەت بۆ بەرژەوەندی خۆیان تیرە و هۆزە کوردەکانیان لەیەک ڕاست دەکردنەوە و بەگژ یەکدیاندا دەدان، ئەم سیاسەتە لەسەردەمی شا تەهماسپی یەکەمدا (1524-1576) بەشێوەیەکی توندوتیژتر بەردەوام بوو[1].

بەگژیەکداکردنی هۆزەکانی کورد و ڕاستکردنەوەیان دژ بە یەکتری و خۆشکردنی ئاگری فیتنە و ئاژاوە لەنێوانیاندا، هەمیشە پەیوەندییە سیاسیی و دیپلۆماسییەکانی ئێرانی-عوسمانی شێواندووە، بەشێوەیەک چ دەوڵەتی عوسمانی و چ دەوڵەتی سەفەوی هەریەکە دەیانویست میر و هۆزە کوردەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن و دژ بە یەکتری بەکاریان بهێنن و بیانکەن بە پیاوی خۆیان. بەنموونە شەرەفخان لە شەرەفنامەدا دەنووسێ کە سوڵتان سولێمانی غازی بۆ دابینکردنی کاروبارەکانی محەممەد خانی سەرۆکی هۆزی مەحموودی، کە پشتی لە شا تەهماسپی یەکەم وەرگێڕابوو و بوو بوو بەپیاوی ئەو، ڕۆژانە (100) ئاقچەی بۆ بڕیبۆوە[2]. هەروەها لە بیرەوەرییەکانی مەئمون بێگەبەگدا هاتووە کە میری میرانی بەغدا محەممەد پاشا، نامەیەکی بۆ بێگەبەگ نووسیوە و دەڵێ: (ئەگەر تۆ لە خزمەتکارەکانی پاتشای، ئەوا لەسەرت پێویستە سەری بڕاو و زمانی لەتکراوی لایەنگیرانی قزڵباشمان بۆ بنێری تا ڕاستگۆیی و نییەت پاکی خۆت بخەیتە بەردەم مەقامی بابیعالی، شایەد ئەمە ببێتە هۆی

---

[1] د. شەمسی موحەممەد ئیسکەندەر، مێژووی کورد لەسەدەی 16 هەمدا، وەرگێڕانی لە ئازەرییەوە: شوکر مستەفا، هەولێر، 1998، لا: 83

[2] هەمان سەرچاوە، لا: 97

ئەوەی کوڕەکەت ئازاد بکرێت)[1]. لە گێژەنی ململانێی نێوان ئەم دوو هێزەدا، لە ئەنجامی سیاسەتی دژە کوردانە و وێرانکردنی کوردستان لەلایەن دەوڵەتی سەفەوییەوە، بەناچارییەوە زۆرینەی کوردیان بەرەو هاوپەیمانیی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی سوننی مەزهەب و پشتگیری کردنی دەوڵەتی عوسمانی برد دژ بە دەوڵەتی سەفەوی.

بەڵام ڕاستییەکەی گەرچی دەوڵەتی عوسمانی و میر بەگە کوردەکان جۆرە ڕێککەوتنێکیان لەنێواندا هەبوو، بەڵام ئەم ڕێککەوتنە لەنێوان هێزێکی گەورە و ئیمپراتۆراییەکی پانوپۆر و چەند میروبەگێکی ناو جوگرافیایەکی بەرتەسك و سنووردار بوو و تەنیا بۆ سەردەمێکی تایبەت و بۆ ئامانجێکی تایبەت مۆرکرابوو، بۆیە دەبین دەوڵەتی عوسمانی هیچ پابەندییەکی وای نەبوو لەلایەن خۆیەوە بەرانبەر پاراستنی میر و بەگە کوردەکان و سوڵتان چۆنی بویستبایە ئاوا میرو بەگە کوردەکانی دەگۆڕین و ئەم ڕێکەوتنە لە دوای پەیماننامەی ئەماسییە (1555)، دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەتەواوی قاچی لەناو سەرزەمینی کوردستان قایم کرد، ئیدی ئەم پەیوەندییە بەرەبەرە بەرەو کاڵ بوونەوە دەچۆوە. ئەولیا چەلەبی کە وەك ڕاوێژکاری لەشکرکێشیی عوسمانی بووە لەگەڵ ئەحمەد پاشا بۆ هێرش بۆ سەر ئەمارەتی بدلیس و لە یادەروەرییەکانی لە کتێبی (سیاحەتنامە) (1655) ئەوەی تۆمار کردووە، کە پاش تەواوبوونی شەڕەکە ئەحمەد پاشا هۆی شەڕەکەی پێ وتووە و ئەوە دەگێڕێتەوە کە "کاتێك کە ساڵی 1048 هـ/1638 سوڵتان موراد خان بەغدای گرت، لە گەڕانەوەیدا خانی بدلیس نەهات خەزا پیرۆزانەی لێ بکات، مورادخان زۆر دڵی ڕەنجا و بە منی گوت: ئەحمەد وەك قەرزی خوا لەسەرت فەرزبێ کە تۆڵەی من لە خانی

[1] مذكرات مأمون بگ بن بيگە بگ، ترجمة محمد جميل الروژبياني و شكور مصطفى، بغداد، مطبوعات المجمع العلمي العراقي- الهيئة الكردية - 1982، ص 35.

بدلیس بستێنیتەوە"[1]. بەم جۆرە ئەولیا چەلەبی باسی هۆی لەشکرکێشیی عوسمانی بۆسەر ئەمارەتی بدلیس دەگێڕێتەوە "عەسکەرەکانمان ئەوەندەیان مل هەڵبڕیبوو، سەڵکەکانیان پێ هەڵنەدەگیرا، ناچار بوون لووت و گوێیان دەبڕین و سەرەکانیان فڕی دەدا، هی وایان تێدابوو (بیست) گوێچکە و (دە) لووتی هێنابوو، یەکێکی دی (چل) گوێ و (بیست) کەپووی پێ بوو"[2]. بەهەمانشێوە دەبین هیچ کات ئیمپراتۆریای عوسمانی ئامادە نەبووە لەسەر کوردانی (سوننە) بەدەنگەوە هاتبێت، بۆ نموونە دەبین کوردانی موکری گەرچی سوونە مەزهەب بوون و لەناو قەڵای دمدم (1607) و بەرەوڕووی خوێناوی ترین پەلاماری هێرشی شیعەگەرانەی سوپای شا عەبباس بوونەوە بەبێ ئەوەی سوڵتانی عوسمانی، کە خۆی بە داکۆکیکاری سوونیزم دەزانی، بەهانایانەوە بێت.

---

(1) بوار نورەدین، میر عەبدا خانی بدلیس بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لەمێژووی کورددا 1587-1680، چاپی دووەم، سلێمانی، 2008، ل 87

(2) بوار نورەدین، میر عەبدال خانی بدلیس بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لەمێژووی کورددا 1587-1680، چاپی دووەم، سلێمانی، 2008، ل 42

## 2-2: جەنگی چاڵدیران: هاوپەیمانیی کورد و عوسمانی

### کورد: دیوارێک لە خوێن و گۆشت !
### (سولێمانی قانوونی)

وەک لە پێشدا وتمان لە سەرەتای سەدەی پانزەهەم نەخشەی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی موسڵمان گۆڕینکارییەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی: هەردوو کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکیی تورکمان: ئاق قۆینلو (مەڕی سپی-سوونە مەزهەب) و قەرەقۆینلو (مەڕی ڕەش -شیعە مەزهەب) لەسەر کەلاوەی ئیمپراتۆریای تەیمورلەنگ وەدیارکەوتن. لە ساڵی 1405، قەرە یوسف لە فیدراسیۆنی قەرەقۆینلو داوای لە میری کوردیی میرنشینی بتلیس کرد، کە کورد بوو هاریکاری بکات و توانی دەسەڵاتی بەسەر تەواوی هەرێمەکانی ویلایەتی کوردستان و ئازەربایجاندا بگرێت[1]. بەجۆرێک ئۆزۆن حەسەن سەرۆکی ئاق قۆینلو (مەڕی سپی)، یەک لەدوای یەک دەستی بەسەر هەموو ناوچەکانی قەرەقۆینلو (مەرە ڕەشەکان) گرت و بوو بە سەرداری ئەرمەنستان، کوردستان و ئێران و پایتەختی لە تەورێز دامەزراند و بوو بە شای ئێران. حەسەن ئۆزۆن

[1] شەمسی موحەمەد ئیسکەندەر، هەمان سەرچاوە، لا:65

(1478-2-2-1423) دەیویست بنەماڵەی سەفەوی بەلای خۆیەوە ڕابکێشێ و بەقازانجی دەوڵەتی ئاق قۆینلوو بەکاریبهێنێت. حەسەن ئۆزۆن کچەکەی خۆی (مارتا)ی دا بە حەیدەری کوڕی جونەیدی سەفەوی و ئۆزۆن حەسەن پێش کۆچی دوایی کردنیشی بە تاعوون (2 ی شوویاتی 1478) حوکمڕانی ئەردەبیلیشی بە حەیدەر بەخشی[1]. کۆچی دوایی حەسەن ئۆزۆن ساڵی (1478) سەرەتای قوناغێکی پشێوی و ئاژاوە بوو لەمێژووی دەوڵەتی ئاق قۆینلو و ململاتێیی نێوان میرە تورکمانەکان کە چاویان بڕیبووە دەسەلات هێندە زیاتر ببو کە ئەوەندە بەسە بڵێین تەنیا لەماوەی یەك ساڵدا (1479) پێنج حاکمی ئاق قۆینلوو لە بەغدا گۆڕدران و ململانێیی نێوان بنەماڵەی حەسەن و کوشت و بڕی یەکتری وای کرد تا ساڵی 903 ك/1497 لەوەچەی حەسەن ئۆزۆن تەنیا سێ میر بمێننەوە: موراد بەگی کوڕی یەعقووب لە شێروان، ئەلوەندی کوری یوسف بەگ لە ئازەربایجان و محەممەد بەگی کوڕی یوسف بەگ لە عێراق[2].

ڕاستییەکەی بەکۆچی دوایی ئۆزۆن حەسەن(1478) ئیدی هاوپەیمانێتی نێوان ئاق قۆینلو و سەفەوەییەکانیش کۆتایی هات. یەکەم نیشانەی داڕمانی ئەم هاوپەیمانێتییە هەڵوێستی ئاق قۆینلوو بوو لە جەنگی چەکداریی نێوان حەیدەر، کە دەیویست تۆڵەی کوژرانی (جونەید) ی باوکی لە حاکمی شێروان بکاتەوە. ئاق قۆینلو پشتگیریی حاکمی شێروان بوون و ئەم پشتگیریەشیان هۆکارێکی یەکلاکەرەوە بوو لە سەرکەوتنیان بەسەر سەفەوییەکان و کوشتنی حەیدەر لە گۆڕەپانی جەنگ (تەمموزی 1488)[3]. دوایین چارەگی کۆتایی سەدەی پانزەهەم ئیدی پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەی سەفەوییە و میرەکانی

---

[1] علي شاكر علي (أ.د)، الاصول التأريخية للكيانات السياسية ، المصدر السابق، ص17

[2] علي شاكر علي (أ.د)، نفس المصدر ، ص 18

[3] إبراهيم خليل أحمد (د)، و خليل علي مراد (د)، المصدر السابق، ص 19

دەوڵەتی ئاق قۆینلوو گەیشتبووە ئاستێکی هێندە خوێناوی، گەرچی حەیدەر کچی ئۆزۆن حەسەنی هێنا بوو بەڵام ئەوە ڕێگەی لەوە نەگرت کە میرەکانی ئاق قۆینلوو هەوڵی لەناوبردنی هەموو کوڕەکانی حەیدەر بدەن و بەم جۆرە دواین دوو گرێی دەساڵیی سەدەی پانزەهەم پەیوەندییەکانی بزووتنەوەی سەفەوییە و میرەکانی ئاق قۆینلوو تەنیا کوشتن و شمشێر بوو. ڕاستییەکەی هەر لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمەوە چاوی سەرکردەکانی ئاق قۆینلوو هەمیشە هەر لەسەر بزووتنەوەی سۆفیگەریی سەفەوییە بووە و سێ لە پیر و سەرکردەکانیان: جونەید و حەیدەر(1488) ی کوڕی و عەلی (1494ز) کوڕەزاکەی بە دەستی ئاق قۆینلوو کوژران و تەنانەت شا ئیسماعیل، زۆر بە سەختی لەدەست ڕۆستەم سوڵتانی ئاق قۆینلوو ڕزگاری بوو[1].

دوای مەرگی شا یەعقوب (1478-1490)، یەکێک لە نەوەکانی ئۆزوون حەسەن، دەسەڵاتی گرتە دەست بەڵام هێندەی نەبرد شا ئیسماعیلی سەفەوی، نەوەی شێخ جونەیدی سەفەوی توانی دەسەڵاتی تەواوی سیاسیی لە ئێران بگرێتە دەست. بۆیە لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی ئاق قۆینلوو، ئەو دەوڵەتە تامپۆنەی کە بەربەست بوو لەنێوان عوسمانییەکان و سەفەوییەکان نەما و عێراق بوو بە ئەملاکی دەوڵەتی سەفەوییە و عوسمانیش هەر چاوی لەسەر بوو. بۆیە کاتێك ئەو دوو دەوڵەتە تامپۆنە، کە لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بوون، لەناوچوون و لەسەر نەخشەی سیاسیی سڕانەوە و لە ئەنجامدا هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی یەک بوونەوە[2]. دوای ئەوەی بیلادی شام کەوتە بندەست عوسمانییەکان (1516 ز) عێراق بوو

[1] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 54

[2] Rahmatollah Achoube-Amini, Le conflit de frontière irako-iranien, Université de Paris (Thèse de doctorat en science politique), Société anonyme des imprimeries Delalian, Paris, 1936. p. 30.

بەو مەیدانەی کە پلان و ئامانجی هەردوولای تێدا کۆبۆوە. چونکە ناوچەیەکی سنووریی بوو لەنێوان هەردوو دەوڵەتی شەڕکەر بۆیە هەمیشە ژێردەستەی بەهێزترینان بووە[1]. بەم شێوەیە ئەو ڕەوشە لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوی وەکو هێزێکی گەورەی ناوچەکە لەبەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی و سیاسەتی دژە-کوردانەی شا ئیسماعیلی سەفەوی بەناچارییەوە کوردییان بەرەو یەک هەڵبژاردن برد ئەویش هاوپەیمانیی بوو لەگەڵ عوسمانییەکان.

دەبێ ئەوە بگوترێ، کە هەر لەسەرەتای دەسەڵات گرتنە دەستی سوڵتان سەلیمی یەکەم (24 ی نیسانی 1512)ەوە پێوەندی نێوان عوسمانییەکان و سەفەوەییەکان ساردی تێ کەوت بوو. دوای بەدەسەڵات گەیشتنی سوڵتان سەلیم، بالیۆزانی: ڤینیسیا، پۆلۆنیا، میسر و ڕووسیا بۆ پیرۆزبایی هاتن بۆ لای سوڵتانی عوسمانی بەڵام بالیۆزی ئێران نەهات. لەم ساتەدا هەموو درکیان بەوە کردبوو، کە جەنگێك لەنێوان سوڵتان سەلیم و خەنیمەکەی شا ئیسماعیل ڕوودەدات [2]. ڕاستییەکەی سوڵتان سەلیم هەر لەگەڵ گەیشتنە دەسەڵات یەکەم کاری بەپەلەی دانانی ڕادەیەك بوو بۆ دەستدرێژییەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی و سوڵتان سەلیم چاك درکی بەوە کردبوو، کە شا ئیسماعیل مەترسییەکی گەورەیە بۆ سەر هەڵوەشاندنەوەی ئەنادۆڵی عوسمانی، ئەو یاخیبوونەی کە لە دوایین ساتەکانی دەسەڵاتی سوڵتان بایەزیدی دووەمی باوکی ڕوویان دا، ئەوەیان دووپاتە دەکردەوە و بۆیە ئەو بەو قەناعەتە گەیشتبوو کە چارەسەرکردنی کێشەی ئەنادۆڵ تەنیا لەڕێگەی لەناوبردنی دەوڵەتی

---

(1) طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 65

(2) فاضل بيات(د)، الدولة العثمانية في المجال العربي : دراسة تاريخية في الاوضاع الادارية في ضوء المصادر العثمانية حصرا (مطلع العصر العثماني-اواسط القرن التاسع عشر) مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 2007، ص 244.

سەفەوییە دەبێ[1]. ڕاستییەکەی دەکرێ بڵێین، کە سوڵتان سەلیم هەرکە گەیشتە دەسەڵات دوو ئامانجی لەبەرچاو گرتبوو: یەکەمیان: دانانی ڕادەیەك بۆ دەستدرێژییەکانی سەفەوییە بۆ ئەنادۆڵ و دووەمیان لەناوبردنی دەوڵەتی مەمالیك لە میسر و شام، کە ئەوانە پشتگیریی دەوڵەتی سەفەوییەیان دەکرد[2].

ڕاستییەکەی وەدیارکەوتنی دەوڵەتی تازەگەشەسەندووی سەفەوییە بە مەزهەبی شیعەگەرییەوە لەسەر سنووری ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بۆ عوسمانییەکان تا دوارادە جاڕس بوو، بۆیە پێکدادانی نێوان ئەم دوو هێزە کارێکی حەتمی بوو، نەخوازەش لەکاتێکدا بوو، کە فراوانخوازیی سەفەوی لە عێراق هاوکات بوو لەگەڵ بەدەسەڵات گەیشتنی سوڵتان سەلیمی یەکەم بۆسەر عەرشی عوسمانی[3]. بۆیە هەر لەگەڵ سەرەتای حوکمڕانی سوڵتان سەلیم یاوەز (1520-1512) ململانێی مەزهەبی - سیاسیی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی شێوەیەکی زیاتر توندتر و ناکۆکتری گرتەبەر و چووە قاڵبی جەنگ و لەشکرکێشی بۆسەر یەکتر و ئەگەرەکانی جەنگ زۆر نزیک و بەڵکو حەتمیش بوون. دەبێ لێرەدا ئاماژە بەوە بکرێت، کە ململانێی نێوان سەلیمی یەکەم و شا ئیسماعیل لە ساڵی 1514 گەرچی بەگوێرەی هەموو سەرچاوە مێژووییەکان لە ڕووکاری دەرەوەیدا ئەوەندەی ململانێیەکی مەزهەبی بووە بەهیچ شێوەیەک ئەوەندە ململانێیەکی نەتەوەیی نەبووە. بەڵام نابێ هەرگیز ئەو ڕاستییەش لەبیر بکەین، کە ململانێی عوسمانی-سەفەوی تەنیا ململانێیەکی دینی- مەزهەبی ڕووت نەبوو. هەردوو دەوڵەت خۆیان بە دوو دەوڵەتی

---

[1] ايناس سعدى عبدالله، المصدر السابق، ص 197

[2] حفيظة مفتي و سعيدة بوقرة، المصدر السابق، ص 28

[3] Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843, pp. 159-160.

ئیسلامی دەناسی و لەڕوانگەی پاڵنەری ئیستراتیژی و سیاسی و سیستمی بەرژەوەندییەکانەوە کێبەرکێیان بوو لەسەر دەستبەسەرداگرتنی جیهانی ئیسلامی. بەڵام دووپاتکردنەوەی مەزهەبیی بۆ ئینتمای هەر دەوڵەتێکیان بۆ خەڵکەکەی و بۆ هێزەکانی گوڕ وتینێکی ئایدۆلۆژی و عەقایدی پێدەبەخشین لە ململانێکە و بۆ هەر یەکێکیان چەکی پێدەبەخشی بۆ بەکارهێنانی فیرقەی ئیسلامی و یادەوەری ئەمەی دوایی لە پاکانەهێنانەوە بۆ جەنگەکان و کۆکردنەوی سوپا بۆی[1]. ڕاستییەکەی ململانێی نێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان تەنیا ململانێی ئیسپاتی وجود نەبوو، بەڵکو ملاملانێیەك بوو لەسەر زەعامەت یان سەرچاوگەی ئیسلامیی، کە هەردوو لا بە بەهرە وەرگرتن لەو باوەڕەیلە باتینیانەی، کە مافی ئەو بانگەشکردنەی پێ دەدان، کە داوایان دەکرد بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەوان ئەو نوێنەرایەتییە دەکەن[2].

سوڵتان سەلیمی یەکەم ناسراو بە (یاوز) سوننییەکی توندڕۆ و دڵڕەق بوو لە ڕاپۆرتێکدا، کە بالیۆزی ڤینیز لە 5 ی نیسانی 1512 لەبارەی سوڵتان سەلیم نوسییوە" ئەم شازادەیە دڵڕەقترین مرۆڤە، تەنیا خەون بە داگیرکارییەوە دەبینیت و هەر خەریکی ئەوەیە جەنگ چی بۆی دەچنێتەوە"[3]. سوڵتان بەر لە

---

[1] وجيه كوثراني، الفقيه والسلطان: جدلية الدين والسياسة في تجربتين تاريخيتين العثمانية والصفوية-القاجارية، مركز العربي للابحاث ودراسة السياسيات، بيروت، ط 4، 2015، ص 77-78

[2] موسى بن محمد آل هجاد الزهراي (الدكتور)، الدولة الصفوية الإثنى عشرية: النشأة، وآلاثار، وعوامل الانهيار، مركز العصر للدراسات االستراتيجية والمستقبلية – لندن، 2016، ص 10

[3] Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843, p.137.

دەستپێکردنی جەنگ (وەک هەندێک سەرچاوە دەڵێن) کەوتە پاکتاوکردنی هەوادارانی سەفەوی لە ئەنادۆڵ و وەک بڕێک لە سەرچاوە مێژووییەکان باسی دەکەن بە تۆمەتی شیعەگەرایی نزیکەی چل هەزار (40000) شیعەی سەر بڕیووە و ئەوانی دیکەشی خستۆتە زیندانی ئەبەدییەوە[1] و داگیرکردنی ویلایەتی بەغدای لەلایەن شا ئیسماعیلەوە کردە بیانوو بۆ لەشکرکێشییەکی گەورە بۆسەر وڵاتی ئێران. دیارە دەبێ ئەوەش بگوترێت، کە زەوینەی ناوخۆیی بۆ دەستپێکردنی هێرشی عەسکەریی بۆسەر سەفەوییەکان پێشتر خۆش کرابوو. لەمبارەیەوە دەوترێت کە زانایانی ئایینی دەوڵەتی عوسمانی بانگەوازیان بۆ داکۆکیکردن لە سوننە و جەنگینی مولحید و گومڕاکان دەکرد. لەوانە بە نموونە مەولا محەممەدی کوری عومەری کوری حەمزە (لە 938ک/1531ز مردووە) دنەی سوڵتان سەلیمی یەکەمی دەدا بۆ جیهاد دژی سەفەوییەکان و کتێبێکیشی لەبارەی ڕەوشی داگیرکاری و چاکەکانی نووسیوە و بەو ئەنجامە گەیشتووە، کە پێویستە ئەم تایەفە لە دین هەڵگەڕاوە لەناو ببرێن.

---

[1] علي الوردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، الجزء الأول، بغداد، 1969، صص 45-46.، فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، المصدر السابق، صص 244-245

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت، گەرچی زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان پشتگیریی لەم ڕایە دەکەن و تەنانەت لە نامە و نامەکارییەکانی نێوان شا ئیسماعیل و سوڵتان سەلیم پێش هەڵگیرسانی جەنگی چالدێرانیشدا ئەوە هاتووە، کەچی مێژوونووسی فەرەنسایی پسپۆڕی بواری مێژووی عوسمانی، ژان باکی لویی-گرامۆن، لای وایە" هیچ بەڵگەیەک نییە ئەو ئەفسانەیە پشت ڕاستبکاتەوە، کە سوڵتان سەلیمی یەکەم لە ساڵی 1513 یان 1514 چل هەزار شیعە مەزهەبی گومڕای قەتڵوعام کردبێت"، بگەڕێوە بۆ:

Jean-Louis Bacqué-Grammont , L'apogée de l'empire (1512-1606), In *Histoire de l'empire ottoman*, Paris, Fayard, 1989, p.141.

زانایانی ئایینی دەوڵەتی عوسمانی هەربەوە نەوەستان، بەڵکو دەستیان کرد بە جۆشدانی کۆمەڵانی خەڵکی عوسمانی لەڕووی ئایینییەوە، لە مزگەوتەکان دنەی خەڵکیان دەدا و باسی پادداشتی جیهادیان دەکرد دژ بە ستەمکاریی فارس، کار بەوە گەیشت بڵێین: جەنگ دژ بە سەفەوییەکان ئیدی بووبوو بە داخوازییەکی دینی و میللیی پێویست[1].

پاش قایم کردن و داینکردنی بەرەی ناوخۆ، سوڵتان سەلیم بۆ داینکردنی ئاسایشی سنووری دەرەوەی ئیمپراتۆریا ویستی بەرەی ڕۆژئاوا ئارام بێ، بۆ ئەم مەبەستە پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ ڤینیسیا، هەنگاریا و ڕووسیا بەست و بەمە دەورانێکی نوێ لە پەیوەندیی ئاشتیی لەگەڵ ئەورووپا کردەوە، کە ئەمە سەرکەوتنێکی سیاسیی بوو. هەر لە هەمان ستراتیژیەتدا نامەی بۆ عوبەیدوڵڵا خانی ئۆزبەك نووسی باسی ئامانجی خۆی بۆ جوولەکردن بەرەو ڕۆژئاوای ئێران تێدا نووسی و داوای لێ کرد ئەویش پەلاماری خوراسان بدات بۆ ئەوەی تۆڵەی کوژرانی مامی محەممەد شیبانی خانی ئۆزبەك کە بەدەستی شا ئیسماعیلی سەفەوی کوژرا بکاتەوە[2]. بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان لە ساڵی 916 ك/1510 ز شا ئیسماعیلی سەفەوی بۆ تۆقاندنی سوڵتانی عوسمانی لەکەللەسەری حاکمی ئۆزبەکی لایەنگیری عوسمانییەکان، محەممەد شیبانی خان لێوانێکی مەی نۆشی درووست کرد و لەگەڵ ژمارەیەك لە داخوازیی بۆ سوڵتان بایەزیدی عوسمانی ناردووە[3].

---

(1) أبو وردة عبدالوهاب عطية السعدني، الصراع العثماني الصفوي نتائجه السياسية والعسكرية، في مجلة كلية اللغة العربية باسيوط (جامعة الازهر)، مصر، 1993، ص-269.

(2) طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 198

(3) Michael J. McCaffrey;" ČĀLDERĀN ", *Encyclopaedia Iranica,* Vol. IV, Fasc. 6, 1990, pp. 657

وەك سەرچاوە مێژووییەکان دووپاتی دەکەنەوە هۆیەکی دیکە بۆ هەڵگیرسانی جەنگ، داڵدەدانی شا ئیسماعیل بوو بۆ هەڵاتووەکانی بنەماڵەی سوڵتان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی و کاتێکیش سوڵتان سەلیمی یەکەم بەوەی زانی، کە برازایەکی پەنای بۆ شا ئیسماعیلی سەفەوی بردووە بۆ دژایەتیکردنی، دەستی کرد بە خۆئامادەکردن بۆ جەنگ و نامەیەکی بە تەتەرێك بۆ شا ئیسماعیل نارد، کە تێیدا هاتبوو:

"با لای شا ئیسماعیل ڕوون بێت، کە تۆ چەندین جار بۆ باوکی خەڵەفاومان نامەت ناردووە و هەڵتخەڵەتاندووە و ترساندووتە، جارێك سەری شاهی بەگ ، جارێکیش پارچەیەك لە ئاڵای جەنگیزخانتان بۆ ناردووە، لەبەر ئەمە لەسەر تەختمان لادا، من بڕیارم دا تۆڵەی ڕابردوو بکەمەوە، من دەمویست ساڵی پار بەرەو ڕووت بیمەوە، بەڵام کێشەی براکەم هاتە پێشەوە ، کە کوڕەکەی پەنای بۆ تۆ هێنا، بەهەمەحاڵ لەسەرتە قۆڵبەستی بکەیت و زنجیر بکەیتی ملی و بینێریتەوە بۆ مان و هەروەها لەسەرتە دەست لە دیاربەکر هەڵبگریت و لایەنگیرانی خۆتی لێ بکێشیتەوە تا لەنێوان من و تۆ دوژمنکاری و جەنگ کۆتایی پێ بێت، ئەگەر جگە لەوە کاری دیکەت کرد، دەبێ خۆت بۆ جەنگ ئامادە بکەی"[1] .

کاتێك تەتەرەکە گەیشتە ئەسفەهان و نامەکەی دایە دەست شا ئیسماعیل، ئاوا وەڵامی دایەوە:

"نامە بێ ماناکەتم خوێندەوە، کە باسی بێ ئاوەزیی باوکتان و خراپ ئیدارەدانیی دەکەیت، کە سەری شاهی بەگ و پارچەیەك لە ئاڵای جەنگیزخانمان بۆی ناردووە، باوکت دوربین بوو دەیزانی هەرکەس دژایەتیمان

---

[1] شوقی ابوخلیل (د)، تشالدیران، سلیم الاول العثمانی وأسماعیل الصفوي، دار الفكر، دمشق، 2005، ص 55

بکات لەگەڵ زەوی تەختی دەکەین، تۆ مادام هەواوهەوەس ومەغرووری بەسەر ئاوەزتدا زاڵ بووە، ئەوا بە ئیزنی خودا سەری خاکسارت بەهێزی بازووی فاتیحی خەیبەر-ئەمیری موسڵمانان سڵاوی خودای لێ بێت- دەبڕین و بۆ پاتشای پورتوگالی دەنێرین. نووسیوتە ویلایەتی دیاربەکر کە پشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە بیدەینەوە دارودەستەکەت، ئەم ویلایەتە هی باوکت نەبووە، بەڵکو موڵکی عەلائی ئەلدەولەی ذی ئەلقەدر بووە، کە لە کوڕەکانی حەسەنی ئاق قۆینلوو وەریگرتووە و پیاوەکانم بەزەبری شمشێر لە عەلائی ئەلدەولەیان وەرگرتووە، کە باووباپیرانت خەراج و جەزیەیان بۆ دەدا و مافی ئەوەت نییە داوای ویلایەتی حەسەن ئاق قۆیتلو بکەیت. هەرچی پەیوەندی بە سوڵتان مورادەوە هەیە، پەنای هێناوە بۆ دەربار، کە لە پێشوویش و ئێستەیش دەربار هەر پەناگەی هەموو پاتشاکانی جیهانە و ئەو میوانمان بووە و ناکرێ خانەخوێ میوان لە ماڵی خۆی دەربکات، ئەگەر دەتەوێت بێیت بۆ لامان بەیەك دەگەینەوە و ئیدی سەڵاو"[1].

سوڵتان سەلیم لە شاری ئەدیرنە لە 19 ی موحەرەمی 920 ی کۆچی/16ی ئاداری 1514 هەموو پیاوانی سەربازی و زانا و وەزیرەکانی کۆکردەوە و پێیوتن، کە شا ئیسماعیل بۆتە مەترسی بۆسەر دەوڵەتی عوسمانی و دەستدرێژی کردۆتە سەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی و لەم کۆبوونەوەیدا سی جار وتویە: جەنگ، جەنگ و جەنگ بەبێ ئەوەی کەسێك بێ جورئەتەت بکات قسەیەك بکات. سوڵتان هیچ ئاستەنگییەکی نەبینی لە ڕازیکردنی ئامادەبووان بۆ جەنگی سەفەوی. دوای سی ڕۆژ بەخۆیی و سوپایەکی گەورەوە لە ئەدیرنەوە چووەوە بۆ ئیستەنبووڵ و دوای دە ڕۆژ گەیشتۆتەوە ئیستەنبووڵ و

---

[1] شوقی ابوخلیل (د)، نفس المصدر، صص 55-56

کاروباری شارەکەی داوەتە دەست کوڕەکەی و خۆشی بۆ ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات بەرێکەوت[1].

وەختایەك سوڵتان گەیشتە ئیزمید* نامەیەکی هەڕەشەئامێزی بۆ شا ئیسماعیلی یەکەم نارد (27 ی سەفەر/23 ی نیسان) و نامەشی بۆ محەممەد بەگی کوری فەرووخ شای حاکمی ناوچەی کوردستان نووسی، کە لە پاشماوەی ئاق قۆینلوو بوو و هانی دا بەشداری لە هەڵمەتەکەدا بکات دژ بە شا ئیسماعیل[2]. کاتێکیش لە کۆتایی جومادی یەکەمی 920 ی کۆچی/ کۆتایی تەمووزی 1514 گەیشتە ئەرزەنجان، نامەی سێیەمی بۆ شا نووسی و پێی ڕاگەیاند کە چل هەزار کەسی لە پیاوەکانی لەنێوان قەیسەرییە و سیواس بەجێهێشتووە، بۆ ئەوەی ئیسماعیل لەبەرانبەر هێزی عوسمانی نەتۆقێ و لەگەڵ نامەکە دیارییەکی گاڵتەجاڕیی بۆ ناردبوو، کە بریتیبوو لە پەڕۆشڕەیەك و گۆچانێك و ئامێری ددان پاککردنەوە و تەزبیحێك و دەفرێك بۆ سواڵکردن، وەک ئاماژەدان بەوەی کە شا ئیسماعیل شایانی حوکمڕانی نییە و ئەو ئەهلی گەڕانەوەیە بۆ سەر ڕشتەی باوباپیرانی لە تەسەوف و دەروێشایەتی[3]. بە قسەی

---

[1] Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843, p. 176

* ئیزمید Izmid: (نیکۆمیدیا Necomedia) شارێکە لە تورکیای ئاسیەوی (ئەنادۆڵ) لە قووڵایی کەنداوێك بە هەمان ناو لەسەر زەریای مەرمەرەوە. ناوەندی لیوای (قۆجە ئیلی)یە لە ویلایەتی خوداوەندگار، بڕوانە: س. موستراس، المعجم الجغرافي للامبراطورية العثمانية، ترجمة وتعليق: عصام محمد الشحادات، دار ابن حزم، بيروت، 2000، ص 50

[2] محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص 77

[3] علي إبراهيم درويش، السياسة والدين في مرحلة تأسيس الدولة الصفوية 1501-1576، المركز العربي للأبحاث ودراسة السياسات، بيروت، 2013، صص 126-127

مێژوونووسی عوسمانی سەعدەدین ئەم کارە لەبەر کەمی ئازووقە بووە و سوڵتان بەخۆیی و سوپا دوو سەد هەزارییەکەی لە ڕۆژی 24 ی تەمووز گەیشتە ئەرزەنجان و لێرە سوپا لە ئەرزەنجان وەستا و لە چاوەڕوانی هاتنی ئازووقە بوو لەڕێگەی زەریاوە. لێرەدا بوو، کە بەگلەربەگی قەرەمان، هەمام پاشا، لە بریتی ژمارەیەك ئەفسەر لە سوڵتان نزیك بۆوە و ویستی سوڵتان ڕازی بکات بۆ گەڕانەوە بۆ ئیستەنبوڵ بەهۆی ئەو ئاستانگانەی کە بەرەڕووی لەشکرکێشییەکە دەبنەوە، سوڵتان هەر دەمودەست سەری بڕی و هێرشەکە بەردەوام بوو بەڵام بەرەوپێشەوەچوونەکە سەخت دەبوو[1]. لە 5 ی ئاگستۆس کاروانی لەشکرکێشییەکە گەیشتە ئەرزەرۆم. بەڵام پێشتر محەمەد ئوستالجو، یەکێک لە گەورەترین سەرکردەکانی شا، بۆ بەرگیری لە لەشکرکێشی عوسمانی لە ئەرزەنجانەوە تا تەبرێز هەرچی بەرووبووم هەبوو لەگەڵ کشانەوەی خۆی لەناوی برد بوو و هەموو ئەو ماڵانەش، کە لەسەر ڕێگەدا بوون سووتاندبووی[2].

شا ئیسماعیل لەڕێگەی هەمەدان بوو دەچوو بۆ سنە کاتێك هەواڵی لەشکرکێشیی سوڵتان سەلیم یان پێ دا بۆسەر ئێران. هەر دەمودەست بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ هەمەدان و سەرۆکهۆزەکانی لە هێرشی سوڵتانی عوسمانی ئاگادارکردەوە و فەرمانی دا خۆیان بۆ پێشگیری لە سوپاکەی سوڵتان ئامادە بکەن و دواتر خۆی بەرەو تەبرێز ڕۆیشت[3].

کاتێك شا ئیسماعیل گەیشتە تەبرێز، نامەی بۆ هەموو شارەکان نووسی بۆ داواکردنی سوپا و پەیوەندی پێوەکردنی، بەڵام جاسووسەکانی هەواڵیان پێ دا

---

[1] Michael J. McCaffrey;" ČĀLDERĀN ", *Encyclopaedia Iranica,* Vol. IV, Fasc. 6, 1990, pp. 657

[2] یلماز اوزتونا، تاریخ الدولة العثمانیة، ترجمه: عدنان محمد سلمان، ج 1، منشورات مؤسسة فیصل للتمویل، ترکیا، اسطنبول، 1988، ص 215

[3] هاشم حجازی فر، همانجا، ص 91.

که سوڵتان سەلیم گەیشتە ئەرزەرۆم، بڕێك لە سەردارەکان ئامۆژگارییان کرد چاوەڕان بێ تا هەموو سوپاکە دەگەن، بەڵام شا ئیسماعیل تەبرێزی بەجێهێشت و بەرەو پێدەشتی چاڵدێران ڕۆیشت و لە یەکی مانگی ڕەجەبی ساڵی 920 ی کۆچی (22 ی ئاگستۆسی 1514 بەخۆیی و سوپاکەی دابەزین و گوتی: (چاوپێکەوتنی ئێمە لەگەڵ قەیسەر ئەلێرەیە)، قەیسەر واتە سوڵتان سەلیم ، کە وەك سووك کردن وای پێ دەوت[1].

سوڵتان سەلیم بە خۆیی و لەشکرێکی دوو سەد هەزار کەسییەوە کە خۆی سەرکردایەتیی دەکرد بەرەو ئێران هەڵکشا، لەم هێرشەدا بەزۆری میر و سەرۆکە کوردەکان بەهێزی چەکداری خۆیانەوە هاوبەشیان کرد[2]. سوڵتانی عوسمانی بەناو خاکی کوردستانەوە هێرشی برد بۆ سەر ئازەربایجان و لەشەوی سێشەممە 22 ی ئابی 1514 گەیشتنە پێدەشتی چاڵدیران و لەو شەوەدا هەردوو سوپا نێوانیان تەنیا یەک فەرسەخ[3] بوو و وەک سەرچاوە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن ، کە ئەو شەوە پێش ڕووداني جەنگەکە، کاتێك هێشتا سوپای عوسمانی لە بەرزاییەکانی ڕۆژئاواوە بەرەو پێدەشتی چاڵدیران شۆردەبوونەوە، فەرمانداریی سوپای ئێران محەممەد خان ئوستالجو، نور عەلی خەلیفە ڕۆملو و ژمارەیەکی تری سەرکردەکانی سوپا، ئەوانەی ئاگەداری پلانی عوسمانییەکان بوون پێشنیازیان بۆ شا ئیسماعیل کرد، پێش ئەوەی هێزەکانی عوسمانی لە پێدەشتی چاڵدیران تۆپخانە و هێزەکانی خۆیان دابمەزرێنێت، هێرشی کتوپڕیان بکرێتە سەر و بواریان نەدەن سوود لە تۆپخانەکانیان وەربگرن، بەڵام

---

[1] موسى بن محمد آل هجاد الزهراي (الدكتور) ، المصدر السابق، ص 47

[2] د. شەمسی موحەمەد ئیسکەندەر، هەمان سەرچاوە، لا: 93

[3] فەرسەخ: یەکەیەکی پێوانە کردنی دوورییە بەرانبەر بە سێ میل دەوەستێت.

دورمیش خانی سەرۆکی هۆزی شاملو پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە و شەهریاریش پشتگیری کرد و کارەکەیان بە پێچەوانەی جوامێریی و پیاوەتی زانیوە[1].
لە سپێدەی ڕۆژی چوارشەممە 23ی ئابی 1514دا لە پێدەشتی چاڵدیران[2] لە باکووری ڕۆژهەڵاتی گۆلی وان هەردوو سوپا بەڕەوڕووی یەک بوونەوە. وەختایەک جەنگ دەستی پێ کرد سەفەوییەکان فشاریان بۆ عوسمانییەکان هێنا و لە بڕێک جێگەشدا ناچاریان کردن پاشەکشە بکەن و شا ئیسماعیل توانی قۆڵی چەپی سوپای عوسمانی، کە بریتیبوون لە عەسکەری ڕۆمیلی تێکبشکێنێ. لەوکاتە سەدری ئەعزەم داوای لە سوڵتان کرد تۆپهاوێژەکان بەکاربهێنێ، سوڵتان وەڵامی دایەوە: من سوێندم خواردووە تۆپ بەکارنەهێنم[3]، سەدری ئەعزەم گوتی: تۆ سوێندت خواردووە بەڵام من سوێندم نەخواردووە. پاشان فەرمانی دا تۆپخانەکان بخەنەکار، دەڵێن لە یەکەم تەکاندا ئاگری تۆپەکانی عوسمانی بیست هەزاریان لە سوپای عوسمانی و حەوت هەزاریان لە سوپای سەفەوی کوشتووە، چونکە هەردوو سوپا ئاوها بە شمشێر و ڕم کەوتبوونە ناویەک[4]. تۆپخانەی عوسمانی، لە جیهان یەکەم بوو و ئەو چەکە لە

---

[1] هاشم حجازی فر، همان مآخذ، ص 98.
[2] چالدێران سەر بە قەرەعەین (یاوەکو سیە چەشمە)یە. شێوە سروشتییەکەی لاکێشەییە و لێژاییەکە و ئاوەڕۆکەی لە شیمالی غەربییەوە و بەرەو لای جنووبی شەرقییە دەڕوات و ڕووباری قەرە اینە (قەرە عین-سیە چەشمەی ئێستا) لە یەک لایدا بەرەو لای شیمال دەروات و لەوێوە دەرژێتە ناو ڕووباری ماکۆ و ڕووباری زێوەش لە شیمالەوە بۆ جنوب بە ئاق چاق دەگات. شوێنی شەڕەکە لە سەرووی (سیەچەشمەی ئێستاکە، لەنێوان ئاوایی گول ئوشاقە و سەعدول )دا ڕوویداوە، بڕوانە: هاشم حجازی فر، همانجا، ص 95.
[3] شوقی ابوخلیل (د)، نفس المصدر، ص 61
[4] سەرچاوە سەفەوییەکان دەڵێن شا ئیسماعیل بەر لە دەستپێکردنی شەڕەکە داوای لە سوڵتان سەلیم کردووە تۆپ لە جەنگەکە بەکارنەهێنن چونکە ئەوان ئەو چەکەیان

ئێران نەناسراو بوو و دواتر شا ئیسماعیل زۆر هەوڵی دا بۆ جەنگەکانی بەردەستی بکەوێ، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو[1].

دوای دوو ڕۆژ جەنگی بێ وێنە و دوای ئەوەی سوپای شا ئیسماعیل قوربانییەکی زۆریان دا و بەرگرییەکی بێ ئەندازە ئازایانەیان کرد. سوپاکەی شا ئیسماعیل شەڕی مان و نەمانیان دەکرد، شەڕی یان سەرکەوتن یان شەهید بوون و تا زیندووبوون هەر شەڕیان کردووە. ترسی مردن لە فەرهەنگی سەربازە ئێرانییەکاندا نەبووە، بە جەسووری و سەرڕۆییانە بە دروشمی (الله الله علی علی) پەلاماری سوپای دوژمنیان دەدا و گیانی خۆیان دەکردە قوربانی ئامانجەکانیان. مێژوونووسێکی ڕۆژهەڵاتیی لەمبارەیەوە دەنووسێ " ئێرانییەکان بەجۆرێك شەڕیان دەکرد و بەرگەیان دەگرت لەوانەبوو مووی سەری منداڵ لە ترسان سپی ببێ[2]. شەڕەکە تا دوواین ڕادە دژوار بووە تا ئەو ڕادەیەی کە مێژوونووسە تورکەکان بە ڕۆژی قیامەت یان ڕۆژی کۆتایی ناویان بردووە[3].

لەگەڵ هەموو ئەو جەسوورییەی کە سوپای سەفەوی تۆماریان کرد، بەڵام لە ئێوارەی دووەم ڕۆژدا بە ناچاری کشانەوە و شا ئیسماعیل خۆشی بە بریندارکراوی لە گۆڕەپانی جەنگ کشاوەتەوە و شاری تەورێز داگیرکراوە بەقسەی مێژوونووس ڤۆن هاممەر سوڵتان سەلیم لەو (10) ڕۆژەی، کە لە تەبرێز ماوەتەوە و بەلایەوە گرینگ بووە بەری هەموو شتێک بچنێتەوە. هەموو

---

نەهێناوە بۆ جەنگ و دەڵێن سوڵتان سەلیم پەیمانی داوە تۆپەکان لە جەنگەکەدا بەکارنەهێنێت، بڕوانە: شوقی ابوخلیل (د)، نفس المصدر، صص 59-60

(1) Jean-Paul Roux, p. 395.

(2) هاشم حجازی فر، همانجا، ص 124

(3) ایناس سعدی عبدالله (د)، تاریخ العراق الحدیث 1258-1918، دار عدنان، بغداد، 2014، ص 200.

زێروزەبەری شا، قوماشی گرانبەها، چەکی ڕازاوە بەزێر و بەردی گرانبەها، فیلەکانی، هەروەها خەزینەکانی شا ئیسماعیلی لەگەڵ خۆی برد و بە تالانکراوی گەیاندویانە بۆ ئیستەنبووڵ [1]. جگە لەوە سوڵتان سەلیم دوای ئەوەی لە تەبریز لەسەر کورسی شاهنشاهی شا ئیسماعیل دانیشت، ناسناوێکی دیکەشی بۆ خۆی زیاد کرد ئەویش (سوڵتان شا سەلیم) بوو [2].

ئەو چەکە ئاگرینەی کە عوسمانییەکان بەکاریان هێنا-بەتایبەت تۆپهاوێژەکان- بەتەنیا چارەنووسی جەنگەکەیان بەقازانجی عوسمانییەکان یەکلا نەکردەوە بەڵکو پەیوەندی پێوکردنی میرە کوردە سونییەکان بۆ ڕیزی سوپای عوسمانی ئەویش بۆ خۆی یەکێک لەو هۆکارە یەکلاکەرەوانەبوون بۆ سەرکەوتنی سوڵتان سەلیمی یەکەم لەم شەڕەدا [3]. شانزە میر لە میرەکانی کورد پەیوەندیان بە سوڵتان سەلیمەوە کرد لە جەنگی چالدێران، لەوانە شەرەف بەگی میری بدلیس، کە دایە پاڵ سوڵتانی عوسمانی بەوهیوایەی ئەمارەتەکەی لە بندەست ئێرانییەکان وەربگرێتەوە و لەگەڵیدا بیست لە میر و حاکمە دیارەکانی کوردستان بەرفەرمانیی و ملکەچیی خۆیان بۆ سوڵتان ڕاگەیاند [4].

دیارە دەبێ ئەوەش بگوترێت، کە هۆکارێکی دیکەی سەرکەوتنی عوسمانییەکان لەم شەڕەدا جگە لە تۆکمەیی سوپای عوسمانی و

[1] Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843, p.204 ، محمود شاكر، التاريخ الاسلامي (العهد العثماني)، ج 8، ط 4، بيروت، 2000، ص 99

[2] علي شاكر علي (أ.د)، ولاية الموصل العثمانية، المصدر السابق، ص 51

[3] د.احمد محمود الخليل، المصدر السابق، ص 225.

[4] كاميران عبدالصمد الدوسكي، كردستان فى العهد العثمانى، الدار العربية للموسوعات، بيروت، 2006، صص 15-16

چەکداربوونیان بە چەکوتفاق و تۆپهاوێژی ئاگرین ئەو ژمارە نابەرابەر و زۆرەی لەشکرەیلی عوسمانی بوو[1]، کە (دە) جار زیاتربوون لە لەشکری شا ئیسماعیل، کەچی وێڕای شکستی سوپاکەی بەڵام لەماوەی دووڕۆژی شەڕوجەنگدا بەرگرییەکی بێوێنەیان کرد و دوای ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی دووەمی شەڕەکە، شا ئیسماعیل دوای ئەوەی بیست و سێ هەزار و پێنجسەد 23.500 کوژراویان دا و بەبێ ئەوەی هیچ دیلێکیان لای عوسمانییەکان هەبێ بە 1900 دیلی عوسمانییەوە[2] لە مەیدانی شەڕەکە کشانە دواوە. هەرچی مێژوونووسی دیکە لایان وایە کاتێك شا ئیسماعیل لە گۆڕەپانی جەنگ کشایەوە زۆر لە سەرکردەکانی بەدیل گیران و تەنانەت بە قسەی مێژوونووسی فەرەنسی ژان-پۆل ڕۆ، سوڵتان سەلیم "هەموو دیلە ئێرانییەکانی جەنگەکەی کووشتن"[3]. هەروەها بەگوێرەی بڕێک سەرچاوە تەنانەت شا ئیسماعیل یەکێك لە ژنەکانیشی بەدیل گیرا و سوڵتان ڕەتیکردەوە بیداتەوە و لە یەکێك لە میرزاکانی خۆی مارەی

---

(1) سەرچاوە مێژووییەکان، چ عوسمانییەکان و چ ئێرانییەکان و چ ئاوروپاییەکانیش لەبارەی مەزەندەکردنی ژمارەی لەشکری هەردوولا ژمارەی جیاواز بەدەستەوە دەدەن. بەڵام زۆرینەیان بۆ ژمارەی لەشکری عوسمانی ژمارەی سەدوبیست هەزار تا سێسەد هەزار (120.000 تا 300.000 کەس بەدەستەوە دەدەن، بەڵام زۆرینەیان لەسەر ژمارەی دووسەد هەزار (200.000) کەس کۆکن. بۆ ژمارەی لەشکری شا ئیسماعیل-یش ژمارەی پانزە هەزار تا سی هەزار (15.000 تا30.000 ) بەدەستەوە دەدەن، بەڵام زۆرینەیان لەسەر بیست هەزار (20.000) کۆکن. بڕوانە: هاشم حجازی فر، همان مآخذ، ص 101.، هەرچی (ماك کافێرتی) یە ژمارەی سوپای عوسمانی بە (140) هەزار جەنگاوەر و سوپای سەفەوی بە (40) هەزار جەنگاوەر دەژمێرێت، بڕوانە: (McCaffrey ، ل: 657).

(2) سەرچاوە عوسمانییەکان هیچیان باسی ئەو ژمارە زۆرەی دیلەکانی عوسمانی ناکەن لای سەفەوییەکان.

3 سیو 395

کردووه[1]. دەڵێن گوایە دوای کشانەوەی شا ئیسماعیل لە بەرەکانی جەنگ، ژمارەیەك سەرکردەی لەشکری عوسمانی ویستیان دوای هێزەکانی شا ئیسماعیل بکەون، بەڵام سوڵتان سەلیم نەیهێشتووە، چونکە گومانی لەوەدا هەبوو، کە ئەمە داوێك بێ بۆیە ڕازی نەبوو بکەونە شوێن قزڵباشەکان[2].

دوای تەواوبوونی جەنگ و دەستبەسەرداگرتنی ئۆردووی شا ئیسماعیل هەموو ئەو دیلانەی کە بەردەستکەوتن بە فەرمانی سوڵتان سەلیم سەریان بڕین. مێژوونووس هاممەر باسی ڕۆستەم خان ناوێکی کورد دەکات، کە لەبەردەم سوڵتان سەلیم داوای ملکەچبوونی کرد، بەڵام سوڵتان لەگەڵ کوڕەکەی و پەنجا لە پیاوەکانی دارودەستەکەی سەری بڕین. هەروەها سەرۆکێکی دیکەی کورد بەناوی خەڵات Khalet ، کە پێی وابووە دەتوانی بە خیانەت ژیانی خۆی ڕزگار بکات بە شمشیر سەریان بڕی. سوڵتان و سوپاکەی ڕۆژێك پشوویان داوە و ڕۆژی دواتر بەرەو تەبرێز بەڕێکەوتن و هاممەر باسی ئەوە دەکات، کە مێژوونووسی کورد ئیدریس بتلیسی (1452-1520ز) لەگەڵ سوڵتان بووە و دوای سیانزە ڕۆژ گەیشتوونەتە تەبرێز[3]. هاممەر لای وایە، کە سوڵتان لە ڕۆژی 5 ی ئەیلوول گەیشتووەتە تەبرێز و بۆ ڕۆژی دوایی (16ی ڕەجەبی 920 ك-6 ئەیلوولی 1514 ز)[4] سوڵتان سەلیم چۆتە مزگەوتی گەورەی سوڵتان یەعقووب

---

[1] محمد فريد، تاريخ الدولة العلية، منشورات مؤسسه هنداوى للتعليم والثقافه،القاهره، 2014، ص 103

[2] هاشم حجازى فر، همانجا، ص 130.

[3] Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843, p 200-201

[4] ڕۆژی 16ی ڕەجەبی 920ی کۆچی ڕێکەوتی چوارشەممە دەکات نەك هەینی، بۆیە دەبێت سوڵتان ڕۆژی پێنجشەممە 17ی ڕەجەب/ 7 ی ئەیلوول گەیشتبێتە تەبرێز.

بۆ ئەوەی بەشداری نوێژی هەینی بکات، بینیویە، کە چەند بەشێکی مزگەوتەکە تێکچووە و فەرمانی داوە چاکی بکەنەوە. دواتر لە 20 ی رەجەب-15ی ئەیلوول بەرێگەی قەرەباغ گەڕایەوە هەوارگەی زستانەی خۆی لە پێدەشتە بە پیتەکانی ئەم هەرێمەی ئازەربایجان[1]. لە گەڕانەوەیدا سوڵتان سەلیم لە تەبریز بڕیار دەدات لەگەڵ خۆی نزیکەی هەزار هونەرمەند و شاعیر لە تەبرێزەوە بگوازێتەوە بۆ ئیستەنبوڵ و هەموویان لەسەرای هومایۆنی کاری پێدان[2].

وێرای ئەوەی کە سوپای عوسمانی لە جەنگی چاڵدێراندا[3] شکستێکی گورچکبڕی بە شا ئیسماعیلی سەفەوی گەیاند و سوڵتان سەلیم تەبرێزی داگیرکرد. کاتێک سوڵتان" تەبرێز"ی پایتەختی سەفەوی داگیرکرد و ئیسماعیل کشایەوە، سوپای عوسمانی لە شەش ڕۆژ زیاتر لەوێدا نەمایە و بەم جۆرە عوسمانییەکان کشانەوە چونکە یەکەمینایەتی ئیستراتیجیان بۆ بەرەوڕووبوونەوەی بەرەی ئەورووپای ڕۆژئاوایی و بەرەی باشووریی بوو لە شام و لە میسر[4]. سوڵتان لە (5 ی ئەیلوول)[5] وەك فاتیحەکان چووەتە ناو تەبرێز .

---

[1] Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843, p 202-203

[2] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، المصدر السابق، ص 218

[3] بۆ زانینی ڕوانگەی مێژوونووسانی عوسمانی لەبارەی جەنگی چالدێران بروانە: احمد فريدون بك، منشآت السلاطين، استانبول، 1274، ج (1)، صص 386-389، حيدر جلبى، "رۆزنامه"، صص:369-402، خوجه سعدالدين افندى، تاج التواريخ، ج 4، ص 195 و دواتر، بگەڕێوە: فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، المصدر السابق ص 245 .

[4] وجيه كوثراني، المصدر السابق، ص 77

[5] سەرچاوەکان لەبارەی ڕۆژی گەیشتنی سوڵتان بۆ ناو شاری تەبرێز و مانەوەی ڕۆژ و کاتی جیاواز دەنووسن.

بەگوێرەی گێڕانەوە مێژووییەکان خەڵکی شاری تەبرێز بۆ پێشوازیی لە سوڵتان بە کۆمەڵێك مەلا و پیاوی گەورە چوونەتە پێشوازی سوڵتان و فەرشیان بە مافوور بۆ ڕاخستووە و دیاریی و شتگەلی نایابی گرانبەهایان پێشکەش کردووە، وەختایەك سوڵتان چووەتە ناو مزگەوتی تەبرێز، خوتبەی بەناو خوێندراوەتەوە و کاتێکیش خەتیبەکە ناوی هەر چوار ئەسحابەی یەکەمی هێناوە، ئامادەبوان داویانەتە پرمەی گریان[1].

دوای هەشت ڕۆژ پشوو دان، عوسمانییەکان بەشوێن شوێنپێی شا ئیسماعیل کەوتن و تا سەر ڕووباری ڕەس لە ئازەربایجان ڕۆیشتن و لەم نوختە خاڵەوە ئیدی سوپای ئینکشاری بە بیانووی هاتنی سەرماوسۆڵە و کەمبوونەوەی ئازووقە وەستان، و قازی عەسکەری ئینکشاری جەعفەر چەلەبی یەکەم دنەدەری ئەو ڕاوەستانە بوو، تا وای لێهات سوڵتان ناچار بوو تەبرێز بەجێبهێڵێت و لەژێر گوشاری سەربازە ئینکشارییەکانی نەیتوانی بەردەوام بێ لە دەستبەسەرداگرتنی سەرزەمینی سەفەوییەکان و ڕۆژی 25 ی ڕەجەب/15 ی ئەیلولی 1514 گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی[2]. سەرچاوە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن، کە قزڵباشەکان کە شکان لە کشانەوەیاندا ئەوەی لەسەر ڕێگەیان هەبوو لەناویان برد بۆ ئەوەی عوسمانییەکان لە ئەگەری بەرەوپێشوەچوونی زیاتریان هیچیان بۆ دەستبەر نەبێ. عوسمانییەکان کە گیرۆدەبوون بەدەست برسێتی و تینوێتی و ڕەوشی جیۆگرافیایی و ئاوهەوا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر گەیشتنە

---

(1) موسى بن محمد آل هجاد الزهراي (الدكتور) ، المصدر السابق، ص 48

(2) محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص 81.؛ فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي : دراسة تأريخية في الاوضاع الادارية في ضوء المصادر العثمانية حصرا (مطلع العصر العثماني-اواسط القرن التاسع عشر) مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 2007، ص. 246

تەبریز، بەڵام بە مەعنەویاتێکی نزم و سوپا ڕەتیکردەوە لەوە زیاتر بچێتە پێشەوە[1].

دوای ئەوە سوڵتان کشایەوە بۆ ئەماسیە بۆ ئەنادۆڵ و وەرزی زستانی 1515-1514 ی لەوێدا بەسەربرد پاش ئەوەی سەرکردە سوپاییەکانی ڕەتیانکردەوە لە تەبریز لەناو ناوەندێکی دژ بە عوسمانی بمێننەوە و سەرباری ئەوەش کەمی ئازووقە و زەخیرە بۆ سوپای عوسمانی هۆیەکی دیکەبوو بۆ نەمانەوە[2]. بۆیە بۆ ئەوەی بەرەورووی کێشەگەلی لۆجستیکی نەبنەوە سوپای عوسمانی ناچاربوو پێش هاتنەوەی زستان بگەڕێتەوە و تەبریز بەجێبهێڵێت و دوای ئەوە دووبارە شا ئیسماعیل تەبریزی داگیرکردەوە و دەسەڵاتی خۆی بۆ هەرێمە نیزیکەکانی گێڕایەوە[3].

بە کشانەوەی عوسمانییەکان لە تەبریز ململانێی سەفەوی-عوسمانی بە کۆتا نەگەیشت. بەغدا کە پایتەختی خەلافەتی عەبباسی بوو هێشتا هەر لەبندەستی سەفەوییەکاندا بوو و گۆڕی ئەبی حەنیفە، دامەزرێنەری مەزهەبی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانی لێ بوو[4]. ڕاستییەکەی وێرای ئەوەی، کە جەنگی چاڵدیران ئەنجامی زۆر ترسناکی هەبوو بۆسەر سەفەوییەکان بە گشتی و بۆسەر سەرکردایەتیی شا ئیسماعیل بە تایبەتی هەبوو[5]، بەڵام دوژمنکاریی نێوان

---

(1) Jean-Paul Roux, p. 395

(2) فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي : دراسة تاريخية في الأوضاع الادارية في ضوء المصادر العثمانية حصرا (مطلع العصر العثماني-اواسط القرن التاسع عشر) مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 2007، ص. 23

(3) BRUINESSON, M, V.,op. cit, p. 143

(4) وجيه كوثراني، المصدر السابق، ص 77

(5) شکستی چالدێران کاریگەرییەکی زۆر گەورەی دەروونیی کردە سەر شا ئیسماعیل

هەردوو دەوڵەتی کۆتایی پێنەهێنا و عوسمانییەکان نەیانتوانی ماوەیەکی درێژ لە تەبریز بمێننەوە، هەروەها نەیانتوانی بنەماڵەی سەفەوییەکانیش لەناوبەن یان هەتا نفوزیشیان لغاو بکەن. ئەمە واتە جەنگی چاڵدێران تەرازووی هێزی لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا نەگۆڕی گەرچی بۆ بڕێک کات بەقازانجی عوسمانییەکان شکایەوە[1].

لەکڵاوڕۆژنەی خۆکیشانەوەی خێرایان لە تەبریز، وادیار بوو کە عوسمانییەکان ئامانجیان لە لەشکرکێشییەکە لەناوبردنی هێزی تەواوەتی سەفەوی نەبوو ، بەڵکو ئامانجیان دابڕانی سەفەوییەکان بوو لەگەڵ مەمالیك و دوای ئەوەش لەناوبردنی هەر جۆرە هاوکارییەك لەنێوانیان و ئیحتیواکردنی جولانەوەکانی دەوڵەتی سەفەوییە بوو بەبێ ئەوەی ملکەچ بکرێ و هەرێمەکانی داگیربکرێن[2]. لەم دیدگایەوە شایانی گوتنە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە جەنگی چاڵدیران بە هیچ ڕێکەوتنێکی ئاشتی کۆتایی نەهات، بەڵام ئەم جەنگە بوو بە سەرەتای مێژووییەکی خوێناویی لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی هاوسێی بەهێز، کە بەردەوام جەنگ و پێکدادانی سنووریی و

---

بەتایبەت ئەو کە پێشتر لە هیچ جەنگێك شکستی نەهێنابوو و لە هیچ جەنگێکیش کە ئەو بەشدار ببوو تا ئەوکات بریندار نەبووبوو. زیانی لە جەنگی چالدێران تەنیا لەدەستدانی برێك لە سەرزەمینی ئێران نەبوو بەڵکو هەر هیچ نەبێ بەلای کەمییەوە پیرۆزییەکەی کە لە چاوی لایەنگیرەکانییەوە لەشکان نەهاتوو بوو درزی تێکەوت، بۆیە ئیدی شا ئیسماعیل بەرەو گۆشەگیریی و جلی ڕەشپۆشی و مێزەر کردنە سەر ڕۆیشت و خووی بە مەینۆشییەوە گرت و لەوەبەدوا کارێکی نەکرد شایانی ئاماژە پێ کردن بێت. بڕوانە: محمد سهیل طقوش، المصدر السابق، صص85-86

(1) طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص56

(2) علي إبراهيم درويش ، المصدر السابق، ص 129

ئاگربەس و ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەی ئاشتی و پەیماننامە تاوەکو ئیمزاکردنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم (31 ی ئایاری 1847) هەر بەردەوام بوو.

بەڵام پێویستە ئەو ڕاستیيانەش لەبەرچاو بگرین، کە ڕاستە جەنگی چاڵدیران کۆتایی بە ململانێ و جەنگی سەفەوی-عوسمانی نەهێنا، بەڵام ئەوە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ، کە جەنگی چاڵدیران، یان ڕاستتر سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی عوسمانی بەسەر سەفەوییەکاندا، وەرچەرخانێك بوو لەمێژووی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات و باکووری عێراق (کوردستانی عوسمانی) و دوای ئەو جەنگە پێوەستبوونی پێچەوانەی ئەو دەروناوچانە یان ئەو بەشانەی کە مابوونەوە بە دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێ کرد، بەجۆرێك دەرفەت لەبار بوو و ڕێگە لەبەردەم عوسمانییەکان، وێرای بڕێك ئاستەنگ کە وایکرد عوسمانییەکان نەتوانن بەرەو ناوەندی هەرێمەکان و قوڵاکان بڕۆن،کراوە بوو بۆ بەستنەوەیان بە مومتەلەکاتی دەوڵەتی عوسمانی. بەڵکو زیاد لەوەش ڕێگە لەبەردەمیان کراوەبوو بۆ داگیرکردنی هەموو عێراق و ناوچەی خۆرهەڵاتی جەزیرەی عەرەبی[1]. دەکرێ بڵێین دوای جەنگی چاڵدێران دەوڵەتی سەفەوییە بەرەبەرە بەشی زۆرترینی ناوچە کوردییەکانی ڕۆژئاوای لەدەست دا.
یەکێك لە ئامانجە ستراتیژییەکانی عوسمانی لەم جەنگە زیاتر کۆنترۆڵکردنی تەواوەتی ئەنادۆڵ و دابینکردنی سنووری ڕۆژهەڵات بوو لە ئەگەری هەر هەڕەشەیەکی سەفەوی[2]. دوای جەنگی چالدێران، ئاڕاستەی سوپاکەی سوڵتان سەلیم بەرەو میزۆپۆتامیای سەروو، وڵاتی کوردان و سەفەوەییەکان بوو، کە لەوێدا هەرێمی دیاربەکریان دروست کردبوو[3].

---

[1] فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، المصدر السابق، 246

[2] عباس حسن الموسوى (كمال السيد)، المصدر السابق، ص 44

[3] Jean-Paul Roux, p 397

لەڕووی سەربازییشەوە ئەو جەنگە بوو بەهۆی ئەوەی عوسمانییەکان دەست بەسەر هەرێمگەلێکی گرینگی ستراتیژی دابگرن، کە لە پێشوو موڵکی ئیمپراتۆریای ئاق قۆینلوو بوو و سوڵتان سەلیم توانی دەست بەسەر بەشی ڕۆژهەڵاتی بەرزاییەکانی ئەنادۆڵدا بگرێت، کە دەیڕوانیە سەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و لەڕووی سەربازییەوە بەربەستێکی سرووشتی بوو لەبەرانبەر هێرشی هەر سوپایەك کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بێت و بەم جۆرە عوسمانییەکان تای سەربازی یان لەناوچەکە بەقازانجی خۆیانەوە گۆڕی[1].

نابێ ئەوەش لەبیر بکەین، کە لەڕووی هەژموونی یەکێتی ئیسلامییەوە دەوڵەتی عوسمانی دوای جەنگی چاڵدیران و دوای ئەوە سەرکەوتنی بەسەر مەمالیک و دەستبەسەرداگرتنی میسر و شام و پاشان حیجاز و یەمەن، دەوڵەتی عوسمانی کرد بە خەلیفەی تەواوی موسڵمانان و داکۆکیکاری جیهانیی ئیسلامی. بەمە دەوڵەتی عوسمانی بووە خاوەنی ئامانجگەلێکی ئابووری و ستراتیژی زۆر گرینگ، کە سەرچاوەی داهاتەکەی زیادی کرد و سوودی لەو ئەزموونە تەکنیکییە وەگرت، کە لە میسر و شام و حیجازدا هەبوو و بنکەی سەربازیی نوێی بەردەست کەوت بە تایبەت ئەوانەی سەر کەناری زەریای ناوەراست و زەریای سوور، تا ئەوەی زەریای ناوەڕاست بوو بە دەریاچەیەکی عوسمانی[2]. لە یەکەم نوێژی هەینی دوای داگیرکردنی حەلەب لە (1516/8/29) کە لە مزگەوتی گەورەی حەلەب بەڕێوەچوو، کاتێک خەتیبەکە بەناوی سوڵتان سەلیمی یەکەم وەکو ("حاکمی هەردوو حەرەمی پیرۆز" خوتبەکەی خوێندەوە. دواتر پادشا هاتەناوەوە و وشەی "حاکم"ی پێ گۆڕی بۆ "خادیم". بۆیە ئەو خەلیفانەی کە لە نەوەی عوسمان بوونەوە بەشێوەیەکی

[1] حفيظة مفتي و سعيدة بوقرة، المصدر السابق، ص 32

[2] محمد عبدالطيف هريدي، المصدر السابق، ص 55

ڕەسمیی تا ساڵی 1924 ناسناوی "خادیمی هەردوو حەرەمی پیرۆز"یان هەڵگرتبوو[1].

دوای جەنگی چالدێران، سوڵتان سەلیم زستانی 1514-1515 ی لە ئەماسییە بەسەر برد و لەگەڵ بەهاری 1515 دەبوو سەرکەوتنەکانی تەواو بکات و هێرشەکانی بە ئاراستەی داگیرکردنی سەرزەمینەکانی مەمالیك بوو و بۆ خۆی سەرکردایەتیی لەشکرکیشییەکی گەورەی کرد بۆسەر مەمالیکەکانی بیلادی شام و میسر و جەنگی (مرج دابق) هاوشێوەی جەنگی چالدێران یەکێك لەو سەرکەوتنە گەورەیە بوو، کە ئیدی هەموو بیلادی شام و میسری کەوتە بندەست. لەو ماوەیەدا بیقلی محەممەد پاشا لەلایەن سوڵتانەوە ڕاسپێردرابوو تا سنووری کەوشەنەکانی ڕۆژهەڵات بپارێزێ لەگەڵ "هێزەکوردییەکان" و چاودێریی بزووتنەوەکانی شا ئیسماعیل بکات[2]. دواتر سوڵتان فەرمانی بە بیقلی محەممەد پاشا کرد سەرکردایەتیی لەشکرکێشی بکات بەئاراستەی داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی قەڵا و قوڵە و شارەکانی باشوور-ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، کە تا ئەوکات زۆر قەڵا و شار هێشتا لەبندەستی حوکمڕانی دەوڵەتی سەفەوییە بوون[3]. بەم جۆرە لە هەنگاوی یەکەمدا (1515-1518) شارەکانی دیاربەکر-ماردین-جەزیرە-مووسڵ-شنگاڵ-تەلەعفەر و دواجاریش لە ساڵی 1518 ڕۆژئاوای عێراق و ناوچەی عانە و هیت (ئایاری 1518) داگیرکران، کە لەوێوەوە ئیدی دەوڵەتی عوسمانی لەنزیکەوە هەڕەشەی لە حوکمڕانی دەوڵەتی سەفەوییە دەکرد لە بەغدا.

---

[1] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمه: عدنان محمد سلمان، ص 225

[2] J-L Bacqué-Grammont, Les Ottomans, les Safavides et leurs voisins, op.cit, P.318.

[3] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 202

ئەوە هەر لە سۆنگەی شکستی دەوڵەتی سەفەوی بوو لە جەنگی چاڵدیران، کە بەشی زۆری ناوچەکانی کوردستانیش کەوتنە ناو بازنەی قەڵەمڕۆی دەوڵەتی عوسمانییەوە. سوڵتانی عوسمانی بەڕێوەبردنی ناوچە کوردەوارییەکانی بەرەو ڕووی سەرۆک و میرە کوردەکان خۆیان کردەوە، بەڵام بەمەرجێک ئەوان بە پابەندیی دەوڵەتی عوسمانی بمێننەوە و ساڵانە باج و سەرانە بە حوکوومەتی عوسمانی بدەن و لەکاتی جەنگەکانیشدا پشتیوانیی لە سوپای عوسمانی بکەن[1].

لەساڵی 1515 سوڵتانی عوسمانی لە ئەماسییەوە، مەلا ئیدریسی بدلیسی (ڕووداونووس)، کە هاوکات سەردەستەی ڕاوێژکاران (باش مشاور--Bas Musavir ) ی سوڵتان سەلیمی یەکەم بوو بۆ کاروباری کوردیی، بۆ کوردستان ڕەوانەکرد لەگەڵ دیاری و بەخشیش بۆ سەرۆکهۆز و سەر خێڵە کوردەکان و دەسەلاتی ئەوەی پێدابوو هەر هاوپەیمانییەک، کە ئەو بەچاکی دەزانێ با لەگەڵ میرە کوردەکاندا بیبەستێ[2]. عوسمانییەکان بەچاوی ڕەزامەندییەوە سەیری کوردستانیان دەکرد. متمانەی سوڵتان یاوز بە مەلا ئیدریسی بتلیسی (1452-1520ز) تا ئەو ڕادەیە بوو وەک سەرچاوەکان باسی دەکەن سوڵتان

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەنجامەکانی جەنگەکە بڕوانە: د. سعدی عثمان هروتی، کوردستان والامبراطورية العثمانية دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان 1514-1851، دهوک، 2008، ص 43-44.

[2] المقدم الشيخ عبدالواحد، الأكراد وبلادهم (تاريخ الشعب الكردى منذ أقدم العصور إلى العصر الحاضر)، المكتبة العلمية، ليک لاهور، باكستان، الطبعة الثانية، 1970، ص 118-119.، بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی درێژەی ژیانی ئیدریس بەدلیسی و ڕۆڵی مێژوویی بڕوانە: عبدالفتاح علي بوتاني، (ادريس البدليسي، دوره واثره في التاريخ الكردي)، مجلة كاروان، العدد (24)، اربيل، ايلول 1984.

سەلیم چەندین فەرمانی سوڵتانیی بە سپێتی بۆ ئیمزا کردبوو تا مەلا ئیدریس بە زانیاریی خۆی بەسەر ئەو میر و بەگە کوردانەی پڕبکاتەوە، کە بە پەسندیان دەزانێت. شایانی گوتنە مەلا ئیدریسی بتلیسی وێرای سەروکاریی ئەمارەتی بتلیس، کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو، وەکو والی کوردستانیش وابوو[1].

کاتێك سوڵتان تەبرێزی بەجێهێشت بەرەو ڕۆژئاوا بۆ (ئەنادۆڵ) میرە کوردەکان ئیدریس بتلیسیان ناردە لای سوڵتان بۆ ئەوەی داوایان لێ بکات دان بە مافی پشتاوپشتیان بنێت بەسەر زەوی و زارەکانیان، لەگەڵ داوای ئەوەی یەکێك لە میرەکان وەکو بەگلەربەگ لەناویان دیاری بکات تا بتوانن بەبێ سەرئێشە پێکەوە دژی قزڵباشەکان بوەستنەوە و لە کوردستانیان دەربکەن (پێویستە ئاماژە بەو بکرێ کە پلەی بەگلەربەگی ناسناوێکی سەربازیی و مەدەنی گەورەی عوسمانی بوو لە هەر ویلایەتێك و ئەم وەزیفەیە تەنیا بۆ کوڕانی سوڵتان و جەنەڕاڵە گەورەکان بوو). پاشان سوڵتان لە ئیدریس بتلیسی پرسی داخۆ کامە میری کوردان شایانی ئەوەیە لە هەمووان زیاتر سەرکردایەتیی باڵای گشتیی میرەکانی دیکە بکات، ئیدریسی حەکیم بەم جۆرە ئامۆژگاریی سوڵتانی کرد: " ئەوان هەموویان بەم شێوەیە یا بەشێوەیەکی دیکە وەك یەکن، هیچیان سەر بۆ ئەوی دیکەیان دانانوێنن. لەپێناو ئەوەی خەباتێکی یەکگرتوانە و یەکگرتوو هەبێ دژ بە قزڵباشەکان وا پێویست دەکات دەسەڵاتی کۆردیناتۆریی بدرێتە دەست خزمەتکارێکی دەربار، کە هەموو میرەکان گوێ ڕایەڵی بین". بەم شێوەیە بوو کە: بیقلی محەممەد پاشا لە ڕۆژهەڵات وەك بەگلەربەگی کوردستان مایەوە[2].

---

[1] إبراهيم الداقوقي (د)، أكراد تركيا، دار ئاراس، ط2، أربيل، 2008، ص 6

[2] BRUINESSON, M, V., op. cit, ppm143-144

مەلا ئیدریسی بتلیسی هەموو کۆششی بوو بەگ و میرەیلی کورد بخاتە ژێر قەڵەمڕەوی عوسمانییەوە، سەرەتا توانی میرەیلی بڕێک لە هەرێمەکان ڕازی بکات بۆ ملکەچبوونیان بۆ سوڵتانی عوسمانی. لەسەرەتادا توانی حاکمی سۆران، میر سەیدی کوڕی شا عەلی ڕازی بکات و بیخاتەژێر فەرمانی سوڵتان و هانی دا ئەربیل لە دەستی سەفەوییەکان دەربهێنێ. هەروەها میر سەیفەددینی حاکمی ئامێدی و کوڕەکەی میر سوڵتان حوسێنی هێنایە پاڵ عوسمانییەکان و ئەو دیارییانەی کە سوڵتانی عوسمانی بۆی ناردبوو، بۆی نارد. لە کۆتاییدا مەلا ئیدریس توانی میرەیلی جەزیرەی ئیبن عومەر، حەسەنکێف، سعرد، بتلیس، حیزان ملکەچیی دەوڵەتی عوسمانی بکات[1].

مەلا ئیدریسی بدلیسی سەردەستەی ڕاوێژکارانی کاروباری کوردیی سوڵتان سەلیمی یەکەم بوو، بەگوێرەی ڕێککەوتنێک ناوبراو توانی پاڵپشتیی میر و سەرۆکە کوردەکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دابین بکات بێ ئەوەی ئەو میرە کوردانە دەستبەرداری دەسەڵاتی ڕاستەقینەی خۆیان بن بەسەر میرنشین و هۆزەکانیان. بەگوێرەی فەرمانێکی سوڵتانیی لە سوڵتان سەلیمی یەکەمەوە کە بەوپێیە ددان بە قەوارە کوردییەکان دادەنێ لەگەڵ گەرەنتی سەربەخۆیی بوونی ناوخۆیان. جا بەڕاستی ناوچە کوردییەکان ڕاستەوخۆ ملکەچ نەبوون بۆ سیستمی کارگێریی عوسمانی بەڵکو هەر لەژێر حوکمی سەرۆک و میرە ناوخۆییەکان بوون، کە بە پێبەندیی (وەلا) بە دەوڵەتی عوسمانی بەسترابوونەوە[2]. وا بەدیاردەکەوێ، کە لەژێر ڕووناکی ڕێکەوتننامەی سەلیم-

---

[1] فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، المصدر السابق، ص 247

[2] الدكتور شاكر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الثانية، بيروت، 1989، ص 32،

Creasy, Edward S, History of the Ottoman Turks, London, 1878, New Published, Khayats Beirut 1961, p.447

بتلیسی، نێوان (کۆشکی سوڵتان و میرو بەگە کوردەکان) بە نێوەندگیریی ئیدریسی بتلیسی هەموو هەرێمە و ناوچەکانی ویلایەتی دیاربەکر بە دەزگای ناوەندی بەگلەربەگیی بەسترانەوە و دابەشی سەر نۆزدە (19) سنجاق کرا، کە یانزەیان (11) پێیان دەوتن سنجاقی عوسمانی و هەشت (8) یشیان پێیان دەوتن سەنجاقی سەربەخۆ، کە لە لایەن میرنشینە کوردییەکانەوە بەرێوە دەبردران و ئەم دابەشبوونە دواتر بە قانونامەیەك لە لایەن سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە چەسپێندرا[1]. بەم جۆرە ویلایەتی دیاربەکری زۆرینەی کورد هەر لە دەورانی سوڵتان سەلیمەوە کرا بە دوو جۆرە ولایەت بەقسەی ئۆزتونا وتەنی " ویلایەتەکانی عوسمانی" کە ئەستەنبووڵ میری ویلایەتەکانی دیاری دەکرد و "ویلایەتە کوردییەکان"، کە درابوونە بەگەواتی کورد و بەشێوەیەکی پشتاوپشت و بۆ یەك خێزان بەناوی (یوردلك)، یا (ئوجاقلق)، لەسەر بنەمای ملکەچییان بوو لە حاڵەتی جەنگ بۆ بەگلەربەگی دیاربەکر دانراو لەلایەن ناوەندەوە[2].

دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی ڕەسمیی ناوی (حوکوومەت)*ی بەسەر قەوارە کوردییە گرینگەکاندا بڕی بوو، و ناسناوی (سربست میر میران)** واتە بەگلەربەگەواتی ئازادی بەسەر میرە کوردەکاندا بەخشی بوو. بەڵام خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتننامە مۆرکراوە لەنێوان میرانی کورد و دەوڵەتی عوسمانی گرینگترین بەندەکانی بریتیبوون لە: پاراستنی ئازادی قەوارە میرنشینە کوردییە پشتاوپشتییەکانیان. لەبەرانبەر ئەمەشدا میرو بەگ و سەرکردە کوردەکان

---

(1) Hamit BOZARSLAN, Diyarbakir, In FRANÇOIS GEORGEON, NICOLAS VATIN, GILLES VEINSTEIN Dictionnaire de l'empire Ottoman - XVe-XXe siècle, Paris, 2015, p.365

(2) محمد جمال باروت، الصراع العثماني-الصفوي، ص 122

*Hukumet

**Serbest Miri-Miran

لەسەریان بوو بەهێزی خۆیانەوە بەشداری لە جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی بکەن و ساڵانە برێک پارە وەک نیشانەی پێبەندیی و پاشکۆیایەتییان بۆ دەوڵەتی عوسمانی بدەن و دەبوو دەوڵەتیش دەبوو لەکاتی مەترسی و هەڕەشەی دەرەکیدا پارێزگاری لەم قەوارانە بکات[1]. بەچاوپێداگێڕانێکی گشتیی بۆسەر بەندەکانی ئەم ڕێککەوتنامەیە ئەمانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

ئەلف: ددانپیانانی عوسمانییەکان بە قەوارە کوردییەکان و سەرۆکهۆزەکان لەبەر ئەوەی پێشتر زانیارییان بووە لەسەر سروشتی پێبەندیی لای کورد.

بێ: ئەم ددانپیانانە بەم شێوە بوو بەسۆنگەی یەکێتییەکی فیدرالیی لەنێوان کوردستان و دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگەکانی دژی لایەنەکانی تر لەگەڵ دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی ناوخۆیی بۆ کوردەکان.

جیم: دەوڵەتی عوسمانی سەرچاوەیەکی نوێی بۆ خەزینەی خۆی دابین کرد، تەنیا بە پێبەندیی ڕووکەشانەی کوردەکان، بێ ئەوەی ئەمە ببێتە هۆی لەڕوودامان بۆ کوردەکان[2]. ئەم ڕێکەوتنامەیە یەکەمین هاوپەیمانێتیی نێوان کورد و عوسمانی بوو و یەکەمین هەنگاوی دزەکردنی نفووزی تورکی بوو بۆ ناو چیا و پێدەشتەکانی کوردستان[3]. لەماوەی ساڵەکانی 1515-1516 و لەکاتی ڕاپەرینی کورد و بە پاڵپشت و پشتگیری سوپای موحەمەد بیقلی پاشا، بەشێکی

---

[1] د. سعدی عثمان هروتی، کوردستان والامبراطورية...، ص 65-66، هەروەها : د. سەعدی عوسمان هەروتی، چەند لایەنێکی مێژووی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی...، ل 35-36. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم ڕێکەوتنامەیە بڕوانەی هەردوو سەرچاوەی سەرەوە.

[2] د.عباس اسماعيل صباغ، تاريخ العلاقات العثمانية-الايرانية، الحرب والسلام بين العثمانيين والصفويين، منشورات، دار النفاس، الطبعة الثانية، بيروت، 2011، ص 132

[3] المقدم الشيخ عبدالواحد، الاكراد...... هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص: 119

گەورەی ناوچەکانی کوردستان لە سەفەوییەکان پاککرایەوە و ناوچەکە سەرلەبەری بوو بە ناوچەی نفووزی دەوڵەتی عوسمانی[1]. لە نیسانی 1516 سوپای عوسمانی دیاربەکری داگیرکرد[2] و بیقلی محەمەد پاشا لە جەنگی نزیك قۆچ حەسار[3] (1516/5/4) لە دووری 15 کیلۆمەتر لە خوارووی ڕۆژئاوای ماردین[4] بەرگری سەفەوییەکانی تێکشکاند و بوو بە یەکەم والی ئەیالەتی دیاربەکر لە دەوڵەتی عوسمانی[5]. جەنگی سەرکەوتووی نزیك (قۆچ حەسار) سەرکەوتنیکی گەورە بوو و ڕێگەی بۆ داگیرکردنی زۆر شار و قەڵای دیکە وەك (ئەرغەن، شنگاڵ، تەلەعفەر، جەرمیك، سوورەك، پیرەجەك و ماردین) خۆش کرد[6] و نفووزی عوسمانی بۆ باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان لەگەڵ بەشێکی گەورەی باشووری کوردستان درێژبۆوە. لە سەروبەندی

---

(1) Jean-Louis Bacqué-Grammont: « L'apogée de l'empire (1512-1606) », In Histoire de l'empire ottoman, Paris, Fayard, 1989, p.143.

(2) بەگوێرەی هامر گەمارۆی دیاربەکر لە ساڵێک زیاتری خایاندووە و کوردەکان نزیکەی پانزە هەزار قوربانیان داوە یان بەهۆی پەلاماری بەردەوام دژ بە دوژمن یان بەهۆی نەخۆشییەوە، بڕوانە:

Hammer-Purgstall J, op.cot, p.225

(3) هەندێك سەرچاوە پێیان وایە شەڕەکە لە (قەرەغین دەدە) بووە نەك (قۆچ حەسار)، کە دەکەوێتە نزیك (قۆچ حەسار) لە دووریی 17 کیلۆمەتری باشووری ڕۆژئاوای ماردین، لەنێوان ئۆرفە و نەسیبین، بڕوانە: علي شاكر علي (أ.د)، ولاية الموصل العثمانية، المصدر السابق، ص ص 54

(4) ڕۆژی 1517/4/7 شاری ماردین کەوتە بندەست دەوڵەتی عوسمانی.

(5) يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمه: عدنان محمد سلمان، ص 220

(6) كاميران عبدالصمد الدوسكی، كردستان فی العهد العثمانی، الدار العربية للموسوعات، بيروت، 2006، ص 17

هێرشەکانی سوڵتان سلێمانی قانوونی (1520-1566) چەند ناوچەیەکی دیکە لە کوردستان خرانە پاڵ بازنەی نفووزی عوسمانی، هەروەک دواتر باسیان لێ دەکەین. دەکرێ بڵێین هۆکاری سەرکەوتنی مەلا ئیدریسی بتلیسی لەمبارەیەوە تاسیری جەنگی چاڵدیران بوو، عوسمانییەکان لەو جەنگەدا سەرکەوتوو بوون و هیچ گومانێك لەوەدا نەبوو، کە بەرەو ناوچە کوردییەکانیش دێن و ئەو ناوچانەش بۆخۆیان تووشی لێکترازانی سیاسیی بووبوون، میرەیلی هەرێمە بچووکەکان هیچ بژاردەیەکی دیکەیان نەبوو جگە لە ملکەچبوون بۆ هێزی سەرکەوتوو. سەرباری ئەوەش، مەلا ئیدریس بۆخۆی شارەزاییەکی زۆری لەبارەی ڕەوشی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی ئەو ناوچانە هەبوو و خۆی کوڕی ناوچەکە بوو و خەڵکی (بتلیس) بوو بەدیاریکراوی، لە خزمەتی دەوڵەتی ئاق قۆینلوو دابوو بەرلەوەی سەفەوییەکان داگیری بکەن [1].

بەم شێوەیە دەبینین نفووزی عوسمانی گەیشتە باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان لەگەڵ بەشێکی گەورەی باشووری کوردستان. دواتر لەدرێژەی هێرشەکانی سوڵتان سلێمانی قانوونی (1520-1566) چەندین ناوچەی دیکەی سەرزەمینی کوردستان کەوتنە ناو بازنەی نفووزی عوسمانی هەروەکو دواتر دەچینە سەر باسکردنیان. دەتوانین بڵێین کە کورد بەشدارییەکی چالاکی هەبووە لە هەموو شەڕەکانی سوپای عوسمانیدا، تا ئەو ڕادەیەی کە بەپێی قسەی هێندێ لە مێژوونووسان هەر لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە، کە شەڕی عوسمانی-سەفەوی هەڵگیرساوە شەڕێک نەبووە خوێنی کوردی تێدا نەڕژابێ [2]. سوپای عوسمانی جگە لەشەڕ لەگەڵ فارس و ڕووس، هەر بە کورد شەڕی کوردیشی کردووە و پەلاماری کوردی داوە هەر بۆ نموونە " بەشێکی

---

[1] فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، المصدر السابق، ص 248

[2] د. شەمسی موحەمەد ئیسکەندەر، هەمان سەرچاوە، لا: 90

زۆری ئەو هێرشەی ئەحمەد پاشا کردوویەتیە سەر کوردانی میر عەبدال خانی بدلیس هەر لە کوردەکان خۆیان بوون و تەنانەت ئەولیا چەلەبی باسی ئەوە دەکات کە پاشا نیگەرانیی ئەوەی هەبووە نەوەك کوردەکانی ناو سوپاکەی لێی هەڵبگەڕێنەوە[1] و بۆ ئەم مەبەستە جاسووسی بەسەریان دانابوو، ئەگەر کشانەوە کۆنترۆلیان بکەن. جیمس ڕیدز دەڵێ پێکهاتەی سوپای عوسمانییەکان لەوهێرشەدا زۆربەی کورد بوون و کرابوونە کەوا سووری بەر لەشکری عوسمانی[2] و لە دیمەنێکی کارەستباری نەتەوەیی کورد پەلاماری کوردی دەدا و کوردی دەکوشت و ماڵی کوردی تالآن دەکرد.

ڕەنگە بۆ تێگەیشتن لە بەشداری کورد لە سوپای هەردوو دەوڵەت بە نموونە هێناوە بۆ وردکردنەوەی وێنەکە گرینگ بێ ئەوە بەدیاربخەین، کە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم تەنیا لە دەوڵەتی ئێران و لە دەورانی حوکمڕانیی فەتعەلی شا (1797-1834)، دەوڵەتی قاجار سوپایەکی بەژمارە کەمی هەبووە و تەنیا 35.000 سی وپێنج هەزار سوارە و 10.000 پیادەی هەبووە، کە لەلایەن هۆزەکان دەخرانە بەردەستی شاکانی قاجار[3]. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم ژمارەی سوپای دەوڵەتی قاجار گەیشتە 80.000 هەشتا هەزار تفەنگچی، کە بەشداری کورد لەو سوپایە لە ئۆستانی کوردستانەوە بەتەنیا 15.000 پانزە هەزار تفەنگچی بووە و هەروەها لە سوپای (قشونی سواری) قاجاری، کە سوپایەکی غەیرە نیزامی بوو ژمارەکەی 190.000 سەد و نەوەد هەزار جەنگاوەر بووە، لەو ژمارەیە جەنگاوەرانی کورد لەناو ئەو سوپایە تەنیا لە ئۆستانی کوردستان

---

(1) بوار نورەدین، هەمان سەرچاوە، ل 106

(2) بوار نورەدین، هەمان سەرچاوە، ل 106

(3) Mohammad-Reza Djalili, Thierry Kellner, *Histoire de l'Iran contemporain*, Ed. La Découverte. Paris, 2010 P.8

20.000 بیست هەزار سوارە بووە[1]، کە مەزەندە دەکرێ ژمارەی گشتیی زۆر لەوە زۆرتریش بێ ئەگەر ژمارەی کورد بە وردی لە ئۆستانەکانی خوراسان و ئازەربایجانیش بژمێردرێن.

هەر لەبارەی سوود وەرگرتنی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردەکان لە شەرەکانی لەگەڵ دوژمنە تەقلیدییەکەی دەوڵەتی سەفەوی، جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئەوە وەبیربهێنینەوە، کاتێک سوڵتان سولێمانی قانوونی (1520-1566ز) پەلاماری وڵاتی ئێران و بەغدای دا ساڵی 1534 لەگەڵ خۆیدا برێک میر و سەرۆکهۆزە کوردەکانی لەگەل خۆیدا برد و هۆزەکانیانی بەدرێژایی سنووری هەردوو دەوڵەتی عوسمانی-سەفەوی نیشتەجێ کرد و کوردەکان دەستیان کرد بە دروستکردنی قەڵا و شوورە بۆ پاراستنی سنوور و خاکی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرانبەر شاڵاو و پەلاماری ئێرانی و گورجییەکان، بەم بۆنەیەوە سوڵتان سولێمانی قانوونی شانازی بەکارەکەیەوە کردووە و گووتویە، کە دیوارێکی لە (گۆشت و خوێن) دروست کردووە، کە دوژمن ناتوانی پێیدا بپەڕێتەوە[2]. دەگێڕنەوە وەختایەک سوڵتان سولێمان گەڕایەوە ئیستەنبووڵ دایکی ڕووی دەمی تێکرد و پێی گوت:

"کوڕم واتۆ گەڕایتەوە، بەڵام ئاخۆ لەمەودوا گورج و قزڵباشەکان هێرش ناهێننە سەر مەڵبەندەکانت؟. سوڵتان لەوەڵامدا گوتی: "دایکە دیوارێکی پتەوم لەنێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و دەوڵەتانی گورج و عەجەمدا دروست کرد، دوژمن ئیتر پێی ناکرێ هیچ زیانێکمان پێ بگەیێنێ". دایکی پرسی: "چۆن

---

[1] F. Colombari, Organisation actuelle de l'armée Persane (quelques détails sur l'Etat des frontières turco-persane) in *Le Spectateur militaire*, 15 février 1854, p.669.

[2] ی.أ.فاسیلیفا ( الکتاب الضائع عن تاریخ الکردي)، ترجمه کاروان کاداني، مجلة (گولان العربي)، العدد (58)، اربیل، اذار 2001، ص 95

توانیت لەو مەودا درێژەدا دیوار دروست بکەیت؟. سوڵتان لە وەڵامدا پێی گوت: "دایکە من ئەو دیوارەم لە گۆشت و خوێن دروست کردووە. بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانەم بەرەو ڕووی هۆزە کوردەکان کردۆتەوە... دوژمن ناتوانێ زەفەریان پێ بەرێ و بگاتە ناو دەوڵەتی ئیسلام"[1]. هەروەها لە هۆیەکانی دیکەی نیشتەجێکردنی کوردەکان بەدرێژایی سنووری نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی ئەوەبووە، کە هەموو هۆزە کوردییەکان حەزیان لە جەنگ بووە و بەهەموو حەماسەتێکەوە بەشدارییان تێدا کردووە و ئەوە سەرباری هەبوونی دوژمنکاری و کێشەوشەڕی نێوان خۆیان[2]. شایانی گوتنە وەك سەرچاوە مێژووییەکان دەیگێڕنەوە میر و بەگە کوردەکان هەر تەنیا بەوەندە دەستبەردار نەبوون، کە جاڕی پێبەندیی (ولاء) خۆیان بۆ سوڵتانی عوسمانی ڕابگەیەنن، بەڵکو کۆششیان کرد بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی سەفەوی لەناوچەکە و گۆڕینی بە دەسەڵاتی عوسمانی. بۆ نموونە حاکمی بەختی جەزیرە و مووسڵی لە دەست سەفەوییەکان سەندەوە و دەستیبەسەرداگرت، هەروەها حاکمی سۆران سەیید بەگ، هەولێر و کەرکووکی لەدەست سەفەوییەکان سەندەوە و بەناوی سوڵتانی عوسمانی لە مزگەوتەکان خوتبە دەخوێندرایەوە[3].

بەم چەشنە هەر بەڕاستی کوردستان بوو بە دیوارێک لە خوێن و گۆشت و ناوچەیەکی تامپۆنی بۆ پاراستنی سنووری دەوڵەتی عوسمانی لەبەرامبەر هێرشەکانی دەوڵەتی سەفەویدا. سەرباری هەموو ئەمانە کوردستان هەمیشە شوێنی بەیەکگەیاندنی هێڵەکانی پشتەوە بووە بۆ سوپای عوسمانی بووە.

---

[1] شەرەفنامە، بەرگی یەکەم، چاپی رووسی، پێشەکی لا: 54 (لە د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغدا، 1983، لا: 130 ڕاگوێزراوەتەوە).

[2] ی.أ.فاسیلیفا، المصدر السابق، ص95.

[3] فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، المصدر السابق، ص 247-248

دەوڵەتی عوسمانی سنووری ڕۆژهەڵاتیی خۆی بەوە زامنکرد بەوەی میرنشینە کوردەکانی کرد بە دیوارێک کە تا ڕادەیەک دەیپاراست لە ئەگەری هەر هێرشێک لەلایەن دەوڵەتی سەفەوییەوە[1]. ڕاستییەکەی دەکرێ بڵێین ڕیکەوتنامەی سوڵتان سەلیم و میرە کوردەکان زیاتر ڕێکەوتنێکی هاو مەزهەبیی سوونیی بوو دژ بە هەژموونی شیعەگەریی (سەفەوی) و جگە لە پێدانی ڕۆڵی پاسەوانیکردنی سەرزەمینی عوسمانی و پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتیی میرە و بەگە کوردەکان بۆ کورد هیچ دەستکەوتێکی سیاسیی تێدانەبوو.

دوای نزیکەی نیو سەدە لە ململانێ و جەنگی خوێناوی، بۆ یەکەمجار هەردوو دەوڵەت لە پەیماننامەی ئەماسیەدا 1555، لەسەر چەند خاڵێک پەیماننامەیەکی ئاشتیی کاتییان دروست کرد. بەڵام ئەم پەیماننامەیە نەیتوانی لە 23 ساڵ زیاتر جەنگی خوێناوی نێوان هەردوو دەوڵەت ڕابگرێت. لە باسەکانی دادێ لە پەیماننامەی ئەماسیەوە تا پەیماننامەی سەراو باس دەکەین، بەتایبەت ئەوەندەی پێویستی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە، واتە شوێنی کورد لە پەیماننامە و کێشەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانیدا.

---

(1) د.عباس اسماعيل صباغ، تاريخ العلاقات العثمانية الايرانية، الحرب والسلام بين العثمانيين والصفويين، منشورات، دار النفاس، الطبعة الثانية، بيروت، 2011، ص 134

## 3-2: لە پەیماننامەی ئەماسیەوە
## -1555 تا پەیماننامەی سەراو- 1618

دوای مردنی شا ئیسماعیل (ئایاری 1524). کوڕەکەی تەهماسپ (1576-1524) کە تەمەنی دە ساڵان بوو جێگەی گرتەوە و بۆ ماوەی زیاتر لە نیوە سەدە حوکمڕانی کرد. لەو ماوەیەدا دەوڵەتی سەفەوییە لەژێر هەڕەشەدا بوو و شا تەهماسپ ناچار بوو چەندین جەنگ بەڕێوە ببات. لە نێوان 1524 و 1540 بەرەو ڕووی ئۆزبەکەکان بۆوە، کە لە دوو تێهەڵچوونەوەدا لە 1529 و 1536 ئۆزبەکەکان هێرات یان گرت بێ ئەوەی بتوانن لەناویدا بمێننەوە. لە 1540 تا 1548 شا تەهماسپ لە جۆرجیا جەنگا، پرسی گرینگ بۆ کۆنترۆلکردنی قەوقاز، کە هەم بۆ ئێرانییەکان و هەم بۆ عوسمانییەکان پرسێکی سەرەکی بوو. لەبەرانبەر زۆری سوپای عوسمانی، 200.000 جەنگاوەر و 300 تۆپخانە، شا تەهماسپ تەنیا 7000 جەنگاوەری لەبندەست بوو، بۆیە لەبەرانبەر ڕووبەرووبوونەوەی بەرەوڕوو، شا تەهماسپ تاکتیکی سووتماککردنی زەوی پەیڕەو کرد[1].

---

[1] Francis Richard, Le siècle d'Ispahan, Gallimard, Paris, 2007 pp.22.23

شا تەهماسپی یەکەم کاتێك عەرشی دەوڵەتی سەفەوی گرتە دەست، دەساڵی یەکەمی دەسەڵاتی پڕبوو لە پشێوی و ململانێی نفووز لەنێوان سەرکردە قزڵباشەکان. ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوییە بەکۆتایی نەگەیشتبوو و کەش و هەوایەکی دوژمنکارانە لەنێوانیناندا بوو و عوسمانییەکان هەمیشە سەفەوییەکانیان بەوە تۆمەتبار دەکرد دژ بە دەوڵەتی عوسمانی چالاکی دەنوێنن بەتایبەتی لە ئەنادۆڵ. دوای بیست ساڵ لە داگیرکردنی بەشێکی گرینگی خاکی کوردستان و عێراقی عەجەمی و عەرەبی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، ساڵی 1534، سوڵتان سولێمانی قانوونی (1520-1566 ز) بە سوپا بێشومارەکەیەوە لەشکرکێشی بەرەو کەوشەنی دەوڵەتی سەفەوی دەست پێ کرد و ئەمە بوو بەسۆنگەی ترس و تۆقین لە دەرباری سەفەویدا. هەڵمەتی دووەمی سوڵتانی بۆسەر ناوچەکە، کە سوڵتان سلێمانی قانوونی خۆی سەرکردایەتیی دەکرد و لەمێژووی عوسمانیدا بە (عراقین سفری) واتە هێرش بۆسەر هەردوو عێراقی عەرەبی و عێراقی عەجەمی ناسراوە لە کۆتایی (1534) دەستی پێ کرد[1].

سوڵتانی عوسمانی لە18 رەبیعولئەوەلی 941 ك/ 27 ی سیپتامبەری 1534 گەیشتە تەبرێز و خەڵك بەهەموو شکۆێیەکەوە پێشوازییان لێ کرد. پاشان رووی لە بەغدا کرد و بەرلەوەی سوڵتان بگات بۆ بەغدا، ئیبراهیم پاشای سەدری ئەعزەم و سەر عەسکەریی لەشکری عوسمانی پێش گەیشتنی سوڵتان بە رێ کەوتن بۆ داگیرکردنی بەغدا[2].

سوڵتانی عوسمانی سلێمانی قانوونی لە رۆژی 22 ی جومادی یەکەمی 941 ی کۆچی/30 ی تشرینی دووەمی 1534 چووە ناو بەغدا و تا وەرزی بەهار هەر

---

[1] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، صص 208-209

[2] محمد فريد بك، تاريخ الدولة العلية العثمانية، مؤسسة هنداوي عام ٢٠١٤ ، ص. 125

لەوێدا مایەوە و لەو ماوەیەدا زیارەتی گڵکۆی ئیمام ئەبی حەنیفەی کرد، کە شا ئیسماعیل لەکاتی دەستبەسەرداگرتنی بەغدا گۆڕەکەی دەرهێنابوو، سوڵتان دووبارە بەشکۆوە گڵکۆکەی نووژەنکردەوە هەروەها زیارەتی مەقامی ئیمام مووسا کازم و گلکۆی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کرد و زیارەتی مەشهەدی ئیمام عەلی لە نەجەف و مەشهەدی کوڕەکەی حوسێنی لە کەربەلا کرد و هەروەها بۆ تەبەرڕوک زیارەتی کۆمەڵێک مەقاماتی تری کرد[1]. شایانی ئاماژە پێدانە، کە سوڵتان سولێمانی قانوونی لە لەشکرکێشیەکەیدا بۆسەر بەغدا توانی بەبێ جەنگ و بەسەرکەوتوویی بچێتە ناو شارەکە دوای ئەوەی حاکمە سەفەوییەکەی بەغدا، موحەمەد خان تەکەلوو ڕای کرد، بەم شێوەیە بەبێ هیچ بەرەنگارییەک ویلایەتی بەغدا داگیرکرا. سوڵتان ماوەی چوار مانگ لە بەغدا مایەوە و هەموو کاروبارەکانی ڕێکخست و لە 28 ی ڕەمەزانی 941 ك/2ی نیسانی 1535 بەخۆی و بە سوپاکەیەوە بەرێ کەوتەوە بۆ تەبرێز بەناو وڵاتی کوردان و هەرێمی مەراغە و لەدوای خۆی لە بەغدا سلێمان پاشا، یەکێك لە سەرکردەکانی سوپاکەی کرد بە والی بەغدا و بەخۆیی و هەزار سەرباز بۆ پارێزگاری کردنی شاری بەغدا مانەوە. سوڵتان بەخۆشی ڕۆژی 4 ی موحەڕەمی 5/942 ی تەمموزی 1535 گەیشتەوە تەبرێز و پانزە ڕۆژ لە تەبرێز مایەوە بۆ دامەزراندنی والی ئەو شارانەی تازە داگیری کردبوون و بۆ ڕێکخستنی کاروباریان. دوای ئەوە سوڵتان گەڕایەوە بۆ ئیستەنبووڵ و ڕۆژی 14 ی ڕەجەبی 8/942 ی کانوونی دووەمی 1536 گەیشتەوە ئیستەنبووڵ[2]. شایانی گوتنە کە دەوڵەتی عوسمانی لە دەورانی سوڵتان سلێمانی قانوونی (1520-1566) لەوپەڕی بەهێزیی خۆیدا بوو و لەو ماوەیەدا دەوڵەتی

---

[1] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، صص58-59

[2] محمد فريد بك، تاريخ الدولة العلية العثمانية، مؤسسة هنداوي ، ٢٠١٤ ، ص. 125

عوسمانی چوار جاران هێرشی بردە سەر ئازەربایجان لە ساڵەکانی 1533-1534 و 1534-1535 و 1548 و 1553 و هەر لەماوەی ئەم هێرشانەش بوو عوسمانییەکان توانیان لە ساڵی 1534 بەغدا داگیربکەن و زیاد لە چەند جارێکیش پایتەختی دەوڵەتی سەفەوییە داگیر بکەن. بۆیە شا تەهماسپ بڕیاریدا پایتەختەختی دەوڵەتی سەفەوییە لە تەبرێزەوە بگوێزێتەوە بۆ قەزوین (1548-1549)[1]. بەڵام ئێران وەك کارەسات سەیری داگیرکردنی بەغدای دەکرد و پێی وابوو مێزۆپۆتامیا بەشێکە لە خاکەی و شارە پیرۆزەکانی کەربەلا و نەجەفی لە دەست داوە[2].

دوای یەکەم داگیرکردنی عوسمانی بۆ ویلایەتی بەغدا (1534ز) لەوکاتەدا شێخی عەرەبان ڕاشد ئەلمەغامس-شێخی هۆزەکانی مەنتەفیک-، کە ئەوکات حوکمڕانی بەسرەی دەکرد، ملکەچیی خۆی بۆ سوڵتانی عوسمانی ڕاگەیاند و بەم شێوەیە (بەسرە)ش بە ئاشتی بوو بە بەشێک لە مومتەلەکاتی دەوڵەتی عوسمانی و شێخ ڕاشد وەکو حاکمی بەسرە مایەوە، بەڵام دەبوو لە نوێژی خوتبە و پارەدا ناوی سوڵتان ببات، بەڵام دواتر ساڵی 1546 بەسرە ڕاستەوخۆ لەلایەن سوپای عوسمانییەوە داگیرکرا[3]. بەم جۆرە لەنێوان زنجیرەك لە هێرش و لەشکرکێشی 1534 (940-41 ك) و( 1546/952-53 ك)، عێراق بە پایتەختی کۆنی عەبباسییەکانیشەوە، مینای بەسرە، لە کۆتاییدا بوون بە هەرێمێکی عوسمانی[4].

---

(1) إبراهيم خليل أحمد (د)، و خليل علي مراد (د)، المصدر السابق، صص25-26

(2) Jean-Paul Roux, pp. 99-398

(3) علاء نورس، المصدر السابق، ص 23-24.

(4) ثريا فاروقي، الدولة العثمانية والعالم المحيط بها، دار المدار الاسلامي، 2008، ص 87

بەشێوەیەکی گشتی لەدوای داگیرکردنەوەی بەغدا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە تاوەکو ساڵی1548 هەردوولا مەبەستیان بوو و ویستیان ڕەوشی هەنووکەیی نێوانیان بپارێزن و نە شەڕ و نە ئاشتی وەکو خۆی بهێڵنەوە. ڕاستییەکەی شەڕی عوسمانییەکان لەگەڵ ئەوروپاییەکان (ئابلۆقەی ڤیەننا لە لایەن تورك لە 1529) تا ساڵی 1547 جەنگی عوسمانییەکانی لەگەڵ ئێران هێورکردەوە و تەنیا دوو جەنگی کورتی 1533-1534 و 1553-1554 ڕوویان دا کە دواتر بە ڕێکەوتنامەی ئەماسیە کۆتایی هات[1].

لە ساڵی 1547 ئەلقاس میرزا، برای شا تەهماسپ، کە ئەوکات بەگلەربەگ بوو بەسەر ناوچەی شێروان لە دژی براکەی، شا تەهماسپ وەستایەوە، سوپای سەفەوی هێرشی کردە سەر بەڵام ئەلقاس میرزا ڕایکردە ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی و لەوێ هانی سوڵتانی عوسمانی دا هێرش بکاتە سەر ئێران. لە 1548-1549 بەسوود وەرگرتن لە ڕاپەڕینی ئەلقاس میرزا، سوڵتانی عوسمانی، سوڵتان سولێمان پەلاماری ئێرانی دا. سوپای عوسمانی جارێکی دیکە شاری تەبرێزی داگیر کرد (بەهاری 1548ز) و تاوەکو ئەسفەهانیش ڕۆیشت، شا حوسێن تەهماسپی سەفەوی ناچار بوو پایتەختەکەی لە تەبرێزەوە بگوێزێتەوە بۆ قەزوێن تا لە دەست هەڕەشەی عوسمانی ڕزگاری ببێ و دوایی وەفدێکی بۆ لای سوڵتانی عوسمانی نارد و داوای ئاشتی و ڕێککەوتنامەی ئاشتەوایی لەگەڵ سوڵتان سولێمانی قانوونی کرد. ڕاستییەکەی هەردوولا پاڵنەری خۆیان هەبوو بۆ ئاشتی، سوڵتان سلێمان ئاواتەکانی خۆی بەدیهێنابوو و دەیویست ڕەوشی ئەم بەرەیە یەکلابکاتەوە و دەستکراوە بێت بۆ خۆشگوزەرانیی موسڵمانەکان و پارێزگاریکردنی هەردوو حەرەمی پیرۆز. هەرچی شا تەهماسپ

[1] Jean-Paul Roux, p 399

بوو دەیویست دەستکراوە بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی وڵاتەکەی و خاکەکەی لەدەست ئۆزبەکەکان بپارێزێ[1]. شایانی ئاماژە پێدانە لەناو ئەو نامە و نامەگۆڕینەوەی لەنێوان هەردوولادا هەبووە لەم ماوەیەدا، لایەنی ئێرانی چاویان بڕیبووە ئەوەی ناوەندە ستراتیجیەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بەردەست بخەن وەک قارس و دیاربەکر و ئەرزەرۆم، بەڵام لایەنی عوسمانی ئاگاداری نیازی ئەوان بوون و لێنەگەرا ئەو خواستەیان بێتە دی، هەروەها لە نامەکاندا دیارە کە لایەنی عوسمانی چەندە بۆیان گرینگ بووە دەوڵەتی سەفەوییە جنێودان بە سێ خەلیفەکەی موسڵمانان ڕابگیرێت[2].

لەشکرکێشییەکانی عوسمانیی لەنێوان ساڵەکانی 1553-1554 بۆسەر ناوچە کوردییەکان بەردەوام بوو و عوسمانییەکان توانیان دەست بەسەر شارەزوور و بەلقاسدا بگرن و بەمە هەموو کوردستانیان خستە ژێر کۆنترۆلی خۆیان، سوپای عوسمانی زیاتر نەچووە پێش. ڕاستییەکەی قۆناغی دوای جەنگی چالدێران و بەتایبەت بەدرێژایی سییەکانی سەدەی شانزەهەم تا مۆرکردنی پەیماننامەی ئەماسییە (1532-1555) بە یەکێك لە قۆناغە وێرانکەرەکانی کوردستان دادەنرێت و هەر بەراستی کوردستان ببووە مەیدانی پێکدادانی جەنگەکانی سەفەوی و عوسمانی و دواتر لەگەڵ گەیشتنی سوڵتان موڕادی سێیەم (1574) ئیدی لەشکرکێشی و پەلاماری سەفەوی و عوسمانی بۆسەر یەکتر بەناو سەرزەمینی کوردستاندا هەموو ئەو میرنشین و ئەمارەتانەی کە هاوپەیمانی عوسمانی بوون هێندە وێران و کاول بوویوون بواری هیچ گەشەکردنێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیان بۆ کورد نەهێشتەوە.

---

[1] محمد عبدالطيف هريدي، المصدر السابق، ص 65

[2] نفس المصدر ، ص 65

شایانی گوتنە ئەوە بگوترێ، کە سەفەوییەکان دوای شکستییان لە جەنگی چاڵدێران (1514) بەدواوە هەمیشە خۆیان لە جەنگی ڕاستەوخۆ لەگەڵ عوسمانییەکان دەپاراست و تاکتیکی دواخستنی جەنگ و سیاسەتی بەسووتماك کردنی زەوی یان لەبەرانبەر هێرشەکانی عوسمانییەکان بەکاردەهێنا. عوسمانییەکان چەندین جار هێرشیان بردە سەر وڵاتی ئێران، بەڵام هەموو جار لەبەر ئاستەنگی ئازووقە و هێرشی پێچەوانەی جەنگی پارتیزانی سەفەوی نەیاندەتوانی زۆر بمێننەوە. بۆیە دواجار لە 7 ی ڕەمەزانی 961 هـ/6 ی ئاگستۆسی 1554، ئێرانییەکان لەڕێگەی دیلیێکی تورك پێشنیازی ئاشتی یان بۆ ئۆردووی عوسمانی نزیك لە بایەزید نارد. لە 28 ی شەوال ك/ 26 ی سێپتامبەری 1554 شاە قوڵی ئاغا وەکو ئەفسەری شا تەهماسپ نێردرا بۆ ئەرزەرۆم، کە سوڵتان سلێمان خۆی لەوێ بوو. بێگومان پێشنیازی ئاشتی مایەی پێشوازی عوسمانییەکان بوو چونکە لەسەر سنووری ڕۆژئاوا لەبەرەی جەنگ بوون لەگەڵ هایسبۆرگ. دواجار لە 18 ی جومادی دووەمی 962 ك/10 ی ئایاری 1555 کەمالەددین فارووق زادە بەگ گەیشتە ئەماسییە، کە سوڵتان عوسمانی بۆ وەرزی زستانان لەوێدا دەمایەوە. دوای نۆزدە ڕۆژ پەیماننامەی ئاشتی ئەماسییەی لێ کەوتەوە[1]، و دوای چەندین گەڕی مفاوەزە و نامە و نامەکاری پەیماننامەی ئاشتی لە 8 ی ڕەجەبی 962 ك/29 ی ئایاری 1555 بەناوی ئاشتینامەی ئەماسیە لە شاری ئەماسییە* ئیمزا کرا[1].

---

(1) Köhbach, M, "AMASYA, PEACE OF". *Encyclopaedia Iranica, Vol. I, Fasc. 9,* 1989, p. 928

* ئەماسیە: شارێکە لە تورکیای ئاسیایی (ئەنادۆل)، لەسەر ڕووباری یەشیل ئیرماق، ناوەندی لیوایەك بوو بەهەمان ناو، لە ویلایەتی سیواس، بارەگەی ئەسقەفیەتی یۆنانی لێیە، کە سەر بە پارتیارکیەتی کۆنستانتینە، بڕوانە: س. موستراس، المعجم الجغرافي

ڕاستییەکەی پەیماننامەی ئەماسییە جەنگی بیست ساڵەی نێوان شا تەهماسپی یەکەم (1524-1576 ز) و سوڵتان سلێمانی قانوونی (1520-1566 ز) کۆتایی پێهێنا، بەڵام زنجیرەیەکی گرنگی شەڕەکانی ئەم سەردەمە لەسەر خاکی کوردستان قەومان و بەشێکی گەورەی قوربانیەکانیشی مەزن و کوڕی ئێلە کوردەکانی ژێردەستی هەردوو دەوڵەت بوو. ئەو شەڕانە کارەسات وماڵوێرانییەکی گەورەیان بەسەر کورد هێنا، کۆتاییەکەشی بەپێکهاتنی ئاشتی ئەماسییە هات[2]. لەبارەی بەشداری کورد لەم لەشکرکێشییە سەربازییانەدا، تێبینی ئەوە دەکەین، کە زۆرترین بەشی هێزەکانی ئەلقاس میرزا کە بەوهێزە پەلاماری دەبردە سەر ئێران لە هێزەکانی میرنشینە کوردییەکان بوون[3]. هەرچی پەیوەیست بوو بە فراوانخوازیی عوسمانی لە کوردستان لەماوەی ئەو ساڵانەدا، دەکرێ بووترێت، کە سوڵتان سولێمانی قانوونی توانی ناوچەیلی: وان، ئەرزەرۆم و شارەزوور بخاتە ناو ناوچەکانی نفووزی خۆی لەکاتی ئەم لەشکرکێشیانەدا و بەوەش دەسەڵاتی عوسمانی بۆسەر کوردستان بەرفراوانتر بوو[4]. ساڵی 1556 دوای گەمارۆدانی شارەزوور لە لایەن والی بەغدا، سلێمان پاشا، شارەزوور کەوتەوە دەست والی بەغدا وپاش ئەوەی والی چووە ناو شارەزوور هەر زوو فەرمانی بۆ هات بگەڕێتەوە بۆ بەغدا چونکە قاو وا

---

للامبراطورية العثمانية، ترجمة وتعليق: عصام محمد الشحادات، دار ابن حزم، بيروت، 2000، ص 104

(1) علي إبراهيم درويش ، المصدر السابق، ص 136

(2) ساڵح محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، لا: 26

(3) مذكرات مأمون بگ بن بيگه بگ، ص 41 ودواتر.

(4) د. سعدى عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية...، ص 88.

بڵاوبۆوە، کە شا تەهماسپ لەڕێگەیە بۆ پەلاماردانی بەغدا، هەر لە هەمان ساڵ شا تەهماسپ، قوولی خەلیفە مۆرهەڵگری شا و ژمارەیەك میرانی قزڵباشی نارد بۆ هێرش کردنە سەر بەغدا و ناوچە هاوسێیەکانی و لەڕێگە لەلایەن سەرکردەی کورد حوسێن بەگی، حاکمی ئامێدی بەرپەچدرانەوە[1].

لە هەمووی گرینگتر پەیماننامەی ئەماسیە بە قسەی فارووقی ڕێگەی بە عوسمانییەکان دا لەماوەی چارەگە سەدەیەکی دوای پەیماننامەکە سەرقاڵی داگیرکارییەکانی ئەوروپا بن، لەکاتێکدا شا تەهماسپ تەواو سەرقاڵی دامرکاندنەوەی هۆزە شیعە (قزڵباشەکان) و ئۆزبەکە سونییەکان بوو پێکەوە[2]. شایانی ئاماژەپێکردنە، لە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئەماسیە (29 ی ئایاری 1555 ز) وە، پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی لە دەورانی شا تەهماسپ (1524-1576ز) و سوڵتان سەلیمی دووەم (1566-1574 ز) کە لەدوای قانوونی هات لەوپەری هێمنی دابوو. بۆیە دەبینین لەکاتی لەسەر کورسی دانیشتنی سوڵتان موورادی سێیەم (982-1003 ك/1574-1595 ز)، شا تەهماسپ وەفدێکی گەورەی ناردووە، بە دیاری گرانبەهاوە و وادەی پشتگیری سوڵتانی وەرگرت بۆ پاڵپشتی کورەکەی و وەلی عەهیدەکەی بکات بۆ ئەوەی دوای مردنی شوێنی بگرێتەوە، ئەوە لەکاتێکدا بوو کە ناکۆکی خێزانیی لەسەر جێگرەوەی لە بەرزترین ئاستدا بوو، تا لە کۆتایی حوکمڕانی بوو بە ململانێیەکی توندی ئاشکرا لەنێوان هۆزە قزڵباشەکان کە لەسەر کورسی حوکمڕانی کێبەرکێیان بوو[3]. هێندەی نەبرد شا تەهماسپ لە ڕۆژی 1576/5/14 دوای (52 ساڵ (21 ڕۆژ کەمتر) لە حوکمڕانی) مرد، دوای خۆی

---

[1] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 59

[2] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 193

[3] نفس المصدر، صص 196-197

خەزینەیەکی یەدەگی بۆ ئێران بەجێهێشت، کە ئەقڵ قەبووڵی نەدەکرد و دووەمین دەوڵەتی جیهان بوو لە یەدەك. لە 1577/11/24 کوڕەکەی ئیسماعیل[1] لەبەر ئەوەی مەیلی مەزهەبی سوننی-شافیعی هەبوو ژەهر خواردوو کرا و برا گەورەکەی محەمەد خوابەندە (کوێر، 45 ساڵ) جێگەی گرتەوە. دەسەڵاتی ڕاستەقینە بەدەست کوڕەکانی میرزا حەمزە و عەبباس بوو. ڕەوشی ناوخۆیی ئێران زۆر شپرزە بوو[2].

لەو ماوەیە مێژووییەدا واتە لە پەیماننامەی ئەماسییەوە تا پەیماننامەی سەراو، پێنج پەیماننامەی ئاشتی و پێکهاتن لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا بەسترا، کە هەر یەکەیان دوای زنجیرەیەک جەنگ و کوشتار مۆر دەکران و دوایی هەر زوو پووچەڵ دەبوونەوە. یەکەمین پەیماننامەی ئاشتی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، پەیماننامەی ئاشتی ئەماسیە بوو، کە لە (29ی ئایاری 8/1555 رجب 962 ک) بوو، لەنێوان شا تەهماسپی یەکەم و سوڵتانی عوسمانی، سولێمانی یەکەم لە

---

[1] شا ئیسماعیلی دووەم (984-985 ك/1576-1578 ز) هەوڵی دەدا بۆیەکی سوننیگەرا بە دەسەڵاتەکەی ببەخشێ، مەرسوومێکی دەرکرد و قەدەغەی کرد جنێو بە سێ خەلیفەی یەکەمی راشیدینەکان و عائیشە دایکی ئیمانداران و دە هاوەڵەکە بدرێت. ئەوە لەوسۆنگەوەیە کە برێك لە مێژووی ئەعیان بە "سوڵتانە سوننیەکە" و بە "ئیسماعیلی دووەمی سوونني سەفەوی" وەسپی دەکەن. بگەڕێوە: محمد جمال باروت، المصدر السابق، ص.197. قزڵباشەکان بە نزیکبوونەوە لە ئیسلامی سوونني تاوانباریان کرد و هەرزوو لە هەڵبژاردنی وەکو (شا) پەشیمان بوونەوە و دواجار لەڕێگەی خوشکەکەیەوە بە تلیاک ژەهرخواردوویان کرد و لە 24 ی تشرینی دووەمی 1577 مرد. بروانە: علي إبراهيم درويش، المصدر السابق، ص 95

[2] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، المصدر السابق، ص 398

شاری ئەماسییە دوای نزیکەی چارەگە سەدەیەک لە جەنگ مۆرکرا، ئەم پەیماننامەیە بە یەکەمین پەیماننامەی ئاشتی دادەنرێت، کە لەنێوان دوو دەوڵەتی موسڵمانی ناکۆک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا مۆرکرابێت[1]. لەم پەیماننامەیە هەردوو لا پێیان لەسەر سێ تەوەری سەرەکی داگرت:

یەکەمیان: بەجێهێشتنی ویلایەتی قارس و قەڵای قارس بۆ دەوڵەتی عوسمانی.

دووەمیان: دیاریکردنی سنووری ویلایەتی شارەزوور، کە لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا کێشە و هەرایەکی زۆری بەدوواوە بوو.

سێیەمیان: دابینکردنی سەلامەتی حاجی و گەشتیارە ئێرانییەکان[2].

ڕاستییەکەی ئەم پەیماننامەیە زۆربەی بەندەکانی بە قازانجی دەوڵەتی عوسمانی بوو و لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئێران بوو بۆیە نەیتوانی هاوسەنگیی لەناوچەکە رابگرێت. هەرچی پەیوەندی بە کوردەکانی شارەزوورەوە هەبوو، هەردوولا بۆیەکەمجار بیریان کردەوە، کە هەڵوێستێکی یەکگرتوو لەبارەی سەرکردە کوردەکان بگرنەبەر، بەڵام ئەم بەندە لەبەر ئەوەی کوردەکان پێبەندییەکی (وەلاء) جێگیریان نەبوو بۆ لایەنێکیان هەر تەنیا وەک نووسراوی سەرکاغەز مایەوە[3]. ڕاستییەکەی لەسەر ئاستی ڕەسمی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت پەیماننامەی

---

[1] شاكر صابر الضابط، العلاقات الدولية، ومعاهدات الحدود بين العراق وإيران، بغداد، 1966، ص 19

[2] هەمان سەرچاوە لا: 19 (پێویستە ئەوە بگوترێت کە تاکو ئێستا هیچ دەقێکی نووسراوی ئەم پەیماننامەیە لە هیچ لایەک بڵاونەکراوەتەوە، واپێدەچێ پەیماننامەکە هەر لە بنەواندا هیچ دەقێکی نووسراوی نەبووبێت).

[3] د.عباس اسماعيل الصباغ، المصدر السابق، ص182 -183

ئەماسییە بۆ ماوەی نزیکەی چارەگە سەدەیەک شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانی ڕاگرت، وێڕای چەند یاسابەزێنییەکی ئەملاو و ئەولا، بەڵام پەیماننامەی ئەماسییە هەم لەلایەن شا تەهماسپ و هەم لەلایەن سوڵتان سولێمانی قانوونی ڕێزلێگیراو بوو تا مردنی قانوونی لە ساڵی 1566. سوڵتان قانوونی لە هەموو فەرمانێکدا بۆ بەگلەربەگی بەسرە پێی لەسەر ئەوە دادەگرت ، کە ئەو ڕێکارانەی بەگلەربەگی دەیانگرێتە بەر دەبێ هەموویان هیچ شتێکیان تێدانەبێ کە "کارێك بکەن پێچەوانەی ڕێکەوتنامەکە" بێت[1].

بەڵام دوای مەرگی شا تەهماسپی یەکەم (14 ی ئایاری 1576 ز)، کاتێک دەوڵەتی سەفەوی لە پشێوی و لاوازیدا بوو، دەوڵەتی عوسمانی ئەمەی بەدەرفەت زانی و لە سەردەمی شا محەممەد خدابەندە (1577-1588 ز)، پەلاماری ئێرانی دا. ڕاستییەکەی ئەم دەورانە سەرەتای قوناغێکی پڕ هەرەج و مەرج و ناسەقامگیریی دەسەڵات بوو تا محەممەد خدابەندە، حاکمڕانی نیمچەکوێر لە ئۆکتۆبەری 1587 بە قازانجی کوڕەکەی عەبباس دەستی کێشایەوە، هەر درێژەی کێشا[2].

وەک لە پێشدا گوتمان دوای مردنی شا تەهماسپ (984 ك /1576 ز) ناکۆییەکی قووڵی لەسەر کورسی دەسەڵات لەناو دەرباری سەفەوی لەنێوان لایەنگیرانی ئیسماعیل و برا بچووکەکەی حەیدەر عەلی هێنایە ئارا، لایەنگیرانی ئەوەی دوایی توانیان حەیدەر تەنسیب بکەن بۆ عەرش، بەڵام هەر دوای چەند سەعاتێك لە تەنسیبکردنی هێشتا باوکی نەنێژرا بوو، کوژرا، کە دواتر حەیدەر لەگەڵ باوکی پێکەوە نێژران و براکەی محەممەد خدابەندە، کە نابینابوو وازی لە مافی خۆی هێنا بۆ ئیسماعیل. پاش ئەوە لایەنگیرەکانی ئیسماعیل سەرکەوتن

[1] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 194

[2] Francis Richard, Le siècle d'Ispahan, Gallimard, Paris, 2007 p.29

لەوەی لە 22 ی ئاگستۆسی 1576 وەك سێیەمین شای سەفەوەی تەنسیبی بکەن. پاشان ئەمەی دوایی پاکتاوکردنێکی بەرفراوانی دەست پێ کرد لەناو هۆزی قزڵباش (ئوستالجو) بەتایبەت ئەوانەی لایەنگیری دانانی حەیدەری زڕبرای بوون و لە ترسی پیلانگیریی لەناو خێزانەکەی دوای گەیشتنی بۆسەر عەرش (2 ی نۆڤەمبەری 1576) دوو زڕبرای کوشتن و لە 24 ی شوباتی 1557 سێ زڕبرای دیکەی کوشت و ئامۆزاکەیی و مێردی خوشکی سوڵتان ئیبراهیم میرزا و براکەی ئەمەی دوایی بەدیع زەمان میرزا و منداڵە بچکۆڵەکەی بەهرام میرزای کوشت و پلانیشی دانابوو بۆ کوشتنی محەممەد خدابەندە و منداڵەکانی بەڵام فریا نەکەوت. لە سێزدەی مانگی ڕەمەزانی 985 ی ك/ 24 ی نۆڤەمبەری 1577 دوای گەڕانێکی شەوانە کە ئیسماعیلی دووەم بەناو پایتەختەکەی دەگەڕا و ئەو شەوە برێکی زۆر تلیاکی وەرگرت و کە گەرایەوە چووە ناو نوێنەکەی لە ژوورەکەی و کەسێکی دیکەشی لەگەڵ بوو، شا نووست بەڵام هەڵنەستایەوە. دوای ئەوە هەڵبژاردنی (شا)یەکی نوێ کارێکی قوورس نەبوو، چونکە شا ئیسماعیل زۆر بە توندی هەموو کاندیداکانی کوشتبوو و لەناوی بردبوون، بۆیە دامەزراوەی سەربازیی لەسەر ناوی سوڵتان محەممەد میرزا ناسراو بە "خدابەندە" ڕێککەوتن[1].

ئیسماعیلی دووەم دوای ئەو ماوەی حوکمڕانییەی، هێندە درێژەی نەکێشا و لە ڕۆژی 24 ی تشرینی دووەمی 1577 بەژەهر خوارد کوشتیان و پاش ئەوە براکەی محەممەد خوابەندە (985-996 ك/1578-1588 ز) (کە تەواو کوێر بوو، 45 ساڵ)، جێگەی گرتەوە. دەوڵەتی عوسمانی ئەو پشێویەی قۆستەوە بۆ ئەوەی شکست بە ئێران بهێنێ و لەناو خاکەکەی فراوانخوازی بکات و دەست بەسەر ئەو بەرهەمانە دابگرێ کە هەناردەی بازاڕیان دەکات، لە بەرایی هەمووشیان بەرهەمی ئاوریشم، بۆ ئەم مەبەستە عوسمانییەکان دەرفەتی

[1] عباس حسن الموسوی (کمال السید)، المصدر السابق، ص 103-104

ڕێکەوتنی ئاشتی یان لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپایی قۆستەوە دوای شکستی جەنگی مێژوویی لیبانتۆی زەریایی (7 تشرینی یەکەمی 1571 ز)، کە ئەوروپاییەکان بە کۆتایی فراوانخوازیی عوسمانی دادەنێن لە ئەوروپا، بەمە دەوڵەتی عوسمانی دەستی کراوە بوو بۆ پەلهاویشتن بەناو خاکی دەوڵەتی سەفەوی و جەنگ ماوەی دوانزە ساڵی خایاند (1576-1588 ز)[1]. ڕاستییەکەی پەیماننامەی ئاشتی ئەماسیە بە لەشکرکێشی مستەفا پاشا (لالە پاشا) بۆ سەر قەوقاز و جەنگی چڵدر (لە 30 میلی باکووری قارس- 9ی ئاگستۆسی 1878) کۆتایی هات. مستەفا پاشا لە جۆرجیا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و هێزیکی سەفەوی لە گۆلی چڵدر شکست پێهێنا و شێروانی داگیرکرد[2]. دوای گەیشتنی هەواڵی لەشکرکێشی مستەفا پاشا بۆسەر قەوقاز، شا محەممەد خودابەندە نامەیەکی ئاشتی بە تەتەرێکدا بۆ سوڵتان مورادی سێیەمی عوسمانی نارد و داوای لێ کرد داخۆ هۆی چییە پەیماننامەی ئاشتی ئەماسیە پێشێل کرا، بەڵام سوپای عوسمانی لەسەر سنوور تەتەرە سەفەوییەکەیان دەستگیر کرد و نەیانهێشت نامەکە بگاتە دەست سوڵتان.

هەر لە لەشکرکیشیی و داگیرکردنەکانی دووەم زنجیرە هێرشەکانی عوسمانی بۆ ئێران، سەرەتا ئازەربایجان و قەوقاز (هاوینی 1878)، تبلیس (9 ی ئاگستۆسی 1578)، قارس (1580)، جەنگی تۆرش (9-11 ی ئایاری 1583)، تەبریز (1585)، لورستان و هەمەدان (1587)، گەنجە قەرەباغ (1588) داگیرکران و سەرباری هەموو ئەو داگیرکردنانەش ئۆزبەکەکان بەشێکی گەورەی زەوییە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێران یان داگیرکرد و لەناو ئەم ڕەوشە دراماتیکییەدا شا محەممەد خودابەندە بە قازانجی کوڕەکەی شا عەبباس دەستی

---

(1) محمد جمال باروت، المصدر السابق ، نفس المصدر، ص 200

(2) Jackson, Peter and Laurence Lockhart, the Cambridge History of Iran: The Timur and Safavid Periods, Vol.6, Cambridge University Press, 1986, 257.

لە کار کێشایەوە ( ئۆکتۆبەری 1578). شا عەباس ناچار بوو لەبەرانبەر ئەم ڕەوشە دراماتیکیە، ئاشتییەکی شەرمهێن قەبووڵ بکات (پەیماننامەی 21 ی ئاداری 1590).

شایانی گوتنە کوردەکان لەم جەولەیەی یەکەمی جەنگدا (1577-1589 ز) ڕۆڵێکی بەرچاویان لە هەموو ئەم شەڕانەدا گێڕاوە، بەشێوەیەک لە 19 ی ئۆکتۆبەری 1577 (20 ی شەوالی 985 ی کۆچی) سوڵتانی عوسمانی فەرمانی بە زەینەل بەگ، حاکمی هەکاری کرد پەلاماری شاری سەلماس بدات و داگیری بکات و بیخاتەوە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و دوای ئەوە بە دەوڵەتی عوسمانییەوە لکێندرا[1]. لە 29 ی ئابی 1578 شێخ حەیدەری موکری لە ناوچەی برادۆست، ناوچەی باشوور-ڕۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ تاڵانبرۆ کرد و هەزار ئەسپی لە هۆزەیلی سەربە قزڵباشەکانی سەفەوی برد[2].

دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی 1586 توانی قەڵایەک لە ناوچەی شارەزوور لە ئێرانییەکان بسەنێتەوە و پاشان لوڕستانیش داگیر بکات[3]. شایانی گوتنە عوسمانییەکان شەڕی سەفەوییەکانیان بە میرنشینە کوردەکان دەکرد. دەسەڵاتکارانی عوسمانی فەرمانییان بە خوسرەو بەگ، حاکمی وان کردبوو، وریابێ هەر کات ئەگەر دەوڵەتی ئێران نارەزایی دەربڕی

---

[1] فیروز منصوری، "تاریخ از تهاجم و همسایه ازاری عثمانیان سخن می گوید"، (إیران و قفقاز)، نوشته، گرداواری و تنظیم: دکتر پرویز ورجاوند، چاپ أول، تهران، 1999/1378، ص 87.

[2] Bekir Kütükoglu, Osmanli-Iran siyasî münâsebetleri, I (1578-1590), Istanbul, 1962, SS. 44-45.

[3] مرتضى أفندی نظمی زاده، گلشن خلفا، ترجمه من الترکیة: موسى کاظم نورس، النجف، 1971، ص 210.

دژی داگیرکردنی شارەکانی ورمێ و سەلماس لەلایەن عوسمانییەوە، ئەوا پێویستە وەڵامیان بداتەوە، کە عوسمانییەکان هیچ دەستێکیان لەمەدا نییە و ئەمە تەنیا کێشەیەکی ناوخۆیی میرە کوردەکانە کە بووەتە کێشە لەسەر سنوورەکان و عوسمانییەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە بابەتەکەوە نییە(1).

لە درێژەی پەلامارەکانی هێرشی عوسمانی بۆ سەر ئەو شار و ناوچانەی لە بندەستی دەوڵەتی سەفەوی بوون، سوپای عوسمانی لەشکرکێشی کرد بۆسەر میزۆپۆتامیا و لە خاکەلێوەی ساڵی 1587 جەنگێکی خوێناوی لە نزیک بەغدا ڕوویدا و فەرهاد پاشا، سوپایەکی پانزە هەزار کەسی ئێرانی دوای سێ ڕۆژ جەنگی خوێناوی بەتەواوی تەفروتوونا کرد. بە دوای ئەم سەرکەوتنە هێزەکانی عوسمانی ئەردەلان و کرماشانیان داگیرکرد. چەند ماوە دواتر فەرهاد پاشا هێرشی بردە سەر قەرەباغ و گەنجە و توانی داگیریان بکات(2).

لەڕاستیدا شا عەبباسی یەکەم، ناسراو بە "شا عەبباسی گەورە" بە ڕەوشێکی زۆر نالەبار و سەختدا تێپەڕ دەبوو، بەجۆرێك عوسمانییەکان لە ئازەربایجان هێرشیان دەهێنا و ئۆزبەکەکان ساڵی 997ك/1589 ز خوراسان یان داگیرکرد و تاوەکو مەشهەد پێشڕەوییان کرد(3). ئەوە لەژێر ئەم ڕەوشە سەخت و نالەبارەدا بوو، کە لە کانوونی دووەمی 1589 کونسوڵی ئێران لە ئیستەنبووڵ داوای پەیماننامەی ئاشتی کرد لەنێوان هەردوو دەوڵەت. ڕاستییەکەی دوای جەولەی

(1) Bekir Kütükoglu, Osmanli-Iran siyasî münâsebetleri, I (1578-1590), Istanbul, 1962, SS. 24-25

(2) عبدالرضا هوشنگ مهدوی، تاريخ روابط خارجي إيران. انتشارات أمير كبير، تهران 1364، ص 50.

(3) علي إبراهيم درويش ، المصدر السابق، ص 96

یەکەمی جەنگی سەفەوی-عوسمانی (1577-1589 ز) دوای دوانزە ساڵ جەنگ، هەردوو دەوڵەت کەوتنە مفاوەزە، شا عەبباسی یەکەم (995-1307ك/ 1588-1629ز)، کە دوای تەنازولکردنی باوکی تازە دەسەڵاتی گرتبووە دەست لەبەر کۆمەڵێک هۆ بەناچاری ئاشتی دەویست: 1- هۆزەکانی ئۆزبەک بەهێز بوویوون دەیەویست دەستکراوە بێ بۆ لەناوبردنی یاخیبوونیان . 2- کات بگرێتەوە بۆ بونیادنانی سوپایەکی بەهێز[1]. بۆیە دوای دوانزە ساڵ جەنگ پەیماننامەیەکی ئاشتی کارەساتبار بۆ سەفەوەییەکان بەناوی پەیماننامەی فەرهاد پاشا (21ی ئاداری 1590) (کە پەیماننامەی یەکەمی ئیستەنبووڵیشی پێدەڵێن) مۆرکرا. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە هەموو هەرێمەکانی تەبرێز، شێروان، جۆرجیا، لورستان و شارەزوور بۆ دەوڵەتی عوسمانی وازی لێ هێنرا، عوسمانییەکان ئەم هەرێمانەیان لەکاتی لەشکرکێشییە دووبارەبووەکانیان داگیرکردبوو، هەروەها سەفەوەییەکان پەیمانی ئەوەیان دا واز لە ئیستیفزازاتی مەزهەبگەرایی بهێنن[2] و سەفەوییەکان پابەند کران بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە سووکایەتیی بە سێ خەلیفەکانی یەکەم ڕابگرن، کە ئەوە دابێک بوو سەفەوەییەکان هەر لە دەورانی شا ئیسماعیلی یەکەمەوە لەسەری ڕاهاتبوون[3]. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە زەویوزارێك، کە زۆربەی لەلایەن ئۆزدەمیر ئۆغلو عوسمان پاشا داگیرکرا بوو و 59.000 کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبوو، بەمە سنووری دەوڵەتی عوسمانی

---

(1) محمد عبدالطيف هريدي، المصدر السابق، ص 72

(2) علاء نورس، المصدر السابق، ص 26.، د. سعدى عثمان هروتى، كوردستان والامبراطورية...ص. 163 . بۆ مەتنی عوسمانلیی پەیماننامەکە بڕوانە: منشآت السلاطين، 2، 249-252.

(3) وجيه كوثراني، المصدر السابق، ص 79

بەشێوەیەکی قەتعی تاوەکو ڕۆژئاوای زەریای خەزەر (قەفقاسیای باکوور، داغستان، ڕەوان، گرجستان، شیروان، ئازەربایجان، ئەردەڵان، کرماشان، لورستان، خوزستان درێژ دەبۆوە[1].

ساڵی 1597 شای ئێران، شا عەبباس ئۆزبەکەکانی تا ئەودیو ئۆکوس ڕاونا. لە 1604-1603 عوسمانییەکانی لە خاکی ئێران وەدەرنا و سنووری ئێرانی گەڕاندەوە بۆ سنووری ساڵی1576[2]. بەم شێوەیە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم دەرفەتێکی زۆر لەبار بۆ شا عەبباس هاتە پێشەوە بۆ لەناوبردنی ڕێکەوتنامەی ئەستەنبووڵی یەکەم، بۆئەوەی -وەك فارووقی-ناوی ناوە "جەنگی سی و شەش ساڵە" دەست پێ بکات، کە ماوە مێژوویەکەی لەنێوان 1603 و 1639 داناوە. یەکەمینایەتی شا عەبباس گێڕانەوەی ئەو ناوچانە بوو، کە لەنێوان 1555 و 1590 دۆڕاندبووی و لە ڕێکەوتنامەی ئیستەنبووڵی یەکەم (1590) چەسپێنرابوون، لە پێش هەموشیانەوە شاری تەبرێز، دەروازەی ڕێگەی ئاوریشم بوو[3]. بۆیە بە ئامانجی تۆڵەسەندنەوە لەم پەیمانامەیە شەرمهێنە (پەیماننامەی فەرهاد پاشا)، کە لە ڕەوشێکی زۆر تەنگەتاو لەلایەن سەفەوییەکانەوە مۆرکرا بوو، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم شا عەبباسی سەفەوی کەوتە ناو زنجیرەیەک جەنگ و لەشکرکێشی لەگەڵ عوسمانییەکان. بەم شێوەیە شا عەبباس لە ساڵی 1603 بە سوود وەرگرتن لەو ئاستەنگییانە ناوخۆییانەی، کە دەوڵەتی عوسمانی پێیدا دەرۆیشت و نابوودبوونی سوڵتانەیلی عوسمانی کە بەرەوڕووی پیلانگێڕیی کۆدێتاکردن بوون بەسەریانەوە، دەستی کرد بە شەڕکردن لەگەڵ عوسمانییەکان بەبێ ئەوەی

---

[1] یلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة: عدنان محمد سلمان، ص 421

[2] Jean-Paul Roux, p 400

[3] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 203

جاری جەنگ بدات[1]. بەم جۆرە شا عەبباس تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئەوروپا و ئەو کێشانەی، کە هەیبوون قۆستەوە و پەلاماری دەوڵەتی عوسمانی دا دوای گەمارۆیەکی (22) ڕۆژە دەستی بەسەر تەبرێز دا گرتەوە (1603/9/26). لە باکووری ئاراس، نەخچەوان (1603/10/26) گیرایەوە و ڕەوان دوای گەمارۆیەکی توندی (شەش مانگ و 23 ڕۆژ) لە (1604/6/8) گیرایەوە. عوسمانییەکان نەیاتوانی هیچ شوێنێك لەوشوێنانە داگیربکەنەوە کە لە دەستیان دا. جگە لەوە لە شەڕی گەورەی ورمێ (1605/9/6) بەتەواوی سوپای عوسمانی تێکشکاند. شا عەبباس توانی گەنجە لە (1606/7/6) و شماه لە (1607/6/27) بگرێتەوە و لە ڕووباری (کور) پەڕینەوە و دەستیان بەسەر زۆرترین بەشی شێرواندا گرت. شا عەبباس نەیتوانی لەمە زیاتر بچێتە پێشەوە و جەنگ خاو بۆوە[2]. ئەم هێرش و لەشکرکێشییانەی شا عەبباس ڕێگەی بۆ ڕاپەڕینی هۆزە کوردییەکانی جانبولاد و فەخرەدینی ئەلمعینی دروز خۆشکرد، کە ئەمە هەڕەشەیەک بوو بۆ شوێنەکانی عوسمانی لە کیلیکیا ، لە سوریای باکوور و لە لوبناندا[3].

شەڕی سەفەوی-عوسمانی تا ساڵی 1612 دیسان درێژەی کێشا، پاشان پەیماننامەیەکی ئاشتی مۆرکرا، دواجار بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتننامەیەک نسوح پاشا پێشنیازەکانی شا عەبباسی قەبووڵ کرد و پەیماننامەیەکی ئاشتی بەناوی پەیماننامەی نسوح پاشا لە (24ی شەعبانی 1021 ك/20 تشرینی دووەمی 1612) مۆرکرا و کۆتایی بە

---

[1] وجیه کوثراني، المصدر السابق، صص 79-80

[2] یلماز اوزتونا، تاریخ الدولة العثمانیة، المصدر السابق، صص 4478-449

[3] Robert Mantran : Le XVIIe siècle (stabilisation ou déclin ?) et Le XVIIIe (la pression européenne et le début de la Question d'Orient), In Histoire de l'empire ottoman, Paris, Fayard, 1989, p.229

جەنگی (9 ساڵ و 9 مانگ و 24 ڕۆژ هێنا). بەگوێرەی ئەم ڕێکەوتننامەیە شارەکانی تەبریز، وان، شیروان بۆ دەوڵەتی سەفەوی بەجێهێشتران، بەمەرجێک شای ئێران ساڵانە 200 باری حوشتر ئاوریشم[1] لەبەرانبەر ئەم دەستهەڵگرتنە بدا بە دەوڵەتی عوسمانی[2]. ئەمانە لە گرینگترین بەندەکانی پەیماننامەکە بوون، وێرای چەند بەندێکی تەقلیدی وەک دەستدرێژی نەکردنە سەر کاروانەکان و وازهێنان لە جنێودان بە خەلیفەکانی راشیدین[3].

شایانی ئاماژە پێکردنە بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە دەوڵەتی عوسمانی 400.000 کیلۆمەتری چوارگۆشە لە کۆی 570.000 کیلۆمەتری چوارگۆشە، کە عوسمانییەکان بە چارەگە سەدەیەك دەستیان بەسەردا گرتبوو بۆ بۆ دەوڵەتی ئێرانی گێڕایەوە. ئەو دەروناوچانەی کە دەوروبەری ورمێ (ئورومیە) و کۆکجە، ڕۆژهەڵاتی ڕووباری ئاراس و کۆر و بە دەربڕینێکی ڕوونتر، ڕەوان، نەخچەوان، قەرەباغ (حەرران) ئازەربایجان (شێروان) ی باکووریی و باشووریی، لەبەرانبەر ئەوەدا گەورەترین بەشی گورجستان و داغستان و قەوقازی باکووریی لای دەوڵەتی عوسمانی دەمێنێتەوە[4].

ئەم پەیماننامەیەش زۆری نەبرد و پێشێل کرا، ئیلتزامی شا عەبباس بە پەیماننامەی نسوح پاشا هێندە درێژەی نەکێشا و شا عەبباس ڕەتیکردەوە ئەو ئاوریشمەی لەسەری ڕێککەوتبوون بیدات و وتی " من جەزیە نادەم بە

---

[1] 200 بارە حوشتر دەکاتە نزیکەی (59000) کیلۆگرام.

[2] شاكر صابر الضابط، المصدر السابق، ص 23.

[3] محمد عبدالطيف هريدي، المصدر السابق، ص 73

[4] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، المصدر السابق، ص 449

عوسمانییەکان" و پەیمانامەکەی شکاند[1]. کاتێکی هێندە زۆر بەسەر مۆرکردنی ئەم پەیماننامەیەدا ڕەتنەبوو دوای (2 ساڵ و 6 مانگ و 3 ڕۆژ) جارێکی دیکە جەنگ لە نێوان هەردوولا هەڵگیرسایەوە.

بەم جۆرە ئەم پەیماننامەیەش پێشیلکرا بەڵام پەیماننامەیەکی دیکە لە ساڵی 1615 بەدوادا هات و ئەوەی شایانی سەرنجدانە ئەوەیە کە دەوڵەتی سەفەوی و دەوڵەتی عوسمانی ڕێکەوتبوون لەسەر ئەوەی بەگوێرەی ئەم پەیماننامەی دوایی ئەو پەیماننامانە لەبەرچاوبگرن، کە پێشتر لە دەورانی سوڵتان سولێمان ئیمزاکرابوون و مەرجەکانی ئەوە بوون: ئێرانییەکان ئیستفزازاتی عەقیدەیی نەکەن و ئەو قەڵا و ناوچانەی لە بندەستی عوسمانییەکان دان و پەلاماریان بۆ نەبەن لەو کاتەی کە دەوڵەتی عوسمانی ئەو ناوچانە دەگرێتەوە لە ئەیالەتی شارەزوور کە هەڵۆ خان دەستی بەسەردا گرتوون و نابێ دەوڵەتی سەفەوییە هیچ یارمەتییەکی بدات و ڕێگەش بە هاتووچۆ و تێپەڕبوونی سەرکردەکانی هەردوو لا بدات لەسەر سنوور لە پێناو دەستنیشانکردنی سنوور[3].

بەڵام چونکە هۆکارەکانی جەنگ لە هەموو جاردا وەکو خۆیان دەمانەوە، بۆیە هەمیشە جەنگ و ئاشتی یەک لە دوای یەک خۆیان دەهێنایە پێشەوە. بەم شێوەیە هەموو پەیماننامەیەک لەپێشدا وچانێک بوو بۆ جەنگێکی نوێ. عوسمانییەکان دەستیان بەسەر بڕێک ناوچەی جێناکۆکی نێوانیان لە قەوقازدا گرت[2]. ساڵی 1615 دەوڵەتی عوسمانی لە سۆنگەی ئەوەی کە دەوڵەتی ئێران لە لایەك ئەو باجە ساڵانەی ئاوریشمی

---

[1] محمد عبدالطيف هريدي، المصدر السابق ، ص 73

[3] علاء نورس، المصدر السابق، ص 29.

[2] د.سعدى عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، أربيل، 2006، ص 280.

نەداوە و لە لایەکی دیکەوە لەبەر ئەوەی شای ئێران دەستدرێژیِ بۆسەر گورجستان کردووە بڕیاری هێرشکردنی دا بۆسەر ئێران و سوپای عوسمانی توانی دوای گەمارۆدانی ئەریوان و نەخچەوان هەردوو شارەکە داگیربکات و هەرچی سوپای والی بەغدا بوو بە ئاڕاستەی نەهاوەند لەشکرکێشی بۆسەر ئێران دەست پێ کرد[1] و هێزێکی دیکەی سوپای عوسمانی هێرشی بردۆتە سەر شاری ئەردبیل بەسەرکردایەتیی سەدری ئەعزەم، سوپای عوسمانی لە پۆل شکستە (قیریق کوبری) لە 1618/9/10 زیاتر لە پانزە هەزار 15000 کوژراو و بریندار و 500 دیلیان دا، سێ بەگلەربەگ کوژران و دوانیش بەدیل گیران. شا عەبباس داوای ئاشتی کرد، لە تەك شورای ئەردەبیل پەیماننامەی ئەردەبیل[2] لە 1618/9/26 مۆرکرا. ئەم پەیماننامەیە بەوە لە پەیماننامەی ئیستەنبووڵ جیاواز بوو، باجی ساڵانە کە ئێران دەبوو بیدا بە دەوڵەتی عوسمانی لە 200 باری حوشتر ئاوریشم کەمکرایەوە بۆ 100 بار. ئەم ئاشتییە پێنج ساڵ درێژەی کێشا و دوای ئەوەی کە سەفەوەییەکان بەغدایان داگیرکرد جەنگی عوسمانی-سەفەوی بەرادەیەك بەرفراوان بوو کە وێنەی نەبوو[3].

بەگوێرەی پەیماننامەی ئاشتی سەراو هەردوو دەوڵەت لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە هەمان ڕێککەوتنامەی ئەماسییەی 1555 لەبەر چاوبگرن و تاقە گۆرینکارییی کە بەسەر سنووردا هات ئەوەبوو، کە سەفەوییەکان لە بریتیی ئەیالەتی (ئەخسخە) کە سەر بەقەلەمڕۆی ئەوان بوو و کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، داوایان کرد هەردوو سنجاقی دەرنە و دەرتەنگ کە سەر بە ویلایەتی بەغدا بوون بدرێنەوە بە ئێران، پێشنیازەکە قەبووڵکراو و بۆ بەردەوامبوونی دۆستایەتیی نێوانیان ئالوگۆڕیی

---

[1] شاكر صابر الضابط، المصدر السابق، ص 26

[2] لە سەرچاوە مێژووییەکان زیاتر بە پەیماننامەی (سەراو) یا (سەراب) بەناویانگە.

[3] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، المصدر السابق، ص 450

بالیۆزەکان کرا[1]. هەمان ساڵ بەبۆنەی چوونە سەر عەرشی سوڵتان عوسمانی دووەم، بالیۆزی ئێران بەخۆیی و باری سەد حوشتر ئاوریشم و چوار فیل و کەرکەدەن و دیاریی دیکە چوو بۆ ئیستەنبووڵ و پشتگیری خۆی بۆ ئاشتەوایی نێوان دەوڵەتەکەی و سەدەری ئەعزەم لە سەراو دووپات کردەوە[2]. ئەم پەیماننامەیە توانی تا ساڵی 1623 پەیوەندییەکانی سەفەوی-عوسمانی بە هێمنی ڕابگرێ. بەڵام پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی هێندەی نەبرد دوای ئەوەی شا عەبباسی سەفەوی ساڵی 1623 دەستی بەسەر بەغدا دا گرت جارێکی دیکە تێکچۆوە و پاشان شا عەبباس دەستیگرت بەسەر کەرکووک و مووسڵ. هەردوو هەوڵدانی دووبارەبووی عوسمانییەکان بۆ گێڕانەوەی بەغدا هەرەسی هێنا (هێرشی عوسمانی (1625 ز) و (1629 ز) بۆ داگیرکردنەوەی بەغدا و دەرپەڕاندنی ئێرانییەکان شکستیان هێنا) تا ئەوکاتەی سوڵتان موڕادی چوارەم (1623-1640 ز) توانی لە ساڵی 1638 ئەم ئامانجە بەدیبهێنێت[3]. لەبەشی دادێ پێشهاتەکانی گێڕانەوەی ویلایەتی بەغدا بۆناو زوونی دەوڵەتی عوسمانی و پەیماننامەی زەهاوی 1639 بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی کورد و کوردستانە باس دەکەین.

---

(1) علاء نورس، المصدر السابق، ص 30.، حسن الدجيلي: العلاقات العراقية الايرانية خلال خمسة قرون، ط 3، بيروت 1991، ص 67.

(2) شاكر صابر الضابط، المصدر السابق، ص 27.

(3) أ.د. جميل موسى النجار، العلاقات العثمانية الايرانية: تطوراتها وتاثير العراق العثماني فيها وانعكاسها عليه 1823-1875، بيروت، 2016، ص29.

## 4-2: پەیماننامەی زەهاوی1639:
## یەکەم دابەشبوونی ڕەسمیی کوردستان

ساڵی 1621، دوای هەڵگەڕانەوەی سەرکردەی سوپای ئینکیشاری لە ویلایەتی بەغدا، بەکر سوباشی لە ئیمپراتۆریای عوسمانی، دەوڵەتی سەفەوی وابینی کە دەرفەتی لەباری بۆ هاتۆتە پێشەوە، لەم سۆنگەیەوە لەسەر داوای بەکر سوباشی هەرزوو لەشکرکێشییەکی سی هەزار سەربازی بە سەرکردایەتیی شا صەفی بەهادور بۆسەر بەغدا ئامادەکرد[1]. شا عەبباس هیچ نەپرینگایەوە لەوەی ئەم دەرفەتە بقۆزێتەوە کە لە ئاسمانەوە بۆی هاتبووە خوارە و دووبارە گێڕانەوەی عێراق و عەتەباتە پیرۆزەکانی، کە هەرگیزی لە حیسابی ئەودا نەبوون[2].

بەڵام بەکر سوباشی دوای ئەوەی دووبارە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بەرپرسیارێتی ویلایەتی بەغدایان پێسپاردەوە، لە ئێران پەشیمان بۆوە و چۆوە پاڵ دەوڵەتی عوسمانییەوە. بەڵام شا عەبباس دەستەبەرداری هەوڵی خۆی نەبوو و دواجار سەفەوییەکان دوای گەمارۆیەکی سێ مانگە (شەوی 11 لەسەر 12/

---

[1] شاکر صابر الضابط، المصدر السابق، ص 32.

[2] ستيفن هميسلي لونگريك، أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياط، ط 4، 1968، ص 75

1/ 1624ز)[1] - بەشێوەیەکی نهێنی- دوای ئەوەی دەرگەی شاریان لەلایەن دەروێش محەممەد بەگی کوڕی بەکر سوباشی پاشای بەگلەربەگی بەغدا بۆکرایەوە، کە پەیوەندی لەگەڵ باوکی باش نەبوو چوونە ناو شاری بەغداوە. شا عەبباس پلەی بەگلەربەگی بە ناسناوی "خان"ی بە دەروێش محەممەد بەخشی و بەکر پاشا ،کە ڕەتیکردەوە ببێ بە شیعە، شا عەبباس بۆماوەی حەوت ڕۆژ ئەشکەنجەی دا و پاشان خستییە ناو بەلەمێکی پڕ لە نەوت و ئاگری تێبەردا. هەریەکە لە قازی بەغدا عومەر نوری ئەفەندی و خەتیبی مزگەوتی گەورە محەممەد ئەفەندی و سەدان ئەفسەر و کارمەندی عوسمانی و ئەشرافی سوننەی بەهەمان شێوە کوشت[2]. شای ئێران داوای هەموو چەکەکانی ناوی شاری کرد و هەموو سەربازەکان و هەزاران خەڵکی سوونەی دەستبەسەردا گرت. سزای دەوڵەمەندەکانی دا. سەدان بەڵکو هەزاران خەڵك لەپێناو عەقیدەکەیان بوون بە قوربانی و پاشان هەزاران خەڵك و منداڵ وەکو کۆیلە فرۆشران تا کۆتایی لەناو ئێران ون بوون و تەنانەت شا نەیویستووە یەك سوننەش لە بەغدا بەزیندوویی بهێڵێتەوە[3].

بەگوێرەی مێژوونووس یاسین خەیروڵڵا ئەلعەمەری لە کتێبی (*الدر المكنون في المآثر الماضية من القرون*) شا نزیکەی چل هەزار کەسی لە دانیشتوانی بەغدا کوشت و پاشان شا بانگەوازی ئەمانی دا کتێبەکانی ئەهلی

---

(1) لۆنگریك بە هەڵەدا چووە دەڵێ "شەوی 28 ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی 1623 دەرگەی شار بۆ سەربازانی ئێران کرایەوە"، بڕوانە: ستيفن هميسلي لونگريك، المصدر السابق،ص 77.

(2) يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، المصدر السابق، *صص*475-476 (لەوانەیە لەنگریك بێ).

(3) ستيفن هميسلي لونگريك، المصدر السابق، 78

سوونەی کۆکردنەوە و فرێدانە ناو دیجلە تا خەڵك بەسەریدا بڕۆن و پاشان فەرمانی دەرکرد بە ڕوخاندنی گومەزی ئیمامی ئەعزەم و قوبەی شێخ عەبدولقادر گەیلانی و پاتشای بەغدا[1].

دوای ئەوەی سوپای سەفەوی توانی بەغدا داگیر بکاتِ، شا زیارەتی عەتەبە پیرۆزەکانی کرد و گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی، دوای ئەوەی سەفی قلی خانی وەك والی بەغدا دامەزراند و پاش ئەوە دەستی گرت بەسەر بەشێکی کوردستان (کەرکوك) و مووسڵدا گرت. تەنانەت لە بڕێك سەرچاوەدا هاتووە هێزێکی ئێرانی توانیویە دەست بەسەر چەندین ناوچەی بەرفراوانی کوردستاندا بگرێت و تا دەوروبەری ئامەد و ماردین ڕۆیشتوون[2]. بەم شێوەیە داگیرکردنی بەغدا بوو بە مەترسی و زیانێکی گەورە بۆ دەوڵەتی عوسمانی[3].

وێڕای ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی لەناو تەنگژەیەکی گەورە و نا ئارامیی ناوخۆییدا دەژیا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە ساڵی 1625 هەوڵی بەردەوامی بوو بۆ داگیرکردنەوەی ویلایەتی بەغدا و عوسمانییەکان دەستەوەستان نەوەستان لەبەرانبەر داگیرکردنی سەفەوی بۆ بەغدا، دوو لەشکرکێشیی سەربازییان دەست پێ کرد بۆ گێرانەوەی ویلایەتی بەغدا. ساڵی 1625 ی زایینی (1035 ك) سەرکردایەتیی لەشکرکێشییەکی سەربازیی بە سەدری ئەعزەم (حافیز ئەحمەد پاشا) سپێردرا بۆ هێرشی لەشکرکێشیی بەرەو

---

[1] ستیفن همیسلي لونگریك، المصدر السابق، ص 77 (پەراوێزی وەرگێری عەرەبی).

[2] کامیران عبدالصمد الدوسکی، المصدر السابق، ص 167.

[3] هاممر، دولت عثمانیه تاریخی، مترجمی: محمد عطا، ج 9، أوقاف اسلامیه مطبعه سی، استانبول، 1335، صص20-25.، مرتضی افندی نظمی زاده، المصدر السابق، صص 218-221.، یلماز اوزتونا، تاریخ الدولة العثمانیة، المصدر السابق، صص475-476.

بەغدا. ناوبراو لەڕێگەی مووسڵەوە گەیشتە کەرکووک، کە لەوێوەوە بڕێک لە میر و بەگە کوردەکان بەگەڵ لەشکرکێشییەکە کەوتن. عوسمانییەکان توانیبوویان پێشتر دەست بەسەر ئەم دوو شارەدا بگرنەوە. حافیز پاشا دوای ئەوەی بۆ زامنکردنی گەیاندنی ئازووقە و یارمەتی بڕێک لە هێزەکانی خۆی لە کەرکووک بەجێهێشت بەرەو بەغدا بەرێکەوت بۆ ئەوەی لە تشرینی دووەمی 1625 گەمارۆی بدات. بەڵام لەبەر کۆمەڵێک هۆکار گەمارۆدانەکە ئەو ئەنجامە ویستراوەی نەبوو، لەوانە ئەڵقەی گەمارۆدانەکە وا مکوم نەبوو و ڕێگەی گەیاندنی یارمەتی بۆ سوپای عوسمانی لەلایەن هێزەکانی سەفەوی گیرابوو و جگە لەوەش یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەی سوپای ئینکیشاری هۆیەکی دیکەی شکستخواردنەکە بوو. دواجار حافیز پاشا ناچار بوو دوای چەندین مانگ لە گەمارۆ و دوای شکستخواردنی لە پێکدادانەکانی لەگەڵ سوپای سەفەوی گەمارۆکە واز لێبهێنێت و لە هاوینی ساڵی 1626 کشایەوە بۆ مووسڵ[1].

دووەمین هەوڵدان لەلایەن عوسمانییەکان بۆ دەستبەسەرداگرتنەوەی بەغدا ئەو لەشکرکێشییە بوو کە بەسەرکردایەتیی سەدری ئەعزەم خەسرۆ پاشا بەڕێوەچوو. دوای ئەوەی ناوبراو لە مووسڵ هەموو ئامادەکارییەکی بۆ لەشکرکێشییەکە تەواو کرد و ژمارەیەک لە میر و بەگی کوردان بەخۆیان و هێزەکانیانەوە بەگەڵ لەشکرکێشییەکە کەوتن[2].

سەدری ئەعزەم لە (19 ذیلقەعدەی 1038 ك/10 تەمموزی 1629ز) ئیستەنبوولی بەجێهێشت بەرەوە میحوەری باشووری: قۆنیە-ئەنتاکیە- حەلەب- مووسڵ و شارەزوور بەڕیکەوت و لە شارەزوور قەڵای گوڵعەنبەری دروست

---

[1] د.سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص 285-286

[2] لەوانە میری بادینان سیدی خان و میری سوران میرە بەگ و سەرۆکی هۆزی کوردیی باجەلان. بڕوانە: هامەر، هەمان سەرچاوە، ج 9، ص 111

کردەوە[1]. سەرکردەکانی سوپاکەی خەسرۆ پاشا لە نزیك ئەربیل (هەولێر) ئەنجوومەنێکی حەربی یان ڕێکخست و پێشتر هەردوو حاکمی هەولێر و کەرکووکی سەفەوی هەڵاتبوون بۆ بەغدا. لەبەر فشاری میری ئەردەڵان بۆسەر هێلی پشتەوەی سوپا و بارانی زۆر کە هەموو ڕێگەی بەغدا ببوە قوڕاو بڕیاردرا یەکەمین جار هێرش بکرێتە سەر لایەنگیرەکانی ئێران لە شارەزوور و دەوروبەری[2]. بەم جۆرە سەدری ئەعزەمی عوسمانی لە بریتی لەشکرکێشی بۆسەر ئامانجی سەرەکی (بەغدا)، بۆ ڕزگاربوون لە هەڕەشەوگوڕەشەی میری ئەردەڵان (خان ئەحمەد خان)، کە لایەنگیری سەفەوییەکان بوو بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر شارەزوور، کە میری ناوبراو هەرەشەی لە هێلی پشتەوەی سوپای عوسمانی دەکرد ئەگەر دەستی بەسەر شارەزووردا نەگرتبوایە. ئەمە ستراتیژیەتی ناوچەکانی کوردستان بوو لەم هاوکێشە عەسکەرییانەدا و وەختایەک سوپای عوسمانی گەیشتە شارەزوور خەسرۆ پاشا توانی بەبێ شەڕێکی ئاوها کە شایەنی باسکردن بێت دەست بەسەر زۆربەی ناوچەکانیدا بگرێت[3]. بەجۆرێک زۆر لە میرە کوردەکان وەلائی خۆیان بۆ سوڵتانی عوسمانی ڕاگەیاند و زۆرێک لە میرە ئەردەلانییەکانی ملکەچ نەبوو بۆ ئەحمەد خانی ئەردەڵان گوێڕایەڵیی خۆیان نیشاندا. مێژوونووسی تورک کاتب چەڵەبی ناوی هەموو ئەو میرو بەگە کوردانەی نووسیوە، کە پێبەندیی (وەلاء) و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی دەربڕیووە لەوانە حاکمانی: هاوار، کەستانە، شارباژێر، دەمیرقەبۆ، جناد، خۆسیر، هەزارمێرد، دلجۆران، مەرکارە،

---

(1) محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص، 215

(2) ستيفن هميسلي لونگريك، المصدر السابق، ص 87

(3) هەمان سەرچاوە، ج9، ص 110-113، د.سعدى عثمان، كوردستان الجنوبيه...، ص286-287.

حەریر، دوین، تیل، تاری، زەنجیر، مەنزل عەجوز، ئەریوان، پلنگان، باسکی، دۆران، قزڵجە قەلعە، قەلعە غازی، چنارکدۆکی[1]. دوای ئەوەی سەدری ئەعزەم خەسرۆ پاشا شارەزووری کرد بە بارەگە و ناوەندیی مۆڵدانی هێزەکەی، چەندین ڕەتل سوپای نارد بۆ پەلاماردانی میرنشینی ئەردەلان و قەڵای سەختی میهرەبان کەوتە دەست سوپای عوسمانی[2].

لەبەرانبەردا سەفەوییەکان و خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی سوپایەکی 45 هەزار جەنگاوەریان ئامادەکرد و بەرەو ڕووی سوپای عوسمانی بوونەوە و لەنزیک میهرەبان شەرێکی خوێناوی ڕوویدا و لە ئەنجامدا سوپای ئێران و خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان بەشکاوییەوە پاشەکشەیان کرد و چەندین هەزار کوژراویان لەدوای خۆیانەوە لە گۆرەپانی جەنگ بەجێهێشت. داگیرکردنی کوردستان لەلایەن سوپای عوسمانییەوە بە ئامانجی دابینکردنی هێڵەکانی پشتەوەی سوپایی بوو بۆ ئامادەسازی بۆ لەشکرکێشی بۆسەر بەغدا. شایانی گوتنە سوپای عوسمانی وێرای سەرکەوتنیان لە قەڵای میهربان و چوونە ناو خاکی دەوڵەتی سەفەوییەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سوپای عوسمانی لە چەندین هەوڵی لەشکرکێشی چەندین بارەبوویدا بۆ داگیرکردنەوەی شاری بەغدا سەرکەوتوو نەبوو، ئەمە وای کرد لە تشرینی دووەمی ساڵی 1630سوپای عوسمانی بکشێتەوە بۆ مووسڵ و بۆیە ئەمە ڕێگەی بۆ سوپای ئێرانی و میر ئەحمەد خانی ئەردەڵان خۆش کرد تا جارێکی دیکە دووبارە دەست بەسەر

---

[1] فذلکە کاتب چلبی، الجزء الثانی، ص 119 (ڕاگوێزراوە لە: علاء نورس: المصدر السابق، ص 45)، بەداخەوە بۆ ڕاستکردنەوەی هێندێک لەم نێوانە هیچ زانیارییەکمان لەبەردەستدا نەبوو، بۆیە ئەم کارە جێدەهێڵم بۆ ڕاستکردنەوە و پێوەچوونی پسپۆرەیلی بواری جوگرافیناسە مێژوویەکانمان.

[2] علاء نورس، المصدر السابق، ص 45.

ناوچەی شارەزوور دابگرنەوە[1].

شکستهێنانی سوپای عوسمانی لە داگیرکردنەوەی بەغدا، ئیستەنبوولی شڵەژاند، لەم سۆنگەیەوە یاخیبوونی سوپای ئینکشاری لەناوەوە هێز و دەسەڵاتی عەسکەریی عوسمانی کلۆرکردبوو، بۆیە تاوەکو ساڵی 1638 سوپای عوسمانی نەیتوانی شاری بەغدا داگیر بکاتەوە. بەم چەشنە خەمی گەورەی سوڵتان مورادی چوارەم (1623-1640)، دوای ئەوەی دەستی بەسەر پشێوییەکانی ناوەوەدا گرت و کۆنترۆڵی یاخیبوونەکانی سوپای کرد، داگیرکردنەوەی شاری بەغدا بوو و بۆ ئەم مەبەستە کەوتە هەڵپەی ئامادەسازیی بۆ داگیرکردنەوەی بەغدا. دوای مردنی شا عەبباس (19 کانوونی دووەمی 1629-مازەندەران)، شا سەفی (1629-1642ز) دەسەڵاتی گرتە دەست و بەرەورووی پشێوییەکانی خوراسان بووبۆوە. لەولای دیکەوە سوڵتان مورادی چوارەم سەرکەوتوو بوو لەوەی ئەمن و ئاسایش بگێڕێتەوە بۆ وڵاتی شام و دوای ئەوەی بزووتنەوەی فەخرەدین ئەلمعینی لەناو برد، ئامانجێکی دیاریکراوی لەبەرچاو گرت ئەویش شەڕوجەنگینی شیعە بوو. لەپێناو ئەم ئامانجەدا فەتوایەکی لە شێخی ئیسلام نوح ئەفەندی کوڕی ئەحمەد زادە وەرگرت، کە ڕێگەی شەڕی شیعەی دەدا بەوپێیەی ئەوانە لە "ڕافزییەکانن". لەم فەتوایەدا هاتووە" ئەم ڕافزییانە ڕێگر و گومڕا و بکەری تاوانی گەورەن"[2].

سوڵتان مورادی چوارەم لە 8ی مایسی 1638 بەخۆی سەرکردایەتیی لەشکرکێشییەکی لەڕادەبەدەر گەورەی کرد بۆ گرتنەوەی بەغدا. سوڵتان موراد بەناو خاکی کوردستانەوە لە دیاربەکرەوە بەرەو بەغدا هەڵکشا، سوپای

---

[1] هاممەر، المصدر السابق، ج 9، ص 112-124.، مرتضى افندى نظمى زادە، المصدر السابق، ص 225-226.

[2] وجيه كوثراني، المصدر السابق، ص 80

عوسمانی ئامادەکرا و پلانی سەربازیی دانرا و ڕێگەکە بۆ (110) قوناغ دابەش کرا. حەلەب نیوەی ڕێگەکە بوو و سوپاکە شانزە ڕۆژ لەوێدا پشوویان دا. دوای ئەوە لەشکرەکە لە هەردوو زێیی گەورە و بچووك پەڕییەوە و چووە ناو کەرکووك و لە حەمرینەوە چووە خالص و لە 15 ی تشرینی دووەمی ساڵی 1638 لە دەوروبەری بەغدا خێمەی هەڵدا[1] و گەیشتە بەردەم دەروازەی شاری بەغدا و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی شارەکەی دا. دوای چل ڕۆژ جەنگ و پێکدادان، لە 25 کانوونی یەکەمی 1638دا بەغدا لەلایەن سوپای عوسمانییەوە بۆ دووەمجار داگیر کرایەوە. لە شوباتی 1639 سوڵتان مورادی چوارەم بەغدای بەجێهێشت و جارێکی دیکە بەغدای گەڕاندەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دوای ئەوەی ماوەی پانزە ساڵ (1624-1638 ز) لەژێر دەسەڵاتی سەفەویدا بوو[2]. زۆر لە سەرچاوە مێژووییەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە کورد بەشدارییەکی بەرچاوی هەبووە لەم لەشکرکێشییەدا، کە بوو بە سۆنگەی گەڕاندنەوەی شاری بەغدا بۆ باوەشی دەوڵەتی عوسمانی[3]. بەگوێرەی لۆنگریك "سوڵتان موراد لە بەغدا هەموو ئیرانییەکانی سەربڕی، هیچ ئێرانییەك نە لە ئۆردوو و نەلە شار و دەوروبەری نەمایەوە"[4].

بەگوێرەی ئۆزتونا زیانی عوسمانییەکان لە هێرشی گرتنەوەی بەغدا کوژرانی پێنج هەزار 5000 سەرباز و برینداربوونی نزیکەی دە هەزار 10.000

---

(1) ستيفن هميسلي لونگريك، المصدر السابق، صص 93-94

(2) هاممەر، المصدر السابق، ج9، ص 248-261.، عباس العزاوی، تاریخ العراق بين احتلالين، مج 4، بغداد، 1949، ص 213-215.

(3) عباس العزاوی، تاریخ العراق، مج 5، ص 43، یاسین العمری، زبده الاثار الجليه في الحوادث الارضيه، تحقيق د.عماد عبدالسلام رؤوف، النجف، 1974، ص 67.

(4) ستيفن هميسلي لونگريك، المصدر السابق، ص 98

سەرباز بووە و نزیکەی دە هەزار 10.000 سەربازی ئێرانیش کوژراون[1]. هەرچی لای لۆنگریکە ژمارەی کوژراوەکان زۆر لەوە زیاترە و گەیشتۆتە سی هەزار کەس[2].

داگیرکردنەوەی بەغدا و تێکشکانی ئێران لەناو بەغدا، تای هاوکێشەی فراوانخوازیی هەردوو دەوڵەتی شەڕکاری لاسەنگ کرد و لانکهارت لای وایە نەبوونی سەرکردەی شایستە و خاوەن ئەزموون یەکێك لە هۆیەکانی شکستی ئێران بوو لە جەنگ لەگەڵ عوسمانییەکان بۆیە ساڵی 1639، کە دەوڵەتی سەفەوی بەغدای لە دەست دا دواتر هەموو وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکەش (میزۆپۆتامیا)ی لە دەست دەرچوو[3]. لە سۆنگەی ئەم شکستەوە ئاشتییەک دوای شکستێکی گەورەی ئێران خۆی هێنایە پێشەوە. بەجۆرێک شای ئێران، شا سەفی خانی سەفەوی ناچار بوو خۆی پەیوەندی بە عوسمانییەکانەوە بکات و داوای ئاشتییان لێبکات و زیاد لە چەند جارێکیش بە نوێنەرایەتیی محەممەد قولی خان، تەتەری هەنارد بۆ لای سەدری ئەعزەم، مستەفا پاشا لە بەغدا و داوای لێ کرد پەیماننامەی ئاشتی لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا مۆربکەن[4]. سەدری ئەعزەم، مستەفا پاشا بە خۆیی و سوپاکەیەوە لە بەهاری 1639 بەغدای جێهێشت و لە ڕووباری دیالە پەڕییەوە و لە 14ی نیساندا گەیشتە شارەبان، لەنزیک شارەبان لە 23ی نیسانی 1639 بەساردییەکەوە پێشوازی لە وەفدێکی

---

[1] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمه: عدنان محمد سلمان، ج 1، منشورات مؤسسه فيصل للتمويل، تركيا، اسطنبول، 1988، ص 481

[2] ستيفن هميسلي لونگريك، المصدر السابق، ص 98

[3] لانكهارت، انقراض سلسه صفويه، ت: اسماعيل دولتشاهی، ض 2، تهران 1380، ص 21

[4] مرتضى أفندى نظمى زاده، المصدر السابق، ص 235

ئێران، بەسەرۆکایەتیی محەممەد قولی خان کرد، کە بۆ وتوویژ هاتبوو[1] و لە بارەگەی سەدری ئەعزەم وتوویژەکانی ئاشتی دەستی پێ کرد[2]، بەڵام ئەم کۆبوونەوەیە هیچ ئەنجامێکی وای نەبوو بۆیە بڕیاردرا کۆبوونەوەیەکی دیکە لە قزلرەبات ببەسترێ[3]. لە قۆناغەکانی دواتردا لایەنی عوسمانی پێی لەسەر ئەوە داگرت، کە دەبێ سوپای ئێران لە دەرنە و دەرتەنگ بکشێتەوە و ددان بە مافی بندەستبوونی قەڵای قارس بنێ بۆ دەوڵەتی عوسمانی وەکو مەرجێکی بنچینەیی بۆ چوونە ناو موفاوەزاتەوە. هەرچی وەفدی ئێران بوو هەموو هەوڵی ئەوەبوو ناوچەکانی دەرنە و دەرتەنگ بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی سەفەوی، بەڵام سەدری ئەعزەم زۆر بەتووندی ئەمەی ڕەتکردەوە. دواتر ئێرانییەکان لەبارەی قەڵای قارس[4] ، پێشنیازیان کرد یان ئەوەتا ئەم قەڵایە بگێڕنەوە بۆ دەسەڵاتی سەفەوی یان ئەوەتا بەشێوەیەکی تەواوەتی وێرانی بکەن. بەڵام وەفدی عوسمانی زۆر بەتووندی ئەمەی ڕەتکردەوە و هەڕەشەی ئەوەشی کرد، کە لەشکرکێشی دەکات بۆ سەر ئێران و درێژەی پێدا: "ئێوە هاتوون داوای ئاشتی دەکەن و کلیلی (دەرتەنگ)تان نەهێناوە! ئاشتی بەبێ بەدەستەوەدانی کلیلەکان و کشانەوەی ڕۆستەم خان لە خانەقین نایەتەدی"![5] دواى ئەمە وەفدی ئێرانی

---

[1] علي شاكر علي، تاريخ العراق في العهد العثماني، الطبعه الأولى، الموصل، 1985، ص 77.

[2] حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 70.

[3] علي شاكر علي، المصدر السابق، ص 77.

[4] دەوڵەتی سەفەوی زۆر هەوڵیدا عوسمانییەکان بەوە ڕازی بکات قەڵای قارس بروخێنن بەوپێیەی هەڕەشە لە ئاسایشی خاکی ئێران دەکات بەڵام لایەنی عوسمانی بەم پێشنیازە ڕازی نەبوو. بڕوانە: جابر الراوی، المصدر السابق، ص 212.

[5] حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 70.

گەڕایەوە لای شا سەفی خانی سەفەوی بۆ ئاگادارکردنەوەی لایەنی ئێرانی لەبارەی بیروڕای لایەنی عوسمانی. نووسیاری کرۆنیکی نەعیما باسی ئەوە دەکات، کە سەدری ئەعزەم، موستەفا پاشا دوو نامەی نووسیوە یەکەمیان بۆ ڕۆستەم خانی، سوپاسالاری ئۆردووی ئێران لە دەرتەنگ و دەرنە و دووەمیشیان بۆ شا سەفی خان و داوای کردووە وەلامی یەکەمیان لەماوەی سێ ڕۆژ و دووەمیشیان لەماوەی شەش ڕۆژدا وەلام بدرێنەوە[1]. لە 4ی ئایاری 1639دا سوپای سەفەوی لە ناوچە کوردییەکانی دەرنە و دەرتەنگ کشایەوە، لە 14ی ئایار، تەتەری ئێران، سارۆخان لە زەهاو (قەسری شیرین) چاوی بە سەدری ئەعزەم موستەفا پاشا کەوت و ڕەزامەندی شا سەفی خانی لەسەر داواکانی عوسمانی دەربڕی و ئامادەی وڵاتەکەشی دەربڕی بۆ کۆتایی پێهێنان بە ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت[2] . دواجار لە 17ی ئایاری 1639دا (14 موحرەم 1049ک) پەیماننامەی زەهاو لەلایەن سارۆخان و سەدری ئەعزەم[3] بەهەردوو زمانی تورکی و فارسی[4] مۆرکراو و هەمان ساڵ لەلایەن هەردوو

---

(1) علي شاكر علي، المصدر السابق، ص 77.

(2) المصدر نفسه، ص 78.

(3) دەگێڕنەوە وەختایەک سەدری ئەعزەم، مستەفا پاشا لە سەرەتای ساڵی 1640 دەگاتەوە ئیستەنبووڵ، سوڵتان موڕادی چوارەم بەگەرمی باوەشی پێدا دەکات بۆ ئەو سەرکەوتنەی لە گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی بەدەستی هێناوە، بگەڕێوە بۆ: علي شاكر علي، تأريخ العراق في.... هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص: 78

(4) هەردوو تێکستی ئۆرگینالی تورکی و فارسی پەیماننامەی زەهاو لە سەردەمێکی نادیار پێش ساڵی 1843 ونبوون. دانەیەکی ئۆرگینالی ئەم پەیماننامەیە بەمۆری سەدری ئەعزەم، مستەفا پاشا ئێستا لە کتێبخانەی شاهانەی ڤیەننا لە نەمسا پارێزراوە. بڕوانە:
EDMONDS, C, J., Kurds Turks and Arabs, travel and research...... op. cit, p. 125.

دەوڵەتەوە واژۆی پەسندکردنی لەسەر کرا، شا سەفی (1629-1642) لە 21 ی ئایاری 1639 موسادەقەی لەسەر پەیماننامەکە کرد و پاشان نێردرا بۆ سوڵتان مورادی چوارەم، لە 3 ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا ئیمزای لەسەر کرد. شایانی گوتنە دواتر ئەم پەیماننامەیە بوو بە بنەوانێك بۆ هەموو ئەو پەیماننامانەی دوای ئەو هاتن تا ئیمزاکردنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم (31 ی ئایاری 1847)[1]. پەیماننامەی زەهاو (قەسری شیرین) چ لە ڕووی شێوە و چ لەڕووی بابەتەوە هەموو مەرجە یاساییەکانی پەیماننامە نێو دەوڵەتییەکانی تێدابوو[2].

بەم شێوەیە ئیمپراتۆریای عوسمانی بەشکاوییەوە ئیمپراتۆریای سەفەوی هێنایە سەرمێزی وتووێژ و هەردوولا لە زەهاو[3] بۆ دیاریکردنی کێشە هەڵپەسێردراوەکانی سنووری نێوانیان پەیماننامەیەکی ئاشتییان مۆرکرد. شایانی گوتنە هەم پەیماننامەکە خۆی لەناو خاکی کوردستان مۆرکراو و هەم تەواوی

---

بۆ دەقی تەواوی تورکی پەیماننامەکە بگەڕێوە سەر دەستنووسی: م. ئا. نەعیمە، تاریخی نەعیما. لاپەڕەی: 349. کتێبخانەی نیشتمانیی پاریس، بۆ تێکستی وەرگێڕاوی فارسی پەیماننامەکەش بگەڕێوە: مشیر الدوله (میرزا سید جعفر مهندس باشی) رساله تحقیقات سرحدیه، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، تهران، 1348، لا: 77- 81، هەروەها بۆ تێکستی تەواوی پەیماننامەکە بە زمانی ئینگلیزی بگەڕێوە بۆ:

HUREWITZ, J, C., Diplomacy in the near and Middle East, a documentary record 1535-1956, t I, London, Oxford, Edition Archive, 1987, pp 21-23.

(1) أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص. 29

(2) جابر الراوي، المصدر السابق، ص 211.

(3) زەهاو: ناوچەیەکی ستراتیژی جیاکەرەوە بوو لەنێوان ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێراندا، بە شێوەیەک کە داگیرکردنی زەهاو، عێراقی عەرەبی دەخستە بەردەم هەڕەشەی زۆرەوە، بڕوانە: ترجمه التقرير الذي قدمه درويش باشا الذي عين لتحديد الحدود الإيرانية العثمانية، بغداد، مطبعة الحكومة، ترجمة: وزارة الخارجية العراقية، بغداد، 1953 ص 23.

بەندەکانی پەیماننامەکەش یەکەمین دابەشکردنی ڕەسمیی کوردستان[1] بوو لەنێوان وڵاتێکی سەرکەوتوو و وڵاتێکی دۆڕاودا، بەشێوەیەک پەیماننامەکە تەنیا ناوی سەدری ئەعزەم، مستەفا پاشای بەسەرەوەیە و هیچ ناوی لایەنی ئێرانی بەسەرەوە نییە. تەواوی بەندەکانی پەیماننامەکەش تایبەتن بە دابەشکردنی کوردستان لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا. دیارە دەبێ لێرەدا ئەم تێبینییەش بخەینە بەرچاو کە نە لە پەیماننامەی زەهاو و نە لە هیچ کام لە پەیماننامەکانی دیکە کە سەروبەر لەسەر چارەنووس و دابەشکردنی خاکی کوردستان لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا دەبەستران، کورد لێیان ئاگادار نەبوو و هیچ نوێنەرێکی گەلی کوردییان بەهیچ کلۆجێ تێدا بەشدار نەبووە.

ئەم پەیماننامەیە بەتەواوی کوردستانی لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریا دابەشکرد، بەگوێرەی بەشەکانی ئەم پەیماننامەیە دەوڵەتی عوسمانی دەستی گرت بەسەر هەموو ناوچەکانی: جەسسان، بەدرە، مەندەلی، دەرنە، دەرتەنگ، سەرپێل و هەموو ئاواییەکانی ڕۆژئاوای قەڵای زنجیر و تا قەڵای زەڵم و دەوروبەری لە ناوچەی شارەزوور دا گرت، هەروەها هەموو ئەو چیایانەی بەم قەڵاوە دەورە درابوون تا دەگاتە ئەو دەربەندەی کە دەگاتە شارەزوور و دەبێتە خاڵی جیاکەرەوەی نێوان هەردوو دەوڵەت. ئەمە وێڕای ئەوەی کە بە گوێرەی پەیماننامەکە دەوڵەتی ئێران بەهیچ شێوەیەک هەقی دەستێوەردانی نییە لە کاروباری قەڵای قزڵجە و دەوروبەری، هەروەها هەموو ناوچە و قەڵا و چیا و قوللە کوردییەکانی ئەیالەتی ئەخسخە، قارس، وان، شارەزوور، بەغدا، لەگەڵ ئەوەی بەسرەش هەر لەژێر قەڵەمڕۆی ئیمپراتۆریای عوسمانی دەمێننەوە. زیاد لەوە کارەکە لە ناوچە و شارەکانیشی ڕەتکرد تا کار گەیشتە ئەوەی تەنانەت

[1] ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، ئەم پەیماننامەیە تەنیا بۆ دابەشکردنی کوردستان بوو، چونکە بە هیچ جۆرێک باسێک لەسەر کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی لە ناوچە عەرەبییەکانی خوارووددا نییە.

هەردوو دەوڵەت هۆزە کوردەکانیشیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد، بەم شێوەیە هۆزی گەورەی (جاف)یان کرد بەدوو بەشەوە و هەربەشێک بوو بەموڵکی دەوڵەتێک[1] لە ئەنجامدا ئەم دابەشبوونەی هۆزە کوردییەکان لە دواییدا بوو بەهۆی سەرچاوەی گەلێک گێرمە و کێشەی سنووریی بۆ هەردوو دەوڵەت[2].

هەرچی قەڵاکانی بەشی دووەمی مەندەلی، دەرتەنگ، بیرە، زەردوویی، زمرد هاوا و قەڵا و دارستانەکانی ڕۆژهەڵاتی قەڵای زنجیر و میهرەبان بوون بەر دەوڵەتی سەفەوی کەوتن[3] کە تا ڕۆژی ئەمڕۆش ئەو دەروناوچانە هەر لە بندەستی دەوڵەتی ئێراندا ماونەتەوە. لە شارەزوور "هێزەکانی عوسمانی هەموو ئەو لووتکە چیایانەیان داگیر کرد، کە دەیانڕوانیە سەر قەڵای زەڵم"[4] لە کاتێکدا هەورامان و ئاواییەکانی هەورامان بۆ دەوڵەتی ئێران مانەوە.

لەلایەکی دیکەوە، بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە پێویست بوو کۆمەڵێک قەڵای کوردستان بڕوخێندرێن، ئێرانییەکان دەبوو قەڵای زنجیر لەسەر چیای زنجیر بڕوخێنن، هەرچی تورکەکانە دەبوو قەڵا و قوولەی قوتوور، ماکۆ و مەگاز بیغزد لەسەر سنووری وان و قارس بڕوخێنن[5].

---

[1] هۆزی زیادین هارونی بوون بە جافی بندەستی عوسمانی (جافی مورادی) و هەرچی جافی پیرەزودی هەمان عەشیرەت بوون، بوون بە جافی بندەستی ئێران (جافی جوانرودی)، بگەڕێوە بۆ: عباس العزاوی. عشائر العراق، الجزء الثانی (العشائر الکردیة)، بغداد، 1947، ص 43

[2] ترجمە تقریر درویش باشا، ص 32.

[3] شاکر صابر الضابط، المصدر السابق، ص 34.

[4] المصدر نفسه، ص 36.

[5] HAMMER, DE., Histoire de L'empire ottoman depuis son origine jusq'a nos jours, traduite de L'allemande sur la deuxieme edition, Paris, t II, 1844, p. 490.

ئەم پەیماننامەیە بۆ یەکەمجار دابەشکردنی سنووری لەنێوان هەردوو دەوڵەت لەسەر بنەمای ناوچەکانی سنوور* دیاری کرد نەک لەسەر بنەوانی هێڵێکی دیاریکراوی سنوور، کە بەشێوەیەکی ئاسایی لە قەڵەمڕۆی دەوڵەتێکەوە دەستپێدەکات و بەقەڵەمڕۆی دەوڵەتێکی دیکە کۆتایی دێت. بەم جۆرە ناوچەکانی سنووری نێوان هەردو دەوڵەت جێگیر کران و ئەمە ئیدی بوو بە بناغەیەک بۆ هەموو پەیماننامەکانی دوای ئەوە. بەڵام ڕاستیەکیش هەیە، کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین ئەویش ئەوەیە ئەم پەیماننامەیە هەر لە یەکەم ڕۆژی مۆرکردنییەوە گەرای کێشە و دەستێوەردانی دواتری لەناوخۆیەوە هەڵگرتبوو، بەڵام وێرای هەموو ئەمانە ئەم پەیماننامەیە لە هەموو پەیماننامەکانی دیکە ڕەسمی تر و ئاشکراتر بوو و توانی بۆ ماوەی هەشتا ساڵ جەنگ و کوشتار لەنێوان هەردوو دەوڵەت ڕابگرێت بێ ئەوەی هیچ جەنگێکی ڕاستەقینەی ڕاگەیندراو لەنێوانیاندا دروست ببێت. ڕاستییەکەی دوای پەیماننامەی زەهاو پەیوەندی سەفەوی-عوسمانی ئاشتیانە بوو لەو ساڵانەی، کە لە تەمەنی حوکمڕانی شا سەفی مابوو هەموو بەرەکانی جەنگ ئارام بوون ئەو پەیوەندییە سیاسییە هێمنانەی لەنێوانیان دا هەبوو هەموو ئەو تەنگژە نوێ و لەناکاوانەی کە دەهاتنە پێشەوە قووت دەدا. لایەنی سەفەوی لە پیادەکردنی ئەم شێوازە سیاسییە دۆستانەیە دەستپێشخەرتر بوون، کاتێك سوڵتان موورادی چوارەم مرد، شا سەفی وەفدێکی بۆ لای سوڵتان ئیبراهیمی یەکەم نارد (1051-1058ك/1640-1648ز)، کە شوێنی سوڵتان موورادی چوارەمی گرتەوە و پرسەنامەی خۆی پێشکەش کرد و پیرۆزبایی جێنشینبوونی لێ کرد. شا لەمەدا ئامانجی ئەوەبوو پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ سوڵتانی نوێی عوسمانی درووست بکات. بۆ دەربڕینی نیازچاکی خۆی بەرانبەر بە شا سەفی، سوڵتان ئیبراهیمی یەکەم هەموو ئەو دیلانەی ئازاد کردن، کە سوڵتان موورادی چوارەم لەکاتی

*zones de frontieres

دەستبەسەرداگرتنی بەغدا زیندانیی کردبوون و تەسلیم بە بالیۆزی ئێرانی کردنەوە[1]. ئەوەی شایانی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە، کە دوای ئەم پەیماننامەیە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت بەرەو حاڵەتێکی ئاشتی و ملدان بۆ یەکتری دەڕۆیشت، لە ڕاستیشدا هۆی ئەم مەیلە بۆ ئاشتی ئیرادەی عوسمانی و سەفەوی نەبوو، بەڵکو بەهۆی ئەو نابوودی و لاوازییە بوون، کە هەردوو دەوڵەت بەدەستییەوە گیرۆدە بوون. دوای سوڵتان مورادی چوارەم، ڕەوشی دەوڵەتی عوسمانی لە پاشەکشەدا بوو و بەدەست زنجیرەیەك کێشەگەلی بالقانییەوە گیرۆدە بوو. هەرچی (شا)کانی دواتری سەفەوی بوون بێ توانا بوون لە بەردەوامی دان بە جەنگێکی ئیستینزافی لەگەڵ عوسمانییەکان. شا عەبباسی دووەم (1642-1666ز) سەرقاڵی کێشە ناوخۆییەکانی ئێران بوو. پەیوەندی ئاشتییانەی لەگەڵ عوسمانییەکان ڕاگرتبوو و هەروەها کوڕەکەی شا سەفی دووەم ( 1666-1694ز) بەهەمانشێوە. هەروەها لەگەڵ شا سوڵتان حوسین (1694-1722ز)یش ڕەوتی ئاشتی نێوان هەردوو دەوڵەت بەردەوام بوو، بەڵام ڕووداوەکان لەسەردەمی ئەودا بە وەرچەرخانیکی نوێدا ڕۆیشتن، شا حوسین ڕۆلیکی باڵای دابوو بە فوقەهای شیعە، کە ئەوانی پێش خۆی تا ئەو ڕادەیە ئەو ڕۆڵەیان نەدابوونێ و هەروەها زیاتر لەوانی دیکە دووپاتەی تاکانیەتی مەزهەبی شیعەی دەکردەوە بۆ دەوڵەت[2].

وادیارە سەفەوەییەکان پەرۆشی ڕاگرتنی ئەو پێوەندییە باشە بوون، کە دوای پەیماننامەی زەهاوی 1639 لەگەڵ عوسمانییەکان هاتبووە ئاراوە و عوسمانییەکانیش بەهەمانشێوە. ساڵی 1656 شا عەبباسی دووەم (1642-1667 ز) دیاری بۆ سوڵتانی عوسمانی نارد و بەنێردراوێکدا نامەیەکی بۆ نارد و داوای

---

[1] محمد سهيل طقوش، تاريخ الدولة الصفوية (في ايران) 907-1148 ه/1501-1736م، ط 1، بيروت، دار النفائس، 2009، ص 202

[2] وجيه كوثراني، المصدر السابق، ص 81

لێ کرد ئەو ئاشتییەی، کە لەنێوان دوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانیدا هاتۆتەئاراوە بپارێزن، سوڵتان دەستپێشخەری کرد بەوەی وەڵامی داواکارییەکەی دایەوە و بە پەیامبەرەکەی کە وەڵامی سوڵتانی پێبوو بۆ ئێران دیاری بۆ شا عەبباسی دووەم نارد. لەساڵی 1689 ئێرانییەکان نێردراوێکیان نارد بۆ ئەستەنبووڵی پایتەخت بۆ پیرۆزباییکردن لە جێنشینبوونی سوڵتان سلێمانی دووەم (1687-1691 ز) و دووپاتکردنەوەی ڕێسای ئاشتی، کە پەیماننامەی زەهاوی 1639 ی لەنێوان ئەوان و عوسمانییەکاندا هێنایە ئاراوە[1]. بەڵام ڕاستییەکی مێژوویی هەیە، کە دەبێ بگوترێت ئەویش ئەوەیە ئەم پەیماننامەیە بە هیچ شێوەیەک جەنگی هەردوو دەوڵەتی دژ بەهۆز و خێڵەکانی کورد ڕانەگرت و بەپێچەوانەوە ئەم پەیماننامەیە دەستی هەردوو دەوڵەتی کردەوە بۆ لێدانی هۆزەکانی کورد و هەردوولا بەردەوام بوون لە داپڵۆسین و خنکاندنی هەموو "ڕابوون" و "هەستانەوە نەتەوەییەکانی" کورد دژ بە هەردوو دەسەڵاتی دەستەڵاتی ناوەندی. هەردوو لا سووربوون لەسەر ئیلتیزامکردن بە بەندەکانی پەیماننامەکە و لەناوبردنی هەر دەستپێشخەرییەک بۆ بەزاندن و لێوەدەرچوونی. لە ساڵی 1717 هۆزی جاف پەلاماری دەوروبەری ئەیالەتی بەغدای دا و میری باجەلان و دوو لە پیاوەکانی کوشت، لەبەرئەوەی ئەم عەشیرەتە هەڵاتن و دایانە چیاکان، والی بەغدا، حەسەن پاشا نەیتوانی سزایان بدات. لەبەر ئەوەی ئەم هۆزە ئەوکاتە لە ئێران دەژیان و سەر بە ئێران بوون، حەسەن پاشا نامەی بۆ شای ئێران نووسی و سکاڵای لێ کردن، حوکومەتی ئێران دەستپێشخەری کرد سزای بڕێک لە (خانەکان)ی سەر سنووری دا و دووری خستنەوە لەبەر ئەوەی خەمسارد بوون لە ڕێگەگرتن لە پەلاماردانی جاف بۆسەر خاکی عوسمانی[2].

---

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 30

[2] نفس المصدر، ص30

# بەشی سێیەم

## ململانێی ئێرانی-عوسمانی
## لەسەر کوردستان لە سەدەی هەژدەهەمدا

1-3 : ئێران لەسەردەمی داگیرکردنی ئەفغاندا: کورد و ئەفغان.
2-3: کوردستان لەنێوان ململانێی نادر شا و عوسمانیدا.
3-3 : لە پەیماننامەی هەمەدانەوە 1727 تا پەیماننامەی کوردان 1746 .
4-3 : لە ئازادی نیسبییەوە بۆ پاشکۆیایەتی.

## 3-1: دەوڵەتی ئێران لەسەردەمی داگیرکردنی ئەفغاندا: کورد و ئەفغان

لەگەڵ سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا، دوای تێپەربوونی دوو دەیە دەوڵەتی سەفەوی لەبەر یەکهەڵوەشایەوە و ئێران لەنێوان سێ داگیرکاری بێگانەی: ئەفغان، ڕووس و عوسمانیدا پارچە پارچە بوو بوو و هەریەکەشیان بەشێکی لە خاکی وڵاتەکەی بۆ خۆی دابڕی بوو. ئەفغانەکان دەمێک بوو زۆریان تاڵاو بەدەست سوپای سەفەوییەوە چەشتبوو، لەگەڵ سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا هۆزەکانی غیلزای ئەفغانی شاری قەندەهاریان داگیرکرد و دواتر ئەفغانەکان دەستیان بەسەر "هێرات"یشدا گرت و میرنشینی ئەفغانیان دامەزراند[1].

پشێوییە خێڵەکییەکان و ڕاپەڕینی خێڵەکییەکان سەرتاپای وڵاتی ئێرانیان گرتەوە. کوردستانیش بەهەمانشێوە بۆ خۆی لەناو هەستانەوە و ڕاپەڕینێکی خێڵەکیی بێ بەرنامە و بێ ئاسۆبینیدا دەژیا. ئەفغانەکان لەزنجیرەیەک شەڕ و لەشکرکێشیی بۆسەر ئێران، لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی هەژدەهەمدا هێرشیان بۆ سەر پایتەخت برد و لەجەنگی گلناباد (8 ی ئایاری 1722)

---

[1] LORIMER, J, G., Gazettier of the persian golf, Oman, and central arabia, England, l est edition Calcutta, 1915, Historical, paer l B, reprinted, London, 1984, p. 56.

بەتەواوی سوپای سەفەویان تێکشکاند و دواجار لە 21ی تشرینی یەکەمی 1722دا میر مەحموودی ئەفغانی، ئەسفەهانی پایتەختی داگیرکرد و تاجی شای ئێرانی نایە سەر و دیارە لێرەدا دەبێ بگوترێ، کە ئەفغانەکان لەناو ڕووباری خوێنی خەڵکی ئێراندا ئاڵای سەرکەوتنیان لە وڵاتی ئێران هەڵدا[1].

هەردوو هێزی گەورەی ناوچەکە: ڕووسیا و ئیمپراتۆریای عوسمانی لە نزیکەوە چاودێری ڕووداوەکانیان دەکرد و بە ئاگاییەوە چاویان بڕیبووە سبەینێی سیاسیی دەوڵەتی سەفەوی. هەردووکیان دەستیان کرد بە لەشکرکێشیی بۆناو خاکی ئێران: ڕووسیا لە هەرێمەکانی باکوورەوە دەستی بە لەشکرکێشی کرد و هەرچی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوا و باشوورەوە. دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری لەشکرکێشی دا بۆسەر ئێران،ساڵی 1722، والی بەغدا، حەسەن پاشا( 1704-1723 ز) هێرشی بۆ سەر دەوڵەتی ئێران دەستپێکرد، کە بەشی زۆری هێزەکانی والی بەغدا بریتیبوو لە هێزی کوردەکانی شارەزوور، والی عوسمانیی شارەزوور عەبدولڕەحمان پاشا بە هێزەکانی خۆیەوە، وێرای هێزەکانی میر و بەگە کوردەکان کە سەر بە ئەیالەتی ئەو بوون لەم لەشکرکێشییەدا بەشداربوون. سوپای والی بەغدا، بەئاسانی لە 16ی تشرینی یەکەمی 1723دا بەبێ خوێن ڕشتن شاری کرماشانی داگیرکرد[2].
هەر لەم ماوەیەدا میری بابان (خانە بەگ) ڕاسپێردرا سەرکردایەتیی لەشکرکێشییەکی لاوەکی بکات بۆسەر ئەمارەتی ئەردەڵان و توانی بەئاشتیی

---

[1] لەبارەی داگیرکردنی ئەفغان بۆ ئێران بڕوانە: جان مالكم، تاريخ إيران، ت: على رضا شيرازى، هندستان 1323، صص 293-307.

[2] سليمان فائق،" كتاب حروب الإيرانيين في العراق"، تعريب محمد خلوصى بن محمد سعيد الناصرى التكريتى، مجلة "افاق عربية"، بغداد (3، 4)، 1980، ص 102.

بیخاتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانییەوە[1] و بۆ یەکەمجار هەردوو ئەمارەتی بابان و ئەردەڵان یەکیان گرت و سنووریان لە کەرکووکەوە تا هەمەدان درێژ دەبۆوە[2].

هەر لەدرێژەی بەردەوامیی ئەم لەشکرکێشییەدا، سوپایەکی لاوەکی دیکەی کورد بە سەرکردایەتیی عەبدولڕەحمان پاشای والی شارەزوور توانی ناوچەی (خوڕەم ئاباد)، کە ناوەندی میرنشینی لورستان بوو داگیر بکات و بیخاتە پاڵ قەڵەمڕۆی دەسەڵاتی عوسمانییەوە[3].

لەم سەروبەندەدا والی بەغدا (حەسەن پاشا) کۆچی دوایی کرد، بەڵام کوڕەکەی ئەحمەد پاشا شوێنی گرتەوە لە حوکمڕانی ئەیالەتی بەغدا و سەرکردایەتییکردنی لەشکرکێشییەکە و بەردەوام بوو تا لە 31 ی ئابی 1724 شاری هەمەدانی داگیر کرد[4]. هاوکات لەگەڵ ئەم لەشکرکێشیە سوپایەکی دیکەی عوسمانی بەسەرکردایەتی والی وان (عەبدوڵلا کوبریلی زادە) پەلاماری ناوچە شیمالییەکانی سنووری ڕۆژئاوای ئێران دەدا. تا هاوینی 1725 توانی جۆرجیا و ئەرمێنیا و چەند بەشێکی ئازەربایجان و شێروان داگیربکات[5]. بەم شێوەیە ڕۆژئاوا و باکوور-ڕۆژئاوای ئێران و قەفقاسیای باشوور بە قازانجی

---

[1] ماه شەرەف خانم مەستورەی کوردستانی، مێژووی ئەردەلان، و: د.حەسەن جاف و شکور مستەفا،، بەغدا، 1989، ل 89.، د.سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیە...، ص 294، ایضا:

LONGRIG, S, H., Four centuries of modern Iraq, Oxford,.London, 1925, p. 131.

[2] عباس العزاوی، تاریخ العراق بین الاحتلالین، العهد العثماني الثانی، مج5، بغداد، 1953 ص 206- 207.

[3] المصدر نفسه، ص 207.، د.سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیه...، ص 294

[4] سلیمان فائق، المصدر السابق، ص 102-105.

[5] لارنس لاکهارت، انقراض سلسه صفویه، ت: اسماعیل دولتشاهی، ض 2، تهران 1380، ص233.

دەوڵەتی عوسمانی لە دەوڵەتی ئێران داماڵران. ئەم شارە گەورانەی سەرەوە یەك لەدوای یەك دەستیان بەسەردا گیرا. کۆبرلو زادە عەبدوڵڵا پاشا (کوڕی گەورەی سەدری ئەعزەم داماد کۆبرلو-زادە نەعمان پاشا) بەداگیرکردنی تەبرێز ناووشۆرەتێکی گەورەی وەرگرت. بەم شێوەیە لە باکوور 126.000 کیلۆمەتری چوارگۆشە (لە کۆی 290.000 کیلۆمەتری چوارگۆشە) داگیرکرا. سنووری دەوڵەتی عوسمانی گەیشتەوە سەردەمی سوڵتان مورادی چوارەم و سەرلەنوێ سنووری گەیشتەوە زەریای خەزەر. ئەشرەف شاە وەیسی لە پەیماننامەی هەمەدان (1727/10/4) دانی بەهەموو ئەم داگیرکردنانەی عوسمانی دا نا[1]. شایانی گوتنە کوردەکان بەشدارییەکی بەرچاویان بوو لەم سوپایەشدا، هەروەک چۆن لە بەرەی پێچەوانەشدا بەشدارییان هەبوو و لەهەردوو بەرەی شەرەوە قوربانییەکی زۆریان داوە[2].

ڕووسیا و ئیمپراتۆریای عوسمانی خەریک بوو لەسەر ئێران ببێ بەشەڕیان ئەگەر نێوانیکردنی باڵیۆزی فەرەنسیی مارکیز دی بۆناک نەبوایە. بەڵام دواجار لە(24 ی حوزەیرانی ساڵی 1724) هەردوو لایان لەسەر دابەشکردنی ناوچەکانی نفووزیان لە ئێران ڕێککەوتن و پەیماننامەی (رەشت) لەلایەن سەدری ئەعزەم داماد ئیبراهیم پاشا و بالیۆزی ڕووس نیبلۆییف لە بریتی وڵاتەکەی مۆرکرا. لە دووی تەمموز، دی بوناک بە سیفەتی نێوەندیکار پەیماننامەکەی مۆرکرد و نووسخەکانی پەیماننامەکە گۆردڕانەوە. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە ڕووسیا هەموو ناوچە ئێرانییە هاوسنوورەکانی زەریای قەزوێن: ئەستراباد، مازەندەران، گەیلان و بەشێکی شێروان و داغستانیشی بۆ خۆی برد بە دەربەند و باکۆوە. لەکاتێکدا دەوڵەتی عوسمانی دەبوو هەرێمە ڕۆژئاواییەکانی

---

[1] یلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمه: عدنان محمد سلمان، صص 603- 604

[2] د.سعدي هروتي، كوردستان و الامبراطورية...، ص 166.

دەوڵەتی ئێران، جۆرجیا، ئازەربایجان و کوردستان و هەمەدان و کرماشان بۆخۆی ببات. هەرچی (تەهماسپ)ی میراتگری عەرشی سەفەوی بوو هەرێمەکانی دیکەی ئێرانی بۆ هێلدرایەوە بەمەرجێک ددان بە پەیماننامەکەدا بنێت[1]. ئەمە بۆ یەکەمین جار بوو کە دوای جەنگی چاڵدێران، هەموو ناوچەکانی خاکی کوردستان بکەوێتە بندەستی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە. بەڵام زۆری پێنەچوو سەرکەوتنەکانی نادر شای ئەفشار، ئەم پەیماننامەی دڕاند و سنوورەکان گەڕاندەوە سەر دۆخی پەیماننامەی زەهاوی 1639. بەم جۆرە وەک بینیمان دەوڵەتی ئێران لە بن نیری سێ داگیرکاری ئەفغان، ڕووس و عوسمانیدا دەیناڵاند. لێرەدا پرسیارێک خۆی دەهێنێتە پێشەوە داخۆ دەبێ پەیوەندییەکانی ئەفغان و کورد لە چ سەرچاوەیەکەوە ئاو بخۆنەوە؟

شای ئەفغان، میر مەحموودی ئەفغانی بەیارمەتی هێندێ لەسەرۆک هۆزە کوردەکان بەردەوام بوو لە داگیرکردنی خوارووی ئێران، ئەوەی کوردی لە ئەفغان نزیک کردبۆوە بەپلەی یەکەم هاومەزهەبی و هەستی ئایینی و بەپلەی دووەمیش ستەمگەری و ملهوڕی شاکانی ئێران بوو بەرامبەر بە سەرۆکهۆزە کوردەکان. بەڵام ئەم پەیوەندییانە لە پەرەسەندنەکانی دواتردا لە مەحەک دران، لە پاییزیساڵی 1726دا، دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری جەنگ و غەزای دژ بە ئەفغانەکان دەرکرد و داوای لە والی بەغدا، ئەحمەد پاشا (1723-1734) کرد بەر لە هێرشی ئەفغانەکان بگرێت بۆ داگیرکردنی ئێران. سوپای عوسمانی بەسەرۆکایەتیی ئەحمەد پاشا، بە (70) هەزار سەرباز و (70) تۆپی جەنگەوە[2]

[1] علاء نورس، المصدر السابق، ص 109-110.

[2] سەرچاوە مێژووییەکان لەدەستنیشانکردنی ژمارەی سوپاکەدا جیاوازییان هەیە، لۆنگریک دەڵێ سوپای ئەحمەد پاشا بە نوێترین سیستمی سەردەم چەکدار بوون و ژمارەیان لە سەد هەزار ( 100000) سەرباز کەمتر نەبووە، لەگەڵ ئەوەدا کە سوپاکەی

لەشکرکێشی بۆسەر ئێران دەستپێکرد. هێزی جەنگاوەری کورد لەناو ئەم لەشکرکێشییەدا نزیکەی بیست هەزار (20) هەزار جەنگاوەر بووە[1]. ئەمە واتە ڕێژەی 28.5% کۆی سوپاکەی عوسمانی، لە جەنگاوەرانی کورد بووە، خۆ ئەگەر خەمڵینەکەی (سلێمان فایەق)یش لەبەرچاو بگرین ئەوا نزیکەی نیوەی سوپاکەی والی بەغدا لە جەنگاوەرە کوردەکان بووە. متمانەی سوپای عوسمانی لەم جەنگەدا لەسەر هێزی کورد بووە و تاقە هێزیش کە جێگەی متمانەی سوپای عوسمانی بووە بریتیبووە لە هێزی هۆز و میرنشینەیلی کورد. لەمبارەیەوە مێژوونووسی عێراقیی عەبباس ئەلعەززاوی باسی ئەوە دەکات کە (سوپای عوسمانی هیچ هەوڵێکی وای نەدا نە ئەرک و ئامادەکاری بۆ ئامادەکردنی سەربازی زۆر ، متمانەی سوپاکەی هەر لەسەر کوردەکان بووە و لەوانەش میرەکانی ئەردەڵان و حاکمەیلی ئامێدی و میرەکانی دەرنە و میرەکانی باجەلان و میرەکانی جاف و میرەکانی دیکە)[2].

سوپای ئەفغان و سوپای والی بەغدا لە پێدەشتی ئەنجدانی نێوان

---

ئەشرەف ژمارەکەی پێنج یەکی ئەم ژمارەیە بووە، بگەڕێوە: LONGRIG, op.cit, p.133، پورگشتال هامەر پێی وایە سوپاکە حەفتا تا هەشتا (70-80) هەزار سەرباز دەبوون، بڕوانە نەوشیروان مستەفا، میرایەتی...... لا: 61، هەرچی نووسیاری کرۆنێکی (کتاب حروب الايرانيين في العراق)، سلێمان فایەقە دەنووسێ ئەحمەد پاشا پەنجا هەزار (50000) سەربازی لە ئەنادۆڵ و لیوا و ئەیالەتەکان دەستنیشان کرد، ئەمە سەرباری سەربازی ئەیالەت و پەراوێز و سەربازی دیکە، بگەڕێوە: سليمان فائق، المصدر السابق ص 109.

(1) نەوشیروان مستەفا ئەمین، میرایەتیی بابان لەنێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەمدا، چاپی دووەم، سلێمانی 1998، لا: 61

(2) عباس العزاوی، تاریخ العراق بين الاحتلالين، مج 5، ص 219

ئەسفەهان و هەمەدان لەیەکدی گیربوون و جەنگ دەستی پێ کرد. وەک سەرچاوە مێژووییەکان باسی دەکەن کە شەڕ هەڵگیرسا لە جەولەی یەکەمی شەڕەکە وەک ئەحمەد پاشا پێشبینی دەکرد سەرکەوتن بۆ ئەوان بوو، بەڵام لە گەرمەی سەرکەوتنی سوپای عوسمانیدا بوو، کوردەکان بەکۆمەڵ هەموویان لە گۆڕەپانی جەنگەکە کشانەوە، کە ئەمە تای جەنگەکەی لاسەنگ کرد و سەرکەوتنی عوسمانییەکانی کرد بەشوورەیی و تێکشکان[1]. نووسیاری کرۆنیکی (حروب الایرانیین فی العراق) ناوی هەموو ئەو میر و بەگە کوردانەی نووسیوە، کە لەم جەنگەدا کشاونەتەوە و بریتین لە: والی ئەردەڵان خانە محەممەد پاشا و براکەی، موتەسەریفی لیوای بابان، خالید بەگ و حاکمی ئامێدی لەگەڵ میرە کوردەکان و بەگ و بەگەواتی: باجەلان، حەریر، کۆیە، جاف، گەرۆس، ئەسفەند ئاباد، کەلهوڕ، زەنگەنە، سەرتاس، ئاڵتون کۆپری، قزڵجە، شارباژێر و سەرۆچک هەموویان بەبێ هۆ کشانەوە بۆ مەمالیکی خۆیان، پاشان ئەم ڕەوشە گەیشتە ناو هەموو بەشەکانی سوپا و یەک لە دوای یەک پێشبرکێیان بوو بۆ تێکشکان و پاشەکشە و هەرچەندە سەرعەسکەر و وەزیر و دەستوپێوەندەکانیان ویستیان بەر لە هەڵاتووەکان بگرن و بیانگێڕنەوە بۆ شوێنی خۆیان بەڵام سەرکەوتوو نەبوون و کۆششەکانیان هیچ سوودێکی نەبوو[2]. سەرچاوەکان لەبارەی هۆی بەکۆمەڵی کشانەوەی کوردەکان ڕای جیاجیا و پێک ناکۆکیان هەیە، نووسیاری کرۆنیکی (گوڵشەنی مەعاریف) لەمبارەیەوە دەنووسێت: "سەربازە کوردەکان، کە لە لای چەپی کاروانی سوپاکە دابوون، وەختایەک تیپێکی سوپای ئەفغانی هێرشی کردە سەریان، بەبێ هیچ

---

[1] سلیمان فائق، المصدر السابق، ص: 97- 98.

[2] المصدر نفسه، ص 109.

بەرەنگاری و داکۆکیکردنێک کشانەوە[1]". هەرچی چەلەبی زادە، مێژوونووسی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانییە لەمبارەیەوە دەنووسێت: "هۆی .یاخیبوونی کوردەکان ئەوەبوو کە ئەشرەف خان بەدزییەوە دیاری بۆ میرە کوردەکان هەناردبوو و لە نامە نهێنییەکانیدا بۆی نووسیون ئەگەر عوسمانییەکان دەست بەسەر ئەسفەهاندا بگرن، ئەوا ئێوە دەکەن بە کۆیلە، بەڵام ئەگەر ئالیکاری ئەو بکەن لە جەنگەکەیدا، ئەوا حوکمی هێندێک ئەیالەتی ئێرانیان دەداتێ لەگەڵ پلەی خان بۆ هەریەکێکیان[2]". نووسیاری کرۆنیکی (حروب الایرانیین فی العراق) دەنووسێ: "کوردەکان بنەوانی ئەو خراپەکارییە بوون کە بەسەر سوپای عوسمانیدا هات، چونکە ئامانجیان جگە لە تاڵان و بڕۆیی سوپا شتێکی دیکە نەبوو[3]" هەتا هێندێک لە مێژوونووسەکان ئەم ڕووداوە بۆ جادووی ئەفغانەکان و سیحربازیی ئەفغانەکان[4] دەگێڕنەوە. بەڵام هۆکاری ڕاستەقینە دەشێ بەشێکی خۆی لە فاکتەری مەزهەبیدا ببینێتەوە وەک ئەوەی یەکێک لە مێژوونووسە هاوچەرخەکان ئاماژەی پێداوە، بەجۆرێک کە ئەفغانەکان لە تەلی هەستی سوننی بوونیان داوە بۆ کاریگەریی نواندن لەسەر کوردە سوننیەکان و ئەوەش پێش دەستپێکردنی جەنگەکە[5].

---

[1] محمد سعید المدرس، گلشن معارف، ج (2)، إسطنبول، ص 1234، (لە: علاء نورس، المصدر السابق، ص 129).

[2] أسماعیل عاصم کوجک جلبي زادە، تاریخ جلبي زادە، مطبعە عامرە، استانبول 1282 هـ صص 435-436.

[3] سلیمان فائق، المصدر السابق، ص 110.

[4] رسول حاوی الکرکوکلی، دوحة الوزراء في تاریخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسی کاظم نورس، بیروت، 1963، ص 23.

[5] بڕوانە: د. سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیە...، ص 299، بۆ باسێکی بەداوێن لەمبارەیەوە بگەڕێوە سەر هەمان سەرچاوە.

دوای کۆتایی هاتنی ئەم شەڕە، ئەفغانە دەسەڵاتدارەکانی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لە 13ی تشرینی یەکەمی 1727دا لە پەیماننامەیەکی دوانزە ماددەیی لە هەمەدان ڕێککەوتننامەیەکیان مۆر کرد[1]. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە هەموو ناوچەکانی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دەمێننەوە (ماددەی دووەم). دوای ئەوەی ئەم پەیماننامەیەی ئاشتی لەنێوان ئەشرەفخانی ئەفغانی و والی بەغدا مۆر کرا، ئەشرەفخان بەئامانجی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان هەردوو حکومەت فیلێکی بەنرخی بە دیاریی بۆ سوڵتانی عوسمانی هەنارد[2]. بەڵام تەمەنی ئەم پەیماننامەیە هێندە زۆر درێژ نەبوو و هەرزوو نادر قولی خان لەسەر شانۆی سیاسیی ئێران وەدیارکەوت و بە یارمەتی جەنگاوەرانی ئەفشار و کورد لە ماوەیەکی زۆر کورتدا کۆتایی بەهەر سێ دەسەڵاتی داگیرکار هێنا و ئەم پەیماننامەشی بەتەواوەتی دڕاند. ئەمە ئەوە لێکدەداتەوە کورد چەندە "نەتەوە"یەکی فرە پارچە پارچە بووە و هیچ داگیرکارێکی کوردستان نەبووە بە یاریدەی کورد بەرز نەبوویێتەوە و کۆمەگی ڕاستەوخۆی لە کوردەوە پێنەگیشتبێت.

[1] سليمان فائق، المصدر السابق، ص 110-111.، شاكر الضابط، المصدر السابق، صص 40-42.

[2] عباس العزاوي، المصدر السابق، ج 5، ص 222.

## 2-3: كوردستان لەنێوان ململانێی نادرشا و عوسمانیدا

**کورد لەگەڵ گورگ درندەترە!**
**(نادر شا)**

وەدیار کەوتنی کەسایەتی نادر خانی ئەفشار (تەهماسپ قولی)[1] لەسەر شانۆی ئێرانی پارچە پارچە و داگیرکراو ڕەوتی ڕووداوەکانی سەراوبن گۆڕی و لەماوەیەکی کەمدا توانی تەواوی خاکی دەوڵەتی ئێران ئازاد بکات و بەڵکو هەر بەوەندەش نەوەستا لەشکرکێشییەکانی تا هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست هەڵکشا. سەردەمی نادر خان بەوە دەناسرێتەوە، کە هەمووی شەڕ و شۆڕبووە دژ بە داگیرکارەکانی ئێران و بە ڕوویێکی تایبەتیش دژ بە دەوڵەتی عوسمانی. ئەوەی شایەنی تێبینییە ئەوەیە، کە هەموو هێرش و لەشکرکێشییەکانی نادر خان بۆ سەر هەردوو ئەیالەتی بەغدا و مووسڵ بەناو سنووری خاکی کوردستان تێدەپەڕین و بەڵکو هێندێک لە شەڕە گەورەکانیش هەر بەڕاستی لەناو خاکی کوردستاندا قەومان. بۆیە دەورەی نادرخان دەتوانین ناوی بنێین دەورەیەکی جەنگیی، بۆیە

---

[1] بە (نادر خان) ناسرابوو تا ساڵی 1736 تاجی شایەتی لەسەرنا و ناسناوی بوو بە (نادر شای ئەفشاری) و ئێمە لەکاتی ناوهێنانیدا پابەند دەبین بە زنجیرەبەندیی ڕەوتی مێژوویی پەرەسەندنەکان.

گرینگه بزانین شوێنی کورد وەکو نەتەوە و کوردستان وەکو خاک، لەم هەموو شەڕ و شۆڕانەدا چی بووە و دواجاریش ئەنجامەکانی ئەم داگیرکردنانە لەسەر چارەنووسی سیاسیی کوردستان چی بوون و چۆن شکانەوە؟

لەگەڵ دوا دواییەکەی ساڵی 1729دا، نادر خان هەموو ئەفغانییەکانی تێکشکاندن و لە ئێران ڕاویانی نان، ئەمجارە کەوتە پاککردنەوەی وڵات لە ڕووس و عوسمانییەکان. بەبیانووی دواکەوتنی ئەو گفتوگۆییەی کە لە ئیستەنبوڵ بەڕێوەدەچوو، نادر خان هێرشێکی لەناکاوی کردە سەر ئۆردوی عوسمانی لە نەهاوەند و لە 1 ی تەمموزی 1730 ی ز (15 ذي الحجة 1142ک) دوای ئەوەی دوو هەزار سەربازی ئۆردوخانەکەی لەناوبرد و سەرکردەکەشی کوشت، توانی شارەکە داگیر بکات. پاشان بەخۆیی و هێزەکانی بەرێکەوت بۆ ئازادکردنی شارەکانی دیکە لە دەست داگیرکردنی عوسمانی، توانی تەبرێز و هەمەدان و ئەردەڵان و کرماشان[1] بگرێتەوە و سوپای عوسمانی ناچار بوو بۆ ناوچەکانی زەهاو و خانەقین بکشێتەوە[2]. لە سەرەتای ساڵی 1731دا والی بەغدا، فەرمانێکی سوڵتانیی بۆ هات کە بەرەو بەرەکانی جەنگ بڕوات و ئەم شارانە داگیربکاتەوە، کە نادر خان ئازادی کرد بوون و بیانگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی. لە درێژەی لەشکرکێشییەکانی بۆ ناو خاکی ئێران والی بەغدا، ئەحمەد پاشا توانی بەبێ جەنگ کرماشان و ئەردەڵان دووبارە داگیربکاتەوە و سوپای ئێران بەبێ

[1] علاء نورس، المصدر السابق، ص: 144.، د. سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیه....، ص 302.

[2] سیار الجمیل، حصار الموصل، الصراع الاقلیمی واندحار نادر شا، صفحه لامعه في تکوین العراق الحدیث، الموصل، 1990، ص 107.

جەنگ خۆیان دا بەدەست سوپای والی بەغداوە[1]. دواتر سوپای والی بەغدا بەرەو هەمەدان هەڵکشا، شەڕێکی خوێناوی لەنێوان هێزەکانی والی و سوپای شا تەهماسپی دووەم، لە نزیک (کوریجان) لە بیابانی هەمەدان، لە 16ی ئەیلوولی 1731دا ڕوویدا. لەناو ڕووباری خوێندا سوپای والی بەغدا، شاری هەمەدانی داگیر کرد. مێژوونووس عەبباس عەززاوی بەم جۆرە باسی ئەو جەنگە دەگێڕێتەوە:" بەشی پێشەوەی سوپاکەی والی بەغدا بریتیبوون لە هۆزە کوردە جەنگاوەرەکان[2]. بەگوێرەی مێژوونووس علاء نورس هێزەکانی ئێران کەم تا زۆر نیوەی سوپاکە و زۆرینەی تۆپ و جبەخانەیان لەدەست دا و هەزاران لە سەربازەکانیان تێچوون و ئەوانی دیکەش بە دیلی کەوتنە دەست هێزەکانی عوسمانی[3].

دوای شکستی ئێران لە جەنگی هەمەدان، شا تەهماسپی دووەم، نوێنەرێکی خۆی، محەممەد ڕەزا قولی خان قۆریچی باشی، هەنارد بۆلای والی بەغدا تا ئازاد بێ لە مفاوەزە کردن و لەسەر ئەمە والی ئەحمەد پاشا بڕیاری قەبووڵکردنی مفاوەزەی دا. لە 10 ی شوباتی 1732دا پەیماننامەی ئەحمەد پاشا لە هەشت مادده لەنێوان والی بەغدا و نوێنەری شا تەهماسپ مۆرکرا. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە ڕووباری ئاراس کەوشەنی وڵاتی ئێرانە و شا تەهماسپی دووەم هەموو شارەکانی: گەنجە، تفلیس، ڕەوان، نەخچەوان، کاخت، کارتلی، شێروان، شماخی و داغستان بۆ عوسمانییەکان بەجێدەهێلێت و لە بەرامبەریشدا دەوڵەتی

---

[1] رسول الکرکوکلی، المصدر السابق، ص 26.، د. سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیە...، ص 302.

[2] عباس العزاوی، مج5، ص 225. هەروەها بڕوانە: رسول الکرکوکلی، المصدر السابق، ص 26-27.

[3] علاء نورس، المصدر السابق، ص 147.

عوسمانی هەموو شارەکانی: تەبریز، ئەردەڵان، کرماشان، هەمەدان، حەویزە و لوڕستان بۆ ئێران بگێڕێتەوە[1]. بەم چەشنە ئەحمەد پاشا و سوپا هاوبەشەکەی گەڕانەوە سنووری کۆنی ویلایەتی بەغدا، واتە هەمان سنووری پەیماننامەی زەهاوی 1639[2].

نادر خان زۆر بەتووندی دژی ئەم پەیماننامەیە ڕاوەستا و لەم سۆنگەیەوە ئەمەی بەدەرفەت زانی و شا تەهماسپی لێخست و کوڕە شیرەخۆرەکەی (عەبباس میرزا)، کە ئەوکات تەمەنی هەر تەنیا (40) ڕۆژ بوو، بەناوی عەبباسی سێیەمەوە کرد بە (شا) و خۆیشی بەناوی "وەکیلی شا"ەوە بوو بە دەمڕاستی ئێران و شا تەهماسپی دووەمی ڕەوانەی زیندانی مازەندەران کرد[3].

پاییزی ساڵی 1732 نادر شا تەتەرێکی بۆ لای والی بەغدا هەنارد و کەوتە هەڕەشە و گوڕەشە کردن بۆ داگیرکردنی بەغدا. زۆری نەبرد لە سۆنگەی هۆ ئایینی-سیاسییەکانەوە پەیماننامەی ئاشتی پچڕا و دووباره جاڕی جەنگ درایەوە. ساڵی 1733، نادر خان کەوتە هەڵپەی لەشکرکێشیی بۆ سەر بەغدا و بەخۆیی و سوپایەکی سەد هەزار جەنگاوەرییەوە هێرشی بۆ سەر شاری بەغدا هێنا. بێگومان ئەم لەشکرکێشییە دەبوایە بەناو خاکی کوردستاندا تێپەڕ ببێ. پێشتر هەرزوو والی بەغدا، ئەحمەد پاشا دەستی کرد بوو بە بەهێزکردنی هێڵەکانی سنوور لە دەرنە، مەندەلی و بەدرە و ئۆردووەکانی لە زەهاو و قەسری شیرین بەهێز کرد. پاشان دەستی کرد بە چاککردنەوەی ناوەندەکانی بەرگری لە شوورەی بەغدا و بابیعالی لە خێرایی مەترسییە هاتووەکە ئاگادار کردەوە[4]،

---

[1] المصدر نفسه، ص 149.، شاكر الضابط، المصدر السابق، ص 43.

[2] سيار الجميل، المصدر السابق، ص 107.

[3] جان مالكم، مصدر پيشين، ج 2، ص 28، عباس العزاوي، المصدر السابق، مج5، ص233.

[4] رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص 29.، د. سعدی عثمان، كوردستان الجنوبيه...، ص 304.

هەروەک چۆن هێلەکانی بەرگری لە ئۆردووی قەسری شیرین بەهێزکرد، بەڵام نادر خان هەر زوو لە لەشکرکێشییەکەیدا بەرەو کرماشان ڕۆیشت و داگیری کردەوە، کە تا ئەو دەم لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوو و دواتر ناوچە کوردەوارییەکانی زەهاوی داگیرکرد و بەناو خاکی کوردستانەوە لە ڕێگەی دەرنە و شارەزوور و لە نزیک توزخورماتوو تێپەڕیوو و بەشێک لە هێزەکانی بەرەو کەرکووک نارد بەنیازی داگیرکردنی، بەڵام کەرکووک خۆی بەدەستەوە نەدا، لەم سۆنگەیەوە وەک کاردانەوە سوپاکەی نادر خان هەموو ئاوایییە کوردییەکانی دەوروبەری کەرکووکی بەتەواوی وێران و تاڵانبڕۆ کرد[1]. نادر خان لە کاتی لەشکرکێشییەکانی بەناو وڵاتی کوردان بەهەر کوێیەک بگەیشتبایە تۆڵەی لە کوردەکان دەکردەوە و سەری دەبڕین و تۆڵەی لی دەسەندنەوە و کەللە سەری لەشێوەی منارە لە ئاوایییە کوردییەکان دروست دەکرد و هەمیشە دەیوت "کوردەکان لە گەلەگورگ دڕندەترن و دەبێ لەسەر زەوی ڕەشبکرێنەوە"[2]. شایانی گوتنە کە پەلاماردانی نادرخان بۆ ناوچە باکورییەکان لە بریتی بەغدا، لەوانەیە بەلای زۆریەوە هەوڵدانێک بووبێ بۆ پساندنی پەیوەندی بەغدا بەوناوچانەوە بۆ ئەوەی کۆمەگی سەربازییان لەسەر ببرێت[3].

نادر خان لە نزیک شارەبان لەگەڵ سوپای عوسمانی تێکهەڵگیران، دوای ئەوەی لە ڕووباری دیالە-بەهرۆز پەڕییەوە و خاکی کوردستانی جێهێشت و بەرەو بەغدا بەڕێکەوت. لە ڕێگەدا بەرەو بەغدا لەگەڵ هێزێکی عوسمانی لە نزیک شارەبان تێکپرژان و بەسەریاندا سەرکەوت، هەر لە ڕێگەدا پەلاماری گوندە کوردنشینەکانی دەوروبەری تووزخورماتووی داو بڕیاریدا هۆزی بەیات

---

[1] علاء نورس، المصدر السابق، ص 157.

[2] المقدم الشيخ عبدالواحد، المصدر السابق، ص 129.

[3] د. سعدى عثمان، كوردستان الجنوبيه....، ص 304.

بۆ خوراسان ڕابگوێزنەوە[1]. لە نزیک بەغدا، نادر خان پەلاماری تیپێکی سوپای عوسمانی دا و تەفروتووناى کرد و ژمارەیەکی زۆری لێ بەدیل گرتن، هەروەها سەرکردەی تیپەکە، محەممەد پاشا، کە حاکمی کۆیسنجاق (کۆیە) بوو کوشت[2]. ئەم تیپە سەربازییە عوسمانییە سوپای جەنگاوەری کوردبوون و بەسەرکردە کوردەکەشیانەوە بوون بە یەکەمین قوربانی بەرگریکردن لە شاری بەغدا. لە 13 ی کانوونی دووەمی 1733 سوپای نادرخان گەمارۆی خستە سەر بەغدا، بەڵام دوای حەوت مانگ لە ئابلۆقەدانەکە شاری بەغدا خۆی بەدەستەوە نەدا. لەم ماوەیەدا نادرخان لە گەیشتنی کۆمەکی سوپای عوسمانی ئاگاداربوو، بۆ ئەم مەبەستە ئاڕاستەی لەشکرەکەی بەرەو باکوور گۆڕی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای نێردراوی عوسمانی، کە بۆ شکانی ئابلۆقەی سەر بەغدا هاتبوو و لەنزیک سامەڕا لەگەڵ سەرکردەی عوسمانی، سەدری ئەعزەم، تۆپاڵ عوسمان پاشا لە 19ی تەمموزی 1733 بەرەوڕوو بوونەوە و جەنگێکی خوێناوی قەوما، کە نادر شا بە بریندارکراوییەوە گۆڕەپانی جەنگی جێهێشت و وەك سەرچاوەکان باسی دەکەن دوای خۆی سی هەزار کوژراوی بەجێهێشت[3] و زیانی هێزەکانی عوسمانیش لە ڕووی ژمارەوە ڕەنگە لەوەی نادر شا کەمێک کەمتر بوو بێت. بەڵام هێندەی نەبرد، دوای سێ مانگ لەو شکستە سەربازییە، نادر خانی ئەفشار توانی سوپاکەی ڕێکبخاتەوە و جارێکی دیکە بە خۆیی و سوپایەکی گەورەوە دووبارە لەشکرکێشی بۆسەر عێراق دەستی پێ کردەوە، کە ئەمە توانای بێسنووری سەربازیی ئەوەی بەدیاردەخست.

---

[1] علي شاكر علي، المصدر السابق، ص 184.

[2] LONGRIG, op.cit, p. 138.

[3] Ibid., p. 138. جان مالکم، مصدر پیشین، ج 2، ص29

نادرخان له هەمەدانەوە، لە2ی تشرینی یەکەمی 1733ی ز/22 رجب 1146 دا بەناو خاکی کوردستانەوە جارێکی دیکە هاتە ناو عێراقەوە، لەنزیک زەهاو سوپایەکی عوسمانی، کە لەسەر سنوور بوو بەرەو ڕووی بۆوە، بەڵام نەیتوانی بەرەو ڕووی سوپاکەی نادرخان بوەستێ[1]. له ڕێگەیدا بەرەو کەرکووک توانی هێزێکی دیکەی عوسمانی تێکبشکێنێ، کە لە بیست هەزار سەرباز پێکهاتبوون و لەژێر سەرکردایەتیی والی مووسڵ مامەش پاشادابوو، پاشان بەرەو ناوچەی سلێمان بەگ و لەوێشەوە بەرەو کەرکووک،کە خەنیمە عوسمانییەکەی تۆپال عوسمانی لێ بوو[2]. میرزا مەهدی کە هاوەڵیی لەشکرکێشییەکە بووە دەڵێ نادرخان بەرەو ڕووی خەنیمەکەی نەبۆوە، بەڵکو بەرەو سورداش هەڵکشا هەروەک بڕێک لە هێزەکانی بۆ ئاق دەربەند ڕەوانە کرد لە هەوڵدانێک بۆ هێنانە دەرەوەی تۆپاڵ عوسمان بۆ دەرەوەی کەرکووک، لەهەمان کاتدا نادرخان، محەمەد خانی قاجاری بە سەرکردایەتیی سوپایەکی گەورە بۆ گەمارۆ خستنە سەر بەغدا هەنارد، کە تا ئەوکات بەغدا لەژێر قاتوقڕیدا بوو[3]. لە 26ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1733دا لە پێدەشتی لەیلان، نزیک بە کەرکووک، هەردوو سەرکردەی جەنگیی، نادرخان و تۆپاڵ عوسمان بەرەوڕووی یەک بوونەوە. جەنگێکی خوێناوی لەنێوان هەردوو لادا ڕوویدا و هێزەکانی ئێران، کە تینوو بوون بۆ سڕینەوەی ئەو شکستەی کە پێشتر تووشی بوون، بە هێرشێکی توونـد خۆیان خستە ناوەندی سوپای عوسمانی، ئەوکاتە تۆپال عوسمان لەسەر زینەکەی بەلادا کەوت و لەسەر ئەسپەکەی هەڵزنا، چەندین هەوڵی بەردەوامی دا بۆ کۆکردنەوەی هێزی جەنگاوەرەکانی، بەڵام

[1] د. سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیه....، ص 309

[2] علي شاكر علي، المصدر السابق، ص 190.

[3] المصدر نفسه، ص 191.

هێرشێکی دیکەی سوپای ئێران وایکرد عوسمانییەکان جارێکی دیکە تێکبشکێن و تۆپاڵ بەزەویدا کەوت، بەڵام وەک سەربازێکی جەسوور تا کۆتایی شمشێری هەر بەدەستەوە بوو و مردنی پێ باشتر بوو لە ڕاکردن و لەگەڵ خۆیدا هەشت هەزار لە باشترین هێزەکانی ڕۆمەیلی لەناوچوون. ئێرانییەکان دەستیان بەسەر هەموو کەرەسە و تۆپەکانی سوپای عوسمانی و هۆیەلی گواستنەوەدا گرت و زەروزیانی سوپای عوسمانی لەنێوان کوژراو و دیلدا بە نزیکەی بیست هەزار کەس دەخەملێنرێت[1]. دوای ئەم سەرکەوتنەی دەشتی لەیلان، نادر خان بەرەو بەغدا لەپێناو داگیرکردنی بەڕێکەوتەوە.

نادر خان بەهەوای سەرکەوتنە جەنگییەکەی دەشتی لەیلان مەست بوو بوو، بەڵام هێندەی نەبرد پشێوییەکانی ناو ئێران: یاخیبوونی محەممەد تەقی بلوج لە شیراز، نادر خانی ناچارکرد داوای ئاشتییەکی بە پەلە بکات و بەخێرایی بگەڕێتەوە ناو وڵات. لە مفاوەزەیەکی خێرادا، نادر شا و والی بەغدا لە (19ی کانوونی یەکەمی 11/1733 رەجب 1146ک) دا گەیشتنە پەیماننامەیەک کە سنووری نێوان هەردوو وڵات بگەڕێتەوە بۆ هەمان سنووری پەیماننامەی زەهاوی 1639. هەروەها بەگوێرەی پەیماننامەکە دیلەکان گۆڕدرانەوە و دیارییەکان ئاڵوگۆڕکران. هەروەها ئەو تۆپانەی کە دەوڵەتی عوسمانی پێشتر دەستی بەسەرداگرتبوون لە جەنگی هەمەدان دژ بە تەهامسپی دووەم گێردرانەوە، هەروەها ئاسانکاری حاجییە ئێرانییەکان بۆ شوێنە پیرۆزەکان. ئەسڵیی پەیماننامەکە نێردرا بۆ ئیستەنبووڵ بۆ پەسندکردن و نادرخان لەگەڵ قازی عەبدولکەریم ئەفەندی کە ئەرکی گەیاندنی پەیماننامەکەی بۆ ئیستەنبووڵ پێسپێردرابوو نامەیەکی بۆ سەدری ئەعزەم عەلی پاشا نووسی و تێیدا هاتووە، کە بونیادی هاوبەشی تورکە عوسمانییەکان و تورکانەکان، هانی

[1] جان مالکم، مصدر پیشین، ج 2، ص 30، علاء نورس، المصدر السابق، ص 169.

داوە بۆ مۆرکردنی ئەم پەیماننامەیە[1]. دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئەوە بۆ یەکەمجار بوو پەیماننامەیەک باسی ئالوگۆڕی بالیۆز بکات لەنێوانیاندا و جگە لەو ئیمتیازاتانەی، کە ئێران بندەستی خستن لەبارەی زیارەتچییە ئایینەکان بۆ شوێنە پیرۆزەکانی عێراق و مافی دامەزراندنی ئەمیرێك بۆ حەج و هەروەها گۆڕینەوەی دیلەکان[2].

بەڵام ئەم پەیماننامەیەی ناوبراو هێشتا نەچووبووە ناو بواری جێبەجێکردن، کاتێک جارێکی دیکە شەڕ و پێکدادان دەستیان پێ کردەوە[3]. دوای ئەوەی نادر خان یاخیبوونی شیرازی لە خوێن هەڵکێشا، بەخۆیی و سوپاکەی بەرەو تفلیس و یەریڤان هەڵکشا و بەدرێژایی ساڵی 1734 گەمارۆی دان. سوپای عوسمانی و نادر خان لە نزیک قارس بەیەک گەیشتن، دوای هەڵگیرسانی جەنگێکی قورس، سوپای عوسمانی بەشێوەیەکی زۆر ترسناک تێکشکا و هەتا سەدری ئەعزەم عەبدوڵڵا کوبرلی خۆشی لەم جەنگەدا سەری تێداچوو. دوای ئەم شکستە سەربازییە ترسناکە دەرباری عوسمانی، والی بەغدا، ئەحمەد پاشای ڕاسپارد بۆ مفاوەزە لەگەڵ نادر خان، بەڵام مەرجە ئایینییەکانی نادر خان هیچ بوارێکیان بۆ ئاشتی درووست نەکرد و جارێکی دیکە جەنگ لەنێوان هەردوولا هەڵگیرسایەوە و خولی ئەمجارەی جەنگ سێ ساڵی دیکە درێژەی کێشا. دواتر سەرەنجام نادر خان و سوڵتانی عوسمانی هەمدیس پەیماننامەی قوستەنتینەیان بۆ ئاشتی مۆرکرد. ئەم پەیماننامەیە لە سێ مادده پێکهاتبوو، لە پاشکۆی ئەم پەیماننامەیەدا هاتووە کە سنووری نێوان هەردوو وڵات، هەر هەمان ئەم سنوورە دەبێ کە لەسەردەمی سوڵتان مورادی

---

[1] علاء نورس، المصدر السابق، ص 170، شاكر الضابط، المصدر السابق، ص 44.

[2] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 33

[3] د. سعدى عثمان، كوردستان الجنوبيه...، ص 310.

چوارەم، لە پەیماننامەی زەهاودا مۆرکراوە. بەم شێوەیە سنوورەکان گەیشتنەوە هێڵە کۆنەکان و جەنگ بە ڕەسمیی لەنێوان ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێرانی ڕاگیرا[1].

بەرلەوەی خولی ئەمجارەی ئاشتی تەواو بێ و جەنگ هەڵبگیرسێتەوە، نادر خان ویستی لە هەوڵێکی سیاسیدا بەرنامە مەزهەبییەکانی خۆی بەئاشتی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا فەرز بکات، بۆ ئەم مەبەستەش نادر خان ویستی خۆشەویستی سوڵتان بۆ خۆی بەدەست بهێنێ و ساڵی 1740 (دە) فیلی پێشکێش بەسوڵتان مەحموودی یەکەم کرد، لە ئێرانەوە لە ڕێگەی مووسڵ-حەلەبەوە بۆ ئیستەنبووڵی ڕەوانەکردن وەک دیاریی بۆ سوڵتان مەحموودی یەکەم[2]. بەڵام ئەم ئاشتییە جگە لە شەڕ ڕاگرتن زیاتر نەبوو. لە ساڵی 1743، دەبینین نادرخان داواگەلێک پێشکەش بە سوڵتانی عوسمانی دەکات، کە قەبووڵکردنیان ئەستەم بوو: (گێڕانەوەی دیاربەکر و ئەرمەنستان و ددان پیانان بە مەزهەبی شیعە وەکو مەزهەبی پێنجەم)[3]. دەبێ ئەوە بگوترێت، کە نادر شا بۆخۆی سەر بەخێزانێکی سوونني بوو لە هۆزی ئەفشاری بەهێز و گەورە و ویستی ڕێبازێکی نوێ بۆ پێکەوژیان لەگەڵ عوسمانییەکان لەبواری پرسی سوونە-شیعەدا دابمەزرێنێت. چارەسەرێکی ئاشتیخوازانەی پێشکەش کرد، کە ئەمە نفووزی مەعنەوی نادر شای زیاد دەکرد و وەکو نوێنەری یەکێتیی ئیسلام و موسڵمانان دەیهێنایە پێشەوە. ئەم چارەسەرە ئەوەبوو، کە عوسمانییەکان

---

[1] علاء نورس، المصدر السابق، ص 184.

[2] سيار الجميل، المصدر السابق، ص 115.

[3] André Raymond , « Les provinces arabes (XVIe siècle- XVIIIe siècle », In Histoire de l'empire ottoman, Sous la dir.de Robert Mantran, Paris, Fayard, 1989, p.389.

ئیمامەتی دوانزە ئیمامیی لەژێر ناوی "جەعفەری" وەك یەكێك لە پێنج مەزهەبەكانی ئیسلام بەتەك مەزهەبەیلی: حەنەفی، مالیكی، شافیعی و حەنبەلی قەبووڵ بكەن. لەم بارەیەوە پێشنیازی كرداریی پێشكەش بە سوڵتانی عوسمانی كرد بەوەی میحرابێك لە مەككە بۆ (جەعفەری) تەرخان بكرێت و ڕێگەیان پێبدرێت ئەمیرێك یان هەبێت و كاروانی حەج بەناو وڵاتی شامدا بڕوات بۆ حەج كردن[1].

جێبەجێكردنی ئامانجەكانی نادر خان لەلایەن سوڵتانی عوسمانی ئەگەر بەتەواوی ئەستەم نەبووبن ئەوا كارێكی زۆر قورس بوون، ئەم مەرجانەی كە نادر خان لەیەک لایەنە پێشنیازی پێ كردبوون بۆ ئیستەنبووڵ، بەتەواوی لەولای دیكە ڕەتكرانەوە. ساڵی 1742 دەوڵەتی عوسمانی پڕۆژەكەی نادرشا، بەوەی مەزهەبی جەعفەری وەكو مەزهەبی پێنجەم بێتە قەبووڵ كردن، ڕەتكردەوە و ئەمە جارێكی دیكە دەرگەی جەنگ و پێكدادان و لەشكركێشی لەنێوان هەردوو وڵات دەستپێكردەوە و لە سۆنگەی داوا مەزهەبییەكانی نادر شا، جارێكی دیكە پەیوەندییەكانی ئێرانی-عوسمانی گەیشتنەوە قۆناغێكی زۆر ترسناک. دوای شكستهێنانی چەندین یادداشتكاری و چاوپێكەوتنی وەفدی هەردوولا، لە تەممووزی 1743دا، نادر شا دوای ئەوەی لە هێرشەكانی بۆسەر هیندستان و وڵاتی ئەفغانستان و توركستان تەواو بوو پەیماننامەی ساڵی 1736 ی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بە هۆكار و پاڵنەری زۆر هەڵوەشاندەوە. بۆیە بەخۆیی و سوپاكەی دووبارە هاتنەوە بۆسەر عێراق و، سەرچاوە مێژووییەكان باسی ئەوە دەكەن نادر شا لەم لەشكركێشییەدا بەخۆیی و سوپایەكی (170000) سەد و حەفتا هەزار سەربازییەوە بەناو شارەزووردا هاتووە[2]. تەنانەت هەندێک

---

[1] وجیه كوثراني، المصدر السابق، ص 83

[2] عباس العزاوی، المصدر السابق، مج5، ص 367.

لە هاوسەردەمەکانی ژمارەی سوپاکەی، کە بۆ ئابلۆقەی مووسڵ ڕۆیشتوون (کە بێگومان زیادەڕۆییان تێدا کردووە) تا سێسەد هەزار (300000) سەرباز دەخەمڵێنن[1]. سوپاکەی نادر شا لە ڕێگەی لەشکرکێشیەکەیدا هەرچی ئاوایی و ئاوەدانی هەبوو وێرانیکردن و نە سوپای عوسمانی و نە هێزی میر و عەشایەرەکان نەیانتوانی بەری ئەم لافاوە ڕامالکەرە لە ئێران ڕا هاتووە ڕابگرن[2].
لە 5ی ئاگستۆسی 1743(14 جمادي الاخر 1156ک) دا نادر شا گەیشتە بەردەم شاری کەرکووک، چەند ڕۆژێک گەمارۆی دا و دواتر شار خۆی بەدەستەوەدا، دواتر بەرەو هەولێر هەڵکشا و داگیری کرد و لەوێشەوە بەرەو خالی ئامانجەکەی : شاری مووسڵ بەڕێکەوت[3] و لە 14 ی ئەیلوولی ساڵی 1743 گەمارۆی شاری مووسڵی دا. دواجار لە ئاوایی (یارمجە) لە ڕۆژهەلاتی دیجلە بۆ گەمارۆدانی مووسڵ بارەگای هەڵدا[4]. ئەمە لەبەر ئەوەبوو کە شاری مووسڵ شوێنێکی ستراتیژی گرینگی هەبوو، کە دەیتوانی کۆنترۆڵی ڕێگەکانی هاتووچۆی نێوان عێراق و ئەنادۆڵ بکات. لەڕووی ستراتیژییەوە داگیرکردنی مووسڵ ڕێگەی لە گەیشتنی کۆمەگی عوسمانی دەگرت و پرۆسێسی داگیرکردنی بەشەکانی دیکەی ناوەڕاست و جنوویی لە عێراق ئاسان دەکرد[5].
دوای چل ڕۆژ لە گەمارۆیەکی مکوم، نادر شا نەیتوانی مووسڵ داگیر بکات و لە 23ی تشرینی یەکەمی 1743دا نادر شا سوپاکەی گەڕاندەوە بۆ

---

[1] André Raymond , op.cit, p.389.

[2] أمين زكي بك، خلاصه تاريخ الكرد والكردستان منذ اقدم العصور التاريخيه حتى الآن، الجزو الأول، الطبعه الرابعه، بيروت، 1996، ص 215.

[3] علاء نورس، المصدر السابق، ص 188.

[4] نەوشیروان مستەفا ئەمین، بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین، مێژووی سیاسی، کتیبی سێیەم، بەرگی یەکەم، بیرووت، 2014، ل 76.

[5] إبراهيم خليل أحمد (د)، و خليل علي مراد (د)، المصدر السابق، 54

کەرکووک و لەوێدا خێوەتی لێهەڵدا[1]. پاشان نادر شا ڕووی لەشەرکێشییەکەی کردە سەر بەغدا و سوپاکەی لەنزیك بەغدا مۆڵ دا و دوای ئەوەی کە والی بەغدا ئەحمەد پاشا لەسەر داواکەی ڕازی بوو بەوەی ئازووقە لە کێلگەکانی بەغدا بە سوپاکەی نادر شا بدات، کە ئەمە بۆ خۆی هەر بە نیمچە گەمارۆیەك دەژمێردرا[2]. پاشان نادر داوای لە والی بەغدا، ئەحمەد پاشا کرد تا پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵدا مۆربکات، والی بەغدا وەڵامی لێگێڕایەوە، کە دوای ڕەزامەندی ئیستەنبووڵ ئامادەیە پەیماننامەی ئاشتی مۆر لەگەڵ بکات. پاشان نادر شا چووە زیارەتی کەربەلا و نەجەف و لە کانوونی یەکەمی 1743 کۆنگرەیەکی بۆ زانا ئایینییەکانی سوونە و شیعە لەنزیك نەجەف بەست، ئامانجی ڕاگەیاندراوی نزیککردنەوەی نێوان موسڵمانانی شیعە و سوونە بوو و پاشان دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ ئێران[3].

لە سەرەتای حوزەیرانی ساڵی 1745 دەوڵەتی عوسمانی لە دوو قۆڵەوە دوایین هێرشی گەورەی خۆی بۆسەر سنووری دەوڵەتی ئێران دەست پێ کرد. قۆڵی یەکەم بە سەرکردایەتیی یەکان محەممەد پاشای سەدری ئەعزەم لە قۆڵی ئەرزەرۆم و قارس و قۆڵی دووەم لە دیاربەکر و مووسڵ بەسەرکردایەتیی عەبدوڵڵا پاشا جبجی و لەم هێرشەدا سوڵتان ویردی خانی ئەردەلآن ، کە لە ئێران ڕایکردبوو بۆ دەرباری عوسمانی لەگەڵ قۆڵی دووەمی سوپای عوسمانیدا بوو. سوپای عوسمانی بە سەرکردایەتیی یەکن محەممەد پاشا لە 150.000 سوارە و 40.000 سوپای ئینکشاری پێکهاتبوو. لە موراد تەپە لە نزیك ئێرەوان لە 9 ی

[1] LONGRIG, op.cit, p. 152.

[2] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 33

[3] نفس المصدر، ص 33

ئابی 1745[1] لەگەڵ سوپای ئێران بەیەك گەیشتن. دوای ئەوەی سەدری ئەعزەم بەشێوەیەکی کتوپڕ مرد، سوپاکەی شکا و 12.000 کوژراو و 5000 دیلی لە دەستدا و هەموو تۆپەکانیشی بوون بە غەنیمەی سوپاکەی نادر. هەرچی ئەو هێزەی دووەمی سوپای عوسمانی بوو کە لە قۆڵی دووەمەوە هێرشیان هێنا لە 19 ی ئابی 1745 سوپای ئێران بەسەرکردایەتیی نەسروڵلا میرزا و هێزی کوردەکانی بابان بەسەرکردایەتیی سەلیم خان بابانی شارەزووری لە جەنگێك لە نزیك مووسڵ توانیویانە سوپاکەی عوسمانی تێکبشکێنن[2]. وێرای ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی نادر شا، کە دەرگەی گفتوگۆی بۆ کردەوە، بەڵام ڕاپەرینە ناوخۆییەکانی ئێران وای کرد نادر شا واز لە داواکردنی خواستە زەوینەیەکانی بهێنێ و هەڵویستی مفاوەزارتی زۆر بەهێز نەبوو وازی لە داواکردنی چەسپاندنی مەزهەبی جەعفەریی بهێنێت وەك مەزهەبی پێنجەمی ئیسلام[3]. ڕاستییەکەی شۆڕشی هۆزە لازە سوننییەکانی داغستان، کە لە پشتەوە گورزیان لە سوپاکەی نادر شا دەوەشاند، نادر شای نقومی ناو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بێهیوا کرد لەدەست ئەم هۆزە. لەم سەروبەندەدا بوو نادر شا نامەی بۆ سوڵتان و کوڕەکەی شاهرۆخ میرزا(ئیعتماد ئەلدەولە) بۆ سەدری ئەعزەم و مەلا عەلی ئەکبەر سەرۆکی فوقەها بۆ شێخولئیسلام نووسی لەبارەی بەندەکانی ئاشتی لەگەڵ عوسمانییەکان و لەوە پاشگەز بوونەوە " داوای

---

[1] هەرچی عەزمی ئۆزجانە مێژووی ئەم جەنگەی بە 23 ی ڕەجەبی 1158 (21 ی ئابی 1745) نووسیوە، بڕوانە :

Azmi Özcan, Nâdir Sah, In Islam Ansklopedis, 32, 2008, p227

[2] مینورسکی، مختصر تاریخ نادر شاه، ترجمه الی العربیه: نظام عزالدین محمد علی، بلا، صص 55-56

[3] Azmi Özcan, Nâdir Sah, In Islam Ansklopedis, 32, 2008, p227.

ئیعتراف بە مەزهەبی جەعفەری و تەرخانکردنی روکنی پێنجەم بکرێ لە مەککە و لاری نەبوونی خۆیان ڕاگەیاند لەوەی شیعە نوێژیان لەگەڵ ئەهلی سوننە بکەن، چونکە ئەوان پێیان وایە مەزهەبی خەلیفەکانی ڕاشیدین لە پێشەوەن"[1]

دوای سەرکەوتنە سەربازییەکانی نادر شا لە قۆڵەکانی ئەرزەرۆم و قارس و مووسڵ (9-19ی ئابی 1745) بەقسەی مێژوونووسیی تایبەتیی نادر شا، نادر نامەیەکی بۆ سوڵتانی عوسمانی نووسیوە و تێیدا نووسیویە، کە دەستبەرداری ماددەی یەکەم و دووەمی پەیماننامەی موغان بووە و هەڵیوەشاندۆتەوە. هەرچی سەرچاوە تورکییەکانە بە پێچەوانەوەی ئەوە دەڵێن نادر شا داوای لە سوڵتان کردووە ناوچەکانی وان، کوردستان، بەغدا، بەسرە، نەجەف و کەربەلا بدات بە ئێران و دەوڵەتی عوسمانی ئامادەیی خۆشی نیشان داوە بۆ پێدانی ئەم ناوچانە[2].

دوای جەنگێکی زۆر و مێژوویێک لە خوێنڕشتن، دوای ئەوەی شەڕەکان بەهیچ ئەنجامێك نەگەیشتن، هەردوولا ناچاربوون پەیماننامەی ئاشتی مۆر بکەن و دواجار نادر شا لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی لە17 ی شەعبانی 1159 ی کۆچی/ 4ی ئەیلوولی 1746دا لە "پەیماننامەی کردان=کوردان" لەسەر پەیماننامەی ئاشتی ڕێککەوت. ئەم پەیماننامەیە بریتی بوو لە: پێشەکییەک، سێ ماددە و پاشکۆیەک. لە پێشەکییەکەدا هاتووە، کە هەمان ئەو سنوورە دەپارێزرێن کە لەسەردەمی سوڵتان مورادی چوارەم 1639 دیاریکراوە و دەبێ

---

[1] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 278

[2] مینورسکی، مختصر تاریخ نادر شاه، ترجمه الی العربیه: نظام عزالدین محمد علی، بلا، صص 56-57

هەمان سنوور وەکو خۆی بمێنێتەوە و نابێ دەستکاری بکرێت[1]. شایانی گوتنە ئەم پەیماننامەیە بەندەکانی زۆر لە پەیماننامەی پێشوو جیاواز نەبوو، کە ساڵی 1736 لەگەڵ نادر شا مۆرکرا. بۆ جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیە نوێیە ئەحمەد پاشا کسریەلی وەکو باڵیۆزی عوسمانی لای ئێران دەستنیشان کرا و ئێرانیش مستەفا خانی وەکو باڵیۆزی خۆی لە ئیستەنبووڵ دەستنیشان کرد. هەریەکە لە باڵیۆزەکان بەرەو شوێنی کاری خۆیان ڕۆیشتن، بە دیاریی و نوسخەی موسادەقەکراوی پەیماننامەکە لە بەغدا یەکیان گرتەوە، بەڵام باڵیۆزی عوسمانی دوای ئەوەی گەیشتە هەمەدان و بەوەی زانی کە نادر شا لە 20 ی حوزەیرانی 1747 کوژراوە گەڕایەوە بۆ بەغدا، هەرچی باڵیۆزی ئێران بوو لە بەغدا مایەوە تا ئەو کاتەی ڕەوشی وڵاتەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە[2]. نادر شا لەم پەیماننامەیە ئیعترافی بە سوڵتانی عوسمانی کرد وەك "خەلیفەی موسڵمانان"و، ئەوە هەر لەم سۆنگەیەوە بڕێك لە مێژوونووسەکان پێیان وایە سیاسەتی نەرمیی نواندنی نادر شا لەبەرانبەر عوسمانییەکان بۆتە هۆی ئەوەی بەرهەڵستکارییەکی توندی لەلایەن بڕێک لە زانا شیعەکانەوە بۆ پەیدا ببێت و دواجار ئەمە بۆخۆی بەشدار بووە لە کوشتنی نادر شادا[3]. ئەمە دوایین ئاشتی و دوایین چارەنووسی نادر شا بوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و دواجار کاتێك نادر شا لە 20ی حوزەیرانی 1747دا لە ڕێگەی لەشکرکێشی بۆ سەر کوردەکانی خوراسان کوژرا، بەمە دەوڵەتی عوسمانی کێشەیەکی گەورەی لە کۆڵ بۆوە[4]. شایانی گوتنە کە

---

[1] بۆ دەقی پەیماننامەکە بڕوانە: شاكر الضابط، المصدر السابق، صص 47-49،

Hurewitz, op.cit, vol.1, pp.51-52

[2] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 34

[3] وجيه كوثراني، المصدر السابق، ص 84

[4] رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص 91- 92.

دەوڵەتی عوسمانی دوای کوشتنی نادر شا چاوی نەبڕییە هەرێمەکانی ئێران وەك ئەوەی دوای ڕوخانی دەوڵەتی سەفەوییە و دوای داگیرکردنی ئەفغان بۆ ئێران کردی. وادیارە دەوڵەتی عوسمانی ئەم پشێوییانەی بە کارێکی ناوخۆیی ئێرانی داناوە و لەبەر سەرقاڵی بە جەنگەکانی خۆی و کێشە ئابوورییەکانی بەتایبەت لەگەڵ رووسیا نەدەپرژایە سەر چاوتێبڕینە سەر خاکی ئێران[1].

ئەم هەموو لەشکرکێشی و جەنگە زۆر و زەوەندانەی نادر شا، جگە لەوەی کوردستانی کاول کرد، هێندەی دیکە نەتەوەی کوردی پارچە پارچەتر کرد. کورد لەنێوان جەبەرووتی لەڕادە بەدەری نادرشا و سیاسەتی بەرگریکارانەی ئیمپراتۆریای عوسمانی تەنیا ئەوەی بۆ مایەوە ببێتە وڵاتێکی وێرانە لەژێر سمی ئەسپەیلی لەشکرکێشییەکانی نادرشا و نەتەوەیەکی پاشکۆ و بێدەنگ و پارچە پارچە لەناو سنووری دەوڵەتی عوسمانیدا.

---

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 34

## 3-3: له په‌یماننامه‌ی هه‌مه‌دانه‌وه 1727 تا په‌یماننامه‌ی کوردان 1746

مۆرکردنی په‌یماننامه‌ی زه‌هاوی 1639، بۆ نزیکه‌ی هه‌شتا ساڵ جه‌نگ و شه‌ڕی ڕه‌سمیی هه‌ردوو ده‌وڵه‌تی عوسمانی و سه‌فه‌وی ڕاگرت. دواتر داگیرکردنی ده‌وڵه‌تی ئێران له بیسته‌کانی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌هه‌مه‌وه له‌لایه‌ن ئه‌فغانه‌کانه‌وه ڕێگه‌ی بۆ له‌شکرکێشی ده‌وڵه‌تی عوسمانی و چوونه ناو خاکی ئێران خۆش کرد. دوابه‌دوای په‌یماننامه‌ی زه‌هاو، ساڵی 1727 په‌یماننامه‌ی هه‌مه‌دان به‌سترا. به‌گوێره‌ی مادده‌ی پێنجه‌م: "وازهێنان له دالّده‌دانی په‌ناهه‌نده و تاوانکاره‌کان"، که به‌پله‌ی یه‌که‌م مه‌به‌ستیان له کورد بوو. شایانی گوتنه بگوترێت ئه‌م په‌یماننامه‌یه به‌ته‌واوی کوردستانی خسته ژێر ده‌سه‌ڵاتی عوسمانییه‌وه. دواتر به‌گوێره‌ی په‌یماننامه‌ی ئه‌حمه‌د پاشا 1731، سنووری ده‌وڵه‌تی عوسمانی جارێکی دیکه گه‌ڕایه‌وه شوێنی په‌یماننامه‌ی زه‌هاوی 1639 و هه‌موو ئه‌و ناوچه کوردەواری و ئێرانییانه‌ی که له‌م ده ساڵه‌ی دواییدا داگیرکرابوون ده‌بێ بدرێنه‌وه به‌ده‌وڵه‌تی ئه‌فشاری (مادده‌ی چواره‌م) له‌ناویاندا ناوچه‌کانی ته‌ورێز و ئه‌رده‌ڵان و هه‌مه‌دان و حه‌وێزه و لورستان بدرێنه‌وه به ئێران (مادده‌ی سێیه‌م)[1] و ڕووباری ئاراس له ئازه‌ربایجان و ده‌رنه به ئاراسته‌ی

[1] حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 78.

عێراق و دەرتەنگ و سنوورەکانی دیکەی کۆن، ببن بە بنەوان بۆ سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت (ماددەی یەکەم)[1].

لەگەڵ بەدیارکەوتنی نادر شای ئەفشار لەسەر شانۆی سیاسیی دەوڵەتی ئێران، کێشەکان زەقتر و شەڕەکان خوێناوی تر بوون. دوای زنجیرەیەک جەنگ و لەشکرکێشی نادر شا بۆسەر کەرکووک، مووسڵ و بەغدا، هەموو لەشکرکێشی و زۆربەی جەنگەکانیش هەم بەناو خاکی کوردستاندا تێپەڕ دەبوون و هەم لەناو خاکی کوردستانیشدا دەقەومان. شەڕی گەورەی پێدەشتی (لەیلان)ی نێوان نادر شا و تۆپاڵ عوسمان پاشا لەناو خاکی کوردستاندا قەوما. دوای زنجیرەیەک جەنگی خوێناوی و کوشتاری زۆر، لە پەیماننامەی ئاشتی شێرواندا 1736، بەشێوەیەکی تایبەتی پێ لەسەر ناکۆکیە مەزهەبییەکان داگیراوە و لەو پاشکۆیەی کە تایبەت بوو بە سنوور و پەناهەندەیی سیاسیی، کە دەوڵەتی عوسمانی ئامادەی کردبوو ئەوەی تێدا هاتووە: (ڕێگەگرتن لە ڕاگرتنی تاوانکارە هەڵاتووەکان لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە). دوادواییەکەی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم، نادر شای ئەفشار دوای ژمارەیەک لەشکرکێشی گەیشتە ئەوەی داوای ئاشتی بکات لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و دواجار لە پەیماننامەی کوردان لە 1746دا گەیشتنە پەیماننامەیەکی ئاشتی، کە پەیماننامەکە زیاتر ڕەنگێکی تایفی و مەزهەبی هەبوو و لە هەمان کاتیشدا هەر تەنیا گەڕانەوەیەک بوو بۆ پەیماننامەی زەهاوی 1639 و هەمان ئەو سنوورانەی لەم پەیماننەمەیەدا جێگیر کرابوون.

کوردستان هەمیشە بە بەردەوامی چاوگەی چاوتێبڕینی هەردوو دەوڵەت بووە. هەموو پەیماننامە و ڕێکەوتننامەکانی ئاشتی نێوان هەردوولا و هەم جەنگەکانیشیان هەر لەسەر دابەشدانی کوردستان بوون و سوپای هەردوو لاش

---

[1] شاكر صابر الضابط، المصدر السابق، ص 43.

هێندەی کورد بەخۆیەوە گرتووە کە لەپێشەوەی سوپای هەردوولا، کورد لەسەر خاکی خۆیدا، بەیەکتر بەکوشتبدەن. هێزە کوردییەکان ڕۆڵێکی گرینگیان گێڕاوە لە هەموو ئەو ئۆپیراسیۆنە سەربازییانەی کە لەنێوان عوسمانی و سەفەوییەکاندا ڕوویان دەدا. بۆ نموونە عوسمانییەکان هەر بە کۆمەگی میرە کوردەکان ناوچە کوردەوارییەکانی شارەزوور و بلباسیان لەژێر چنگی دەسەڵاتی سەفەوی دەرهێنا، بەهەمانشێوە کوردانی موکری یاریدەی سەفەوییەکانیان دا بۆ دەست گرتن بەسەر بەغدا بەسەرۆکایەتیی شا عەبباسی یەکەم ساڵی (1624 ی ز/1032 ك)[1]. لەسەرێکی دیکەشەوە هەموو لەشکرکێشییەکان و هێرشەکانی هەردوو دەوڵەت بۆ سەر یەکتری بەناو خاکی کوردستاندا ڕەتدەبوون. بەم پێیەش چ سوپای عوسمانی و چ سوپای ئێران، کوردستانیان خستبووە ژێر سمی ئەسپەکانیان. جا هەر کاتێک لایەک هێرشی بهێنابووایە سەر لای دیکە، ئەوا لایەکەی دیکە بەر لەجێهێشتنی ناوچەکە سیاسەتی بەسووتماککردنی زەوی پیادە دەکرد و دوایین گەڵای سەوز و تەڕی ناوچەکەشی ئاگر تێبەردەدا، بە نموونە لە ساڵی (1547 ی ز/953 ه) وەختایەک سوپای عوسمانی هێرشی بۆ سەر ئێران هێنا، شای ئێران فەرمانی دا هەموو شوێنەکانی سەر ڕێی لەشکرکێشی عوسمانی ئاگر تێبەربدەن و دانەوێڵە و گیای تێدا نەهێڵنەوە و هەموو جۆگە و جۆبارەکانیش پڕبکەنەوە. بەقسەی مێژوونووسانی ئێرانی، سوپای هێرشهێنی عوسمانی نە دڵۆپێ ئاو و نە گەڵایەکی سەوزی لە ڕێگەدا نەدی[2]. بەم جۆرە دەبینین لەجەنگەکەکانی سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا شا عەبباس لەبەرانبەر هێرشەکانی عوسمانی

---

[1] أ.د. محمد سهيل طقوش، تاريخ الاكراد (637-2015م)، دار النفائس، بيروت، 2015، ص 99

[2] ساڵح محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل 27.

هەمیشە سیاسەتی بەسووتماککردنی زەوی و چۆڵکردنی خەڵکی شارەکانی بەکاردەهێنا بۆ بەرگرتن لە لەشکرکێشییەکانی عوسمانی[1]. بۆیە دەبینین ساڵی 1605ز/1014ک کاتێک لەشکری عوسمانی بەسەرۆکایەتیی سەدری ئەعزەمی عوسمانی سینان پاشا (1014 ك/1605 ز)، چووە ناو خاکی ئێران، بەڵام هێزەکە هەر تەنیا لەبەر بەرگری سەفەوییەکان تێکنەشکا بەڵکو بەهۆی کەمی ئازووقە و دابڕانی پەیوەندی و کەشوهەوای ناجۆر و پەیڕەوکردنی سیاسەتی سووتماکردنی ئەو سەرزەمینانە بوو کە سوپای سەفەوی پێشتر چۆڵی کردبوون شکا[2]. سەرزەمینی کوردستانی باشوور لەو دەروناوچانە بوو، کە هەردوو دەوڵەت ململانێیان لەسەر دەکرد، لە هەمان کاتدا گۆڕەپانێکی سەرەکی بوو، کە تێدا بڕێک لەو ئۆپیراسیۆنە سەربازییانەی، کە لەماوەی بازنەکانی ئەم ململانێ بەردەوامەدا ڕوویاندا بەخۆیەوە بینووە، ئەمەش بە ئاشکرا لەو نەخشە نزیکەییە بەدیار دەکەوێ، کە یەکێک لە توێژەرەوەکان بۆ دیاریکردنی شوێنی پێکدادانەکان کردوویە، بەجۆرێک کە هێلەکانی بەرەوڕووبوونەوە لەباشوورەوە لە بەسرەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە باکوور بەرەو هەمەدان و لەناوەیدا بەدرە و جەسان و شارەزوور دەگرێتەوە خۆی و دەگاتە خۆی پاشان خاکی ئازەربایجان و ئەرمێنیا، قوڵایی ئەم هێڵە بەدرێژبوونەوەیەکی گەورە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات لە میحوەرێکەوە دەگاتە نێوان بەسرە و کەرکوک و پاشان هەولێر و مووسڵ و پاشان ئەیالەتی دیاربەکر دەچێتەوە ناویەوە تا دەگاتە بڕێک لە ناوچەکانی ئەرزەرۆم[3]. لە گێژەنی ئەم سیاسەتەدا کوردستان هەموو بنکە و هێزی بەرهەمهێنی لێوە تێکدرا و سەرەنجام

---

[1] Francis Richard, Le siècle d'Ispahan, Gallimard, Paris, 2007 p.40

[2] طه ثلجي الطراونة، المصدر السابق، ص 61

[3] د. سعدی عثمان، كوردستان الجنوبيه...، صص 268-269

هیچ گەشە و پەرەسەندنێکی ئابووری بەخۆیەوە نەبینی. تێکشکان و ئیفلیج بوونی هێزی ئابووری کوردستان لەگەڵ خۆیدا بەپێویستیەوە تێکشکانی فەرهەنگ و ڕۆحانییەتی کەسایەتیی کوردیشی لەگەڵ خۆیەوە هێنا.

## 3-4: له ئازادی نیسبییەوە بۆ پاشکۆیایەتی

دوای کوژرانی نادر شا له 20 ی حوزەیرانی ساڵی 1747ەوە، ئیدی سنووری ئێرانی-عوسمانی ئەو هێندە شەڕ و جەنگی خوێناوی گەورەی بەخۆیەوە نەبینی، بۆیە دەبینین چ له دەورانی سێ ساڵەی کۆتایی حوکمی ئەفشارەکان و چ له دەورانی زەندییەکان (1750-1794) یشدا تاوەکو سەرەتای دەورانی قاجارەکان دەوڵەتی عوسمانی له ململانێ لەگەڵ ئێران گرینگییەکی وای بەم وڵاتە نەداوە، ڕەنگە ئەوەش لەبەر ئەوەبووبێ، کە دەوڵەتی عوسمانی بۆخۆی هێزە عەسکەرییەکەی لە پاشەکشەدابوو و کێشە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی کەڵەکە بووبوون، بۆیە ئەرکی پاراستنی ئەو دەوروناوچانەی، کە لەلایەن ئێرانییەکانەوە لێیان دەترسا، بە تایبەت ناوچەکانی عێراق بەرەو ڕووی والی و سەرکردە ناوخۆییەکان یان هەتا بەرەوڕووی هێزە عەشایرییە ناوخۆییەکانیش کردبۆوە کە پێکەوەش نەدەگونجان، کە ئەمە ڕێگەی بە سوپاکەی کەریم خانی زەند (1757-1779) دا، کە صادق خانی براکەی سەرکردایەتیی دەکرد، ساڵی 1776، بەسرە دوای گەمارۆدانی بۆ زیاتر لە ساڵێك داگیر بکات. بەسرە تا ماوەی سێ ساڵ هەر لەژێردەستی زەندییەکاندا مایەوە، دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی داگیرکردنی بەسرە نە جاڕی جەنگی دا دژ بە ئێران و نە هیچ جوولەیەکی کرداریی کرد بۆ گێڕانەوەی، نە لەلایەن خۆیەوە و نە لەلایەن

پاشاکانی بەغداشەوە و جوولەی کرداریی نەکرد و دوای ئەوە تەنیا ڕاگەیاندنی بڕێک شەڕو تەقۆتۆقی عەسکەریی بوو لەسەر سنووری شیماڵی ناوچەکانی عێراق لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا. زەندییەکان لەبەسرە نەکشانەوە تەنیا دوای کۆچی دوایی کەریم خانی زەند و ئەو پشێوییانە نەبێ کە لە شیرازی پایتەخت دوای کۆچی دوایی کەریم خانی زەند هاتنە ئاراوە[1].

بەڵام کوردستان بۆخۆی لە ناوەوەی خۆیدا لەناو جەنگێکی براکوژی گەورە و کارەساتاویدا دەژیا. ڕووداوەکانی سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم لە کوردستان و ململانێی توونددوتیژی نێوان میر و بەگە کوردەکان هیچ ئازادییەکیان وەکو "نەتەوە" بۆ کورد نەهێشتەوە و سەرووەری کوردستان وەک هەمیشە یارییەک بووە بەدەست میرو بەگە کوردەکان. ئەم ململانێ ناوخۆییە زەقتر و ئاشکراتر لەکۆتایی نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمەوە بەدواوە دیاردەی پاشکۆیایەتی هێنایە ناو میرانی کوردەوە و دواتریش وەکو بۆماوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ زەقتر لە جاران لەناو بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیدا، درەختی ئەم پاشکۆگیریە بەخوێنی کورد ئاو دەدەن.

لە میرنشینی بابان سەلیم پاشای بابان (1742-1747) (1749-1751) بە لایەنگیری و پاڵپشتی ئێران حوکمڕانی قەلاچۆڵانی وەرگرتبوو و لەوساتەوە پشتگیری ئێران بۆ میرەکانی بابان دەستی پێ کرد. ڕاستییەکەی سەلیم پاشای بابان لەگەڵ گەیشتنی بۆ دەستەڵات هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵ بەغدا پچڕاند و هیچ گوێی بە حوکوومەتی بەغدا نەدەدا ددانی بە سەرووەری ویلایەتی بەغدا نەدەنا و بەڵکو هەموو فەرمانێکی کردەنی و نەکردەنی هەر لە ئێرانەوە وەردەگرت و پشتی بە نادر شا بەستبوو و ئیمارەتی بابان هەر بەراستی بوو بووە

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 35.

هەرێمێکی ئێرانی[1]. لە هێرشی بەرفراوانی نادر خانساڵی 1743 بۆسەر دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر مووسڵ، سوپاکەی نادر خان لە ڕێگەیدا بە شارەزووردا هاتووە و لەلایەن سەلیم بەگی میری بابان پێشوازی لێکراوە و سەلیم پاشا پێبەندیی خۆی بۆ نادر خان دەربڕیوە[2] لەم مێژووە بەدواوە ئیدی تا کوژرانی نادر شا ئەمارەتی بابان هەر وەک هەرێمێکی سەر بە ئێران دەهاتە ژماردن[3]. شایانی ئاماژە پێدانە کە دەوڵەتی عوسمانی لەپای هەڵوێستەکانی و پەیوەندی لەگەڵ ئێران زۆر لە سەلیم پاشای بابان تا ڕادەی "سەربڕین" لێی پڕ بوو، لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی بەمێژووی کۆتاییەکانی ئەیلوولی 1747 دا فەرمانێکی ئاراستە کردووە بۆ " ئەحمەد پاشای والی بەغدا و بەسرە، کە پەیوەست بووە بەو ئۆپیراسیۆنە سەربازییەی، کە بۆ خۆی سەکردایەتیی دەکات دژ بە یاخیبوونی سەلیم پاشای موتەسەریفی پێشووی بابان و ئامانج لێی لەناوبردنی خۆی و لایەنگیرەکانیەتی و سەری بڕاوی بنێرنە ئەستەمبوڵ و لە فەرمانەکەشدا هاتووە لەناوبردنی سەلیم پاشا کارێکی پێویستە بۆ بەرژەوەندی

[1] محمد امين زكي، تاريخ السليمانيه و انحائها، ص 74، عبد ربه إبراهيم الوائلي، تاريخ الإمارة البابانية 1784-1851، دار الزمان، دمشق، 2008، ص 111

[2] بەگوێرەی بڕێك گێڕانەوەی مێژوویی، دۆستایەتی سەلیم پاشای بابان و نادر شا لەگەڵ لەشکرکێشی تەمموزی 1733 بۆسەر بەغدا دەستی پێ کردووە و سەلیم پاشای بابان بۆخۆی لەگەڵ هێزی نادر شا بووە لە دوجەیل لە باکووری بەغدا دژ بەو هێزەی سوپای عوسمانی، کە بە سەرکردایەتیی تۆپاڵ عوسمان پاشا بۆ بەهاناوەچوونی گەمارۆی بەغدا نێردراوە و دوای شکستی هێزەکەی نادر شا، سەلیم پاشا بە سەختی توانییەتی لەگەڵ بڕێك لە پیاوەکانی بەسەلامەتی ڕزگارییان بێ و بگەڕێنەوە قەڵاچوالان. بڕوانە سعدی عثمان حسين، إماره بابان، المصدر السابق 48

[3] سعدی عثمان حسين، إماره بابان، المصدر السابق، ص 50

وڵات و خەڵک. هەروەها لە فەرمانەکەدا هاتووە، کە نابێ لە کاتی ئەم ئۆپیراسیۆنە سەربازییەدا هیچ زیانێک بە عەشایر و هۆزە کوردەکانی ناوچەکە بگات"[1].

دوای کوژرانی نادر شای ئەفشاری (1747/6/20) و ئەو ڕەوشەی لە ئێران دروست بوو و ململانێی ناوخۆیی دەسەڵاتدارانی ئێران لەسەر کورسی حوکمڕانی و پشێوییەکانی، باشترین دەرفەتی بۆ والی بەغدا هێنایە پێشەوە بۆ لێدانی بابانەکان و سەرکوتکردنەوە و تەمێکردنیان، کە واپێدەچوو دەمێک بووە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بووە بۆیە دەبینین کەمتر لە مانگێگ دوای کوشتنی نادر شا لەم ڕەوشە تازەیەدا والی بەغدا دەیەویست بەهەر شێوەیەک بێ بەزووترین کات سەلیم پاشای بابان دەستەمۆ بکات و لە ئێرانی دوور بخاتەوە. بۆیە دەبینین تا نادر شا لەدەسەلات بوو والی بەغدا نەیدەویست بیانوو بداتە دەست نادر شا بۆ هێرشکردنە سەر عێراقی عوسمانی لەبەر ئەوە هیچ کاردانەوەیەکی بەرانبەر بە سەلیم پاشای بابان نەنواند. بە کوشتنی نادر شا و ڕەوشی ناجێگیری ئێران دەرفەتێکی زۆر لەبار بۆ والی بەغداد هاتە پێشەوە و بۆ ئەم مەبەستە والی بۆ خۆی بە سەرکردایەتیی لەشکرکێشیەکی گەورەی سەربازیی بەرەو ناوچەکانی ئەمارەتی بابان هەڵکشا و دوای ئەوەی گەمارۆیەکی عەسکەریی توندی خستە سەر، لەشکری عوسمانی بەسەرکردایەتیی وەزیر ئەحمەد پاشا لە کۆتایی مانگی تەمموزی 1747 بەهاوکاری مورتەزا پاشای والی کەرکوك بەرێکەوت. سەلیم خۆی لەقەڵای سرۆچك و شێربەگی برای لە قەمچووغە قایم کردبوو. ئەحمەد پاشا بەرێگەی حەسەن تەپە ئینجا تابین دا گەیشتە سەر قەمچووغە و پەلاماریان دا و گرتیان. ئەحمەد پاشا و هێزەکەی بەرێکەوتن بۆ

[1] عماد عبدالسلام رؤوف (د)، دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، دار الزمان، ط 1، دمشق، 2012، ص 146. سەیرەکەی لەوەدایە لەو کاتە کە ئەم فەرمانە نووسراوە ئەحمەد پاشا کۆچی دوایی کردبوو.

گێچینە، سووسێ، تەپەڕەش، سەرچنار، تەپەکەڵ، بێستانسوور و لەوێوە بەناو دەشتی شارەزووردا بەرەو سرۆچك. لە سرۆچك سەلیم پاشایان گەمارۆدا[1] و سەلیم پاشای بابان ناچار بوو داوای ئەمان بکات و پەیمانی دا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران بپچڕێنێت. والی ئەم وەعدپێدانەی قەبووڵ کرد و گەڕایەوە بۆ بەغدا و لەرێگەی گەڕانەوە بەر لەوەی بگاتەوە بۆ بەغدا لە (دەللی عەبباس) مرد[2]. ڕاستییەکەی سەلیم پاشا لە ڕەوشێکدا بوو نەیدەتوانی بەرگری لەبەرانبەر ئەم هێزە گەورەیە بکات و جگە لەوە والی بەغداش بڵابوونەوەی نەخۆشی تەواو تەنگی پێهەڵچنیبوو بۆیە والی بەغدا بە داواکەی سەلیم پاشا ڕازی بوو[3]. بەڕاستی قۆناغی دوای گەڕانەوەی والی بەغدا و لێخۆشبوونی لە سەلیم پاشا تا کۆتایی ساڵی 1749 ڕووناکییەکی ئاوهای لەسەر نییە وا پێدەچێت سەلیم پاشا ئەو دوو ساڵە لە دەسەڵات نەبووبێ و لادرابێت. (نەشاتی) مێژوونووسی عوسمانی کە بۆ خۆی لەگەڵ هێرشەکەی والی بەغدا بووە دەنووسێ : " والی پێش مردنی سلێمان پاشای بابانی کوڕی خالید پاشای کردۆتە پاشای بابان و عوسمان پاشا بۆ کۆیە و قۆچ پاشاش بۆ ئەربیل"[4] وا دیارە یارییەکەی میرەکانی بابان هێندە نابات پێچەوانە دەبێتەوە پاش دوو ساڵ، لە دەورانی پشێوی و ئاژاوەی پاش مردنی والی بەغدا ئەحمەد پاشا، سولێمان پاشای بابان دوور دەخرێتەوە و سەلیم پاشای بابان دووبارە دەکرێتەوە بە پاشای ئەمارەتی بابان. دەورەکان ئالوگۆڕ دەکرێن و ئەمجارە سەلیم پاشا دەبێتە لایەنگیری عوسمانییەکان و سولێمان پاشا بە هاوکاری میری ئەردەڵان دەیەوێت بگەڕێتەوە

---

[1] نەوشیروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی رۆم و عەجەمدا، هەمان سەرچاوە، لا: 76

[2] محمد امین زکی، تاریخ السلیمانیه و انحائها، ص 74

[3] سعدی عثمان حسین، إماره بابان، المصدر السابق، 55

[4] المصدر نفسه، 56

بۆ حوکمڕانیی ئەمارەتی بابان بەڵام سەرکەوتوو نابێت. وا دیارە دۆستایەتی سەلیم پاشای بابان و دەوڵەتی عوسمانی ناتوانێت لە دوو ساڵ زیاتر درێژە بکێشێت و سەلیم پاشای بابان هەر بەردەوام بوو و وازی لە تەرەفداریی ئێران نەهێنا و هەوای بەرفراوانکردنی سنووری میرنشینەکەی لەسەر دابووە. والی بەغدا (سولێمان پاشا) (1749-1762) ناسراو بە "ئەبولێلە"، کە لە دوای ئەحمەد پاشا بوو بە والی بەغدا و زاوای والی پێشوو بوو زۆر ئامۆژگاری سەلیم پاشای بابانی کرد بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. لەوەش زیاتر سەلیم پاشا لەگەل حاکمی کۆیە و حەریر (عوسمان بەگ) ڕێک کەوت و دەستیان بۆ ناوچەی (زەنگاباد) درێژ کرد و دەستی کردەوە بە جولانەوە دوژمنکارییەکانی دژ بە ئەیالەتی بەغدا و سەرکردە کوردەکانی لە دەوری خۆی کۆدەکردنەوە، چونکە بۆ ئەوە دەچوو ئەمارەتی بابان لە هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانی بەدوور بگرێت. والی بەغدا سلێمان پاشا ئەبولێلە ویستی لەڕێگەی دیپلۆماسییەوە وا بکات سەلیم پاشا واز لە سەرکێشی بهێنێت دژ بە دەوڵەتی عوسمانی، کاتێک والی تێگەیشت ئەم ڕێگەیە نایگەیەنێتە ئەوەی دەیەوێت بەخۆی سەرکردایەتیی لەشکرکێشییەکی گەورەی کرد بۆ پەلاماری ئەمارەتی بابان، والی بەغدا لە مانگی 21 شەعبانی ساڵی 1164[1]ك/ 15 تەمموزی 1751 ی ز بۆ لەشکرکێشیی بۆ سەر سەلیم پاشا دەرچوو[2]. والی بەخۆیی و سوپاکەیەوە گەیشتە دەلی عەبباس، ئارین، قەرەتەپە، گۆکتەپە، چیمەن، ئەسکی کفری، توزخورماتوو کوردەکان بەرگەیان نەگرت و شکان. سەلیم پاشا بە تێکشکاوی

[1] هەرچەندە نووسیاری (گوڵشەنی خولەفا) نووسیوە لەشکرکێشییەکە لە ساڵی (1167ی ک) بووە. بگەڕێوە بۆ: محمد امین زکی، تاریخ السلیمانیه وأنحائها، ص 75، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو مێژووە ( 1167ک/ 1173-1754 ی ز) ،کە مەرتەزا نەزمی ئەفەندی زادە نووسیویە هەڵەیە.

[2] سعدی عثمان حسین، إماره بابان، المصدر السابق، 59

هەڵات بۆ ئێران. پاشای درنە و باجەلانیش ڕای کرد بۆ ئێران. عوسمان پاشا و قۆچ پاشا لە بەرپەچدانەوەی هێرشی لەشکری ئێراندا، شەڕی زۆریان لەگەڵ ئێران کردبوو، نەیانوێرا پەنا بۆ ئێران ببەن. عوسمان پاشا لە کۆیە نەیتوانی بەرگری بکات، هێزەکانی خۆی سازدا و کشایەوە شاخی ئاوەگرد و لەوێ دامەزرا. قۆچ پاشای برایشی لە قەڵای هەولێر دامەزرا[1]. لەم لەشکرکێشییەدا چاوساغ و ڕێنیشاندەرانی سوپا هەر لە کوردەکان بوون و لەگەڵ لەشکرکێشییەکەدا سوارەی سلێمان پاشای بابان، ئامۆزای سەلیم پاشای بابان لە پەلامارەکەدا لەگەڵ لەشکری والی بەغدا بوون. لە ئەنجامدا سەلیم پاشای بابان هەڵات بۆ ئێران و سولێمان پاشا لە پاداشتی پێزانین و هاریکاریکردنی لەگەڵ والی بەغدا پاشایەتی بابانی بۆ خۆی وەرگرت[2]. سەلیم پاشا ڕای کردە ئێران و وەک سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن دوو ساڵ لە ئێران ماوەتەوە و داوای یارمەتی کردووە بەڵام هیچ یارمەتییەکی نەدراوە بۆ گەڕانەوەی بۆ حوکمڕانی قەڵاچواڵان. دەڵێن کەریم خانی زەند بە سوپایەکی دوانزە هەزار کەسیی یارمەتی داوە بەڵام سەرنەکەوتووە و شکاوە[3]. دوای ماوەیەک مانەوە لە ئێران و بێهیوابوون چۆتە بەغدا و داوای عەفووی لە والی بەغدا کردووە، بەڵام لەبەر ڕقی عادیلە خانمی خێزانی والی، کەس ئاوڕی لێ نەداوتەوە و دواجار لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات[4]، گەرچی بڕێک لە سەرچاوە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن کە سەلیم پاشای بابان لە بەغدا لە تۆڵەی هەڵوێستەکانی پێشووی

---

[1] نەوشیروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی رۆم و عەجەمدا، هەمان سەرچاوە لا: 78

[2] بۆ زانیاریی زێتر لەمبارەیەوە بڕوانە: سعدی عثمان حسین، إمارە بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر، مؤسسە موکریاني، اربیل، 2000، صص 51-58.

[3] محمد امین زکی، تاریخ السلیمانیه وانحائها، ص 76

[4] محمد امین زکی، نفس المصدر، ص 77

لەلایەن والی بەغدا لە سێدارە دراوە[1]. لەسەرچاوەیەکی دیکەدا وا هاتووە کە والی بەغدا و عادیلە خانمی ژنی، کە کچی والی پێشوو بووە و سەلیم پاشای بە هۆکاری کوشتنی باوکی زانیوە ویستوویە تۆڵەی لێ بکاتەوە و نیبۆر باسی ئەوە دەکات، کە سلێمان پاشای والی بەغدا، دوای چەندین هەوڵدان توانیویە سەلیم پاشای بابان لەناو ببات ئەوەش دوای ئەوەی " دڵنیایی پێویستی پێی داوە لەسەر دڵسۆزی و دۆستایەتی و عادیلە خاتوون کۆفییەکی لە ئاوریشم بۆ ناردووە وەك دووپاتکردنەوەی ئەم دۆستایەتییە و بەڵگەیەك بۆ لێخۆشبوونی پاشا لێی " جا کاتێك سەلیم پاشای بابان لەژێر کاریگەری ئەم وادانە چووەتە بەغدا دەستگیرییان کردووە و تووڕیان هەڵداوەتە ناو زیندان و ڕۆژی دواتر خنکاندوویانە[2]. تەنانەت نیبۆر یش باسی ئەوەش دەکات، کە عادیلە خاتوون هانی مێردەکەی داوە تا تۆڵە لە سەلیم پاشای بابان بکاتەوە. موقیمیی بەریتانی لە بەغدا کلۆدیوس جیمس ڕیچ باسی ئەوە دەکات کە سەلیم پاشای بابان بە کەمەندی تەدبیر بە دەسیسەی سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشای بابان، حاکمی قەڵاچوالان، کە بۆی دانرابۆوە ساڵی 1171 ك/1757 لەناوچووە[3]. بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان باسی کوشتن و لەناوبردنی سەلیم پاشای بابان دەکەن لە بەغدا بەدەستی والی بەغدا.

دوای دامرکاندنەوەی سەرکێشییەکانی سەلیم پاشای بابان و میرە کوردە هاوپەیمانەکانی، والی بەغدا، سلێمان پاشا (ئەبولیلە) ئەمجارە دەستی ئاوەڵا بوو بۆ لێدانی ئێزیدییەکان و هێنانە ژێرباریان، بۆیە والی ئەمجارە بە بیانووی باج

---

[1] رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص.94

[2] عماد عبدالسلام رؤوف (أ.د)، عادله خاتون صفحه من تاريخ العراق، ط1، بغداد، 1997، صص 28-29، عبد ربه إبراهيم الوائلي، تاريخ الإمارة البابانية 1784-1851، دار الزمان، دمشق، 2008، ص 116.، Rich, op.cit, T1, p 381

[3] عماد عبدالسلام رؤوف (أ.د)، عادله خاتون، المصدر السابق، ص 29

نەدان بەدەوڵەت بەمەبەستی لێدانی کوردە ئێزدییەکان، ساڵی 1753/1752 لەشکرکێشییەکی گەورەی بۆسەر ئێزیدییەکان دەست پێ کرد کە والی خۆی سەرکردایەتیی دەکرد. لەم لەشکرکێشییەدا ژن و منداڵی ئێزدییەکانی بەدیل گرتن و کەللە منارەی لەسەری کوژراوە ئێزدییەکان دروست کرد[1]. لەم هێرشەدا ئەمین پاشا ئەلجەلیلی بە ئەزموون و دڵسۆزیی خۆی بەشداری لە لەشکرکێشییەکدا کرد[2]. والی بەغدا چیای شەنگالی داگیرکرد و گەمارۆی ئێزیدییەکانی دا و دەستی بەسەر ئاواییەکانیاندا گرت. پاشان کە ئێزیدییەکان هاتنە خوارەوە و داوای ئەمانیان کرد، والی فەرمانی بە سوپادا لە هەموو لایەکەوە پەلاماریانی دا تا دوایین کەسیان لێ کوشتن، کە زیاتر لە هەزار پیاو بوون و چەند ژنێکیشان لەگەڵ بوو و لە عەسکەریش دووسەد کەس کوژران[3]. هێرشەکانی والی بەغدا سولێمان پاشا ساڵی 1791 بۆسەر ئێزیدییەکان هێندە دڵڕەقانە بووە تەنانەت وەک سەچاوە مێژووییەکان باسی دەکەن بەقسەی ئەنستاس ماری کەرمەلی یەک ئێزیدیشی لەودیو چیای شەنگاڵ نەهێشتووە[4].

لەگەڵ دەسەڵات بەدەست گرتنی کەریم خانی زەند، دەوڵەتی ئێران گوڕوتینێکی پێداکرایەوە و بەم چەشنە لەگەڵ دوادواییەکەی ساڵی 1773 پەیوەندییەکانی ئێرانی-عوسمانی توندوتیژتر دەبوون و ئاڕاستەیەکی شلەژاوتریان

---

[1] عباس العزاوی، تاریخ العراق بین الاحتلالین، مج 6، بغداد 1954، ص 29، بۆ درێژیی وردەکاریی ئەم هێرشە بڕوانە: د.سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیە...، ص 206-208.

[2] صدیق الملوجي، الیزیدیة، الطبعة الثانیة، بلا مکان، 2010، ص 597

[3] نفس المصدر، ص 597

[4] الأب أنستاس الکرملی،( الیزیدیه)، في مجلة (المشرق)، المجلد الثانی، 1899 بیروت، ص 834.

[4] علاء نورس، المصدر السابق، ص 237-238.

گرتەبەر. ململانێی نێوان میرە کوردەکان لەنێوان خۆیاندا هەردوو دەوڵەتی خزاندە ناو شەڕێکی گەورەوە. ساڵی 1774 محەممەد پاشای بابان (حاکمی قەڵاچوالان)، دوای ئەوەی کێبەرکێ کەوتە نێوان خۆیی و براکانی مەحموود پاشا و ئەحمەد پاشا لەسەر حوکمڕانیکردنی ناوچەکانی کۆیە و قەرەداغ پەنای بردە بەر دەرباری ئێران[1]. کەریم خانی زەند، داوای لە والی بەغدا، عومەر پاشا (1764-1775) کرد لەمبارەیەوە بێتە ناوەوە بۆ گێڕانەوەی محەممەد پاشا بۆ پایەی خۆی، بەڵام والی بەغدا ئەم داوایەی دایە دواوە و لەجیاتی ئەوە فەرمانی دا کە مەحموود پاشای (برای محەممەد پاشای بابان)، کە داوای کۆمەکی لە والی بەغدا کردبوو بکا بەحاکمی قەڵاچوالان[2].

کەریم خان کە ئەو دەم بەنیازی داگیرکردنی بەسرە بوو، دەیەویست بەرەکانی جەنگ دژ بە سوپای عوسمانی فراوان بکات، بۆ ئەم مەبەستە بەسەرکردایەتیی عەلی مورادخان بە دە هەزار جەنگاوەرەوە بۆ گێڕانەوەی محەممەد پاشای بابان بەهێزی چەک لەشکرکێشییەکی گەورەی بۆسەر کوردستان دەست پێ کرد. بەڵام سوپای هاوبەشی عوسمانی و سوپای کوردیی مەحموود پاشا توانیان لە نزیک قەڵاچوالان شکست بە سوپای ئێران بهێنن و سەرکردەی سوپای ئێرانی لەشکرکێشییەکەش بەدیل بگرن[3] و بەگوێرەی یاسین ئەلعەمری ژمارەی کوژراوەکانی ئێران لەم شەڕەدا نزیکەی هەزار (1000) کوژراو بووە[4]. بۆ وەڵامدانەوەی ئەمە، ساڵی 1775 هێزەکانی کەریم خانی زەند لە چەندین لاوە هێرشیان کردە سەر عێراقی عارەبی و کوردستان.

---

[1] علاء نورس، المصدر السابق، ص 237-238.

[2] رسول الکرکوکلی، المصدر السابق، ص 148.

[3] نفس المصدر، ص 149- 150

[4] یاسین العمری، غایه المرام في تاریخ محاسن بغداد دارالسلام، بغداد 1968، ص 186.

سیاسەتی دەرباری ئێران زیاتر بەلای داگیرکردنی بەسرەدا دەچوو، چونکە بەسرە شوێنێکی بازرگانی گرینگی هەبوو، بەڵام بە مەبەستی کردنەوەی زیاتر لە چەند بەرەیەک، هێزێکی بیست هەزاری کەسیی چەند ناوچەیەکی گرینگی خاکی کوردستانی داگیرکرد و بەرەو کەرکووک پێشڕەوی کرد و هێندێک گوندی داگیرکرد. بەڵام هەرزوو تێیدا کشایەوە[1]. ئەمەش دوای ئەوەی محەممەد پاشای بابان گەڕایەوە بۆ پایەی خۆی لە قەلاچوالان و هەروەها دانانی خالید پاشای کوڕی سلێمان پاشا وەک حاکمی بەدرە و جەسان لەلایەن ئەوە[2].

دەرباری ئێران هەموو قورسایی کێشە سنوورییەکانی خستبووە خوارووی عێراقی عەرەبییەوە. ساڵێک زیاتر سوپای ئێران ئابلۆقەی خستبووە سەر بەسرە، لە 16ی نیسانی 1776دا بەسرە لەلایەن سوپای ئێرانەوە داگیرکرا. دەوڵەتی عوسمانی دەیویست بەرەیەکی دیکەی جەنگ لە کوردستاندا بکاتەوە بۆ ئەوەی ئێران سەرقاڵ بکات تا هێزەکانییان ئاڕاستەی ئەوێ بکەن، بۆ ئەوەش ئەرکی ئازادکردنی بەسرە ئاسانتر بێ. بەم شێوەیە فەرمان بۆ حەسەن پاشا (والی کەرکووک) دەرچوو تا بچێتە بەرەی کوردستان و عەبدوڵڵا پاشای والی بەغداش لەم ماوەیەدا ئێرانییەکان لە بەسرە دەربکات. حەسەن پاشا والی کەرکووک ئەم فەرمانەی بەجێهێنا و پێکدادان لەنێوان هێزەکانی ئێران و والی کەرکووک لەناو خاکی کوردستاندا دەستی پێ کرد و چەندین جار سوپای ئێران تێکشکێنرا[3]. کەریم خان فەرمانی بە خەسرەو خانی حاکمی ئەردەڵان دا سوپایەک ئامادە بکات، هەردوو سوپاکە (سوپای عوسمانی و سوپای حاکمی

---

[1] رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص 151.، عباس العزاوي، تاريخ العراق، مج 6، ص 49

[2] د. سعدي عثمان، كوردستان الجنوبيه...، ص 320.

[3] علاء نورس، المصدر السابق، ص 277-278.

ئەردەڵان) لە نزیک مەریوان جەنگێکی خوێناویان بەرپاکرد، لە ئەنجامدا سوپای ئەردەڵان تێکشکا و زیانێکی زۆری لێکەوت[1] وەختایەک کەریم خان ئەم هەواڵەی زانی، سوپایەکی دوانزە هەزاری ئامادەکرد بەسەرکردایەتیی عەلی خانی لوڕیی، بۆ درێژەدان بە جەنگ لە کوردستان. سوپای ئێران توانی سێ لەشکری عوسمانی تێکبشکێنێت و هیچ شتێک نەما ڕێگەیان لێبگرێت تا لەشکرکێشیی نەکەنە سەر کوردستان و کەوتنە لێدانی ئاوایی و ناوچە کوردەوارییەکان و بەدیل گرتنی خەڵکەکەی، بەڵام کوردەکانی بابان لێیان هاتنە دەست و ناچاری پاشەکشەیان کردن[2]. دوای مەرگی کەریم خانی زەند لە ساڵی 1779، شەڕی براکوژی نێوان ئەمارەتی ئەردەڵان و ئەمارەتی بابان کەمێک هێورتر بۆوە. هەروەها هێزی ئەمارەتی بابان لە ئەنجامی ململانێ نێوەخۆ کە بەدەستییەوە گیرۆدەبوو تا دەهات بەرەو لاوازی و کزی دەرۆیشت. دیارە لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین،کە پەیوەندییەکانی عوسمانی-ئێرانی وێرای هەموو شتێک و سەرەرای نوێبوونەوەی ململانێی نێوانیان لەسەر بەسرە ساڵی 1776، کەچی دەبینین پەیوەندییەکانیان ئەرێنی بووە و دواتر ساڵی 1780 عوسمانییەکان بەسرەیان لە دەست ئێرانییەکان وەرگرتەوە. ریمۆن هەقی بووە ، کە بڵێ "گەڕانەوەی بەسرە بەشێوەیەکی یەکجاری دوای سێ سەدە لە جەنگی نێوان ئێران و عوسمانییەکان، چاوچنۆکیی ئێرانی لەسەر عێراق ، بەتایبەت لەسەر بەغدا دورخستەوە" و ئیدی ڕێککەوتن لەسەر سنوور تەوەرەی ململانێی دواتری نێوان عوسمانییەکان و ئێرانییەکانی قۆناغی دوای

---

[1] مەستورەی کوردستانی، سەرچاوەی پێشوو، ل 135-136.، د.سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیه...، ص 322.

[2] محمد امین زکی، تاریخ السلیمانیه وأنحائها، نقله الی اللغه العربیه الملا جمیل الملا احمد الروزبیانی، بغداد، 1951، ص 85-86.

نادر شا بوو تا یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان لەبارەی سنوور لە دوای یەکەم جەنگی جیهانیی[1].

ڕاستییەکی مێژوویی ئەوەیە، کە میرەکانی بابان بە ناوی کوردەوە جەنگیان نەدەکرد، یان نەیاندەتوانی ئەو جەنگە بەناوی کوردەوە بکەن، بەڵکو هەمیشە لەژێر چەتری ئێران یان وەک هێزی سەر بە والی بەغداوە دەجەنگان. ئەوەی بۆ ئەوان گرینگ بوو چۆن غەنیمەکەیان لەناوچەکە دەرپەڕێنن کە لە زۆربەی جاردا برا یان ئامۆزای یەکتری دەبوون، جا بەهەر شێوەیەک و لای کام دەسەڵاتییان بگرتبوایە بۆ ئەوان یەک شت بوو و گرینیگیەکی ئاوهای نەبوو. جەنگی نێوان سێ برا کوردەکە: مەحموود، ئەحمەد و محەممەد پاشای بابانەکان بەدرێژەی بیستەکان و سییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لووتکەی درامایەکی نەتەوەیی کەم وێنەن لەمێژوودا. ئەوشەڕوشۆڕە بەردەوامەی، کە لەنێوان براکانی بنەماڵەی باباندا بەردەوام بوو و بوو بەهۆی هەڵتەکاندنی میرنشینەکە و داهێزرانی هێزی ئەمارەت و وڵاتیشی تووشی کارەسات و وێرانی کرد، کە نە زیانە دارایی و نە زیانە ڕۆحییەکانی لە ئەژماردن نەدەهاتن و جلەوی حوکمڕانییەکەشی لەدەست میرانی بابان هێنرایەوە دەرەوە و لەوەبەدوا کەوتە بندەست دەسەڵاتگەلێکی حاکمڕانی سەر بە (ئێران یا بەغدا)، ئەو میرنشینەی کە- لە دەورانی (ئەورحمان پاشای بابان) بە توانا و هێزی خۆی-دەسەڵاتی (بەغدا)ی دەهەژاند و نیگەرانی کردبوو و کاروباری عێراقی خستبووە دەست میرانی بابان و (ئێران) ی ترساندبوو، لەم دەورانەدا لەژێردەستی چەند هەزار سەربازێکی (ئێران) وەزاڵە کەتبوو و وێران و نابوود بوو، یەکبینە ئاژاوەگێڕی نێوان میرەکانی بابان خۆیان وایکرد ئەو کارەساتەی بەسەردا بهێنێ، کە بوو بە

---

[1] محمد جمال باروت، المصدر السابق ، ص 282

چۆڵەوانی و وێرانە[1]. بەم چەشنە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم دیاردەیەکی زۆر دزێوی پاشکۆیایەتی بۆ ئەم و ئەو دەوڵەت هێنایە ناو میر و بەگەکانی کوردەوە و ئەم ئایدیایە بە درێژایی نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم هیچ سەروەرییەکی بۆ کورد وەکو "نەتەوە" نەهێشتەوە.

[1] محمد امين زكى، تاريخ السليمانيه وانحائها، صص 153-154.

# بەشی چوارەم

## جیۆپۆلیتیکی پرسی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا

1-4 : ئینگیز، ڕووس و فەرەنسایی: ململانێ لەسەر ڕۆژهەڵات.
2-4: کورد: خولانەوە لەناو بازنەیەکی بۆشدا.
3-4 : پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم (28 ی تەمووزی 1823): ڕێکەیەکی بنبەست.
4-4 : کوردستان لەنێوان هەردوو پەیماننامەی ئەرزەڕۆمدا.
5-4 : پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم (31 ی ئایاری 1847): پاییزی کورد.

## 4-1: ئینگلیز، ڕووس و فەرەنسایی: ململانێ لەسەر ڕۆژهەڵات

سەدەی هەژدەهەم بەتایبەت لەنیوەی دووەمیدا، هێزەکانی ئەوروپایی زۆر بەگەرمی لەسەر ڕۆژهەڵات لەململانێیەکی تەواو دابوون. ئینگلیز لە کەنداوی فارس جێگەپێی خۆیان خۆش کردبوو و بەدوای ئیمتیازاتی بازرگانی و جێگەوپێی سیاسیی زۆرتردا دەگەڕان. ساڵی 1763 دامەزراندنی ژووری بازرگانی لە بوشەهر یەکەمین هەنگاوی ئەم سیاسەتە بوو[1]. ساڵێک دواتر موقیمیەی بەریتانیایی لە بەسرە کرایەوە. ساڵی 1788 لەگەڵ کردنەوەی مەڵبەندی بازرگانی لە بەسرە، بەریتانیا بازرگانی کەنداوی فارسی بە تەواوی بۆ خۆی پاوانکرد. کۆلۆنیالیزمی ئەوروپایی لە دەورانی شکۆی زێڕینی هەڵکشان و پەرەسەندنی خۆیدا بوو. بەریتانیا کێشوەری هیندستانی بۆ خۆی پاوانکردبوو و هەمیشە هەوڵیدەدا ڕێگە وشکانی و ئاوییەکانی ئەم کێشوەرە دابین بکات، بێجگە لەوە بەریتانیا دەیەویست پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بەرز ڕابگرێ، بۆ ئەوەی ڕێگە لە هەوڵە فراوانخوازییەکانی ڕووسیا و فەرەنسای ناپلیۆنی بۆ خزینە ناو ڕۆژهەڵات بگرێت.

---

[1] فیروز منصوری، استعمار بریتانیا و مسئله اروندرود، مؤسسه مطالعات تاریخ معاصر إیران، چاپ أول، تهران 1376، ص 38.

ناپلیۆن لە هەمان ساڵەکاندا لەسەر شانۆی سیاسیی ئەورووپا وەدیارکەوت (1814-1795). دەوڵەتی ئێران دەمێک بوو سەرنجی ناپلیۆنی لەبەرامبەر هیندستاندا ڕاکێشابوو[1]. دوای شکستی لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ سەر میسر (1798) ئایدیای داگیرکردنی هیندستان لەسەریدابوو، کە شارەگی بەریتانیا بوو. ناپلیۆن دەیویست ئێران بکاتە ناوەندی ئۆپیراسیۆنی جەنگیی دژ بە هیندستان " گەوهەری تاجی بەریتانی" و بۆ ئەم مەبەستە سوپای ئێران لەسەر دەستی ئەفسەرە فەرەنسایییەکان رابهێندرێن و هەر بۆ هەمان مەبەست لە کۆتایی ساڵی 1800 ناپلیۆن پەیماننامەیەکی لەگەڵ پاول، تساری رووسیا بەست، کە پێی لەسەر بەشداریکردنی هێزەکانی هەردوو ولاتدا دەگرت لە لەشکرکێشیی بڕیارلەسەردراو بۆ داگیرکردنی هیندستان. فەرەنسا بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ فەتحعەلی شا کرد، ئەمەی دوایی پێی وابوو ناپلیۆن باشترین هاوپەیمانە دوای فەشەلهێنانی هاوپەیمانی نێوان تساری ڕووسیا و ناپلیۆن لەبارەی داگیرکردنی هیندستانەوە، بەهۆی کوشتنی پاولی یەکەم لە شەوی 12/11 ی ئاداری ساڵی 1801 لەدوای پیلانگێڕییەك کە بەریتانییەکان لە چنینی پیلانگێڕییەکە بەشداربوون [2].

هەر بۆ هەمان مەبەست بەگوێرەی مێژوونووسی ئینگلیز جان ولیان کی، ناپلیۆن شاندێکی بەناوی زاناستکارانی گژوگیاناسی بۆ ڕۆژهەڵات نارد، بەجۆرێک وەفدەکە لە تاران چاوی بە محەممەد خانی قاجار کەوت (1794-1797) و پێشنیازیان بۆ کرد، کە بەسرە و بەغدا بکەوێتە ژێر دەستی ئێران

[1] ALFRED DE GARDANE., Mission du general Gardane en Perse sous le premier empire. Documents historiques, Paris, 1865, p. 9

[2] خضير البديري (د)، التاريخ المعاصر لإيران وتركيا، منشورات العارف للمطبوعات، بيروت، ط2، 2015، صص 25-26

بەمەرجێک یارمەتی تیپۆ سوڵتان[1] بدات، کە لە دژی ئینگلیزەکان یاخی بووبوو و هەروەها ڕێگە بە فەرەنسایییەکانیش بدات تا لە بەندەر عەبباسدا جێگیر ببن[2].

بیری هاوپەیمانییەکی فەرەنسایی-ئێرانی هەمیشە لەمێشکی ناپلیۆندا ئامادە بوو. لەولای دیکەوە ئێران بۆ خۆی لە ئەوروپا بەدوای هاوپەیمانییەک دەگەڕا، کە بتوانێ دژ بە ڕووسیا بیپارێزێ کە خەریکبوو لەناوی ببات[3]. چەند ساڵ دواتر لە 4ی ئایاری 1807دا فەرەنسا پەیماننامەی فەنکنشتاین[4]ی لەگەڵ ئێران مۆرکرد. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە فەتحعەلی شای قاجار پێویستە جەنگ دژ

---

[1] تیپۆ سوڵتان یا سوڵتان فەتحخان تیپۆ، حاکمڕانی مەیسوور بوو لەساڵی 1782ەوە، یەکێک لە بەرهەڵستکارانی بوونی بەریتانیایی بوو لە هیندستان و ناسناوی (پڵنگی مەیسور) یان لێنابوو.

[2] محمود-محمود، تاریخ روابط سیاسی إیران و انگلیس در قرن نوزدهم، چاپ پنجم، تهران، انتشارات اقبال،1362، ج (1)، ص 56

[3] ALFRED DE GARDANE., op. cit, p. 10.

[4] پەیماننامەی فەنکنشتاین Finkenstien: ئەم پەیماننامەیە لە 4 ی ئایاری 1807 لە کۆشکی فەنکنشتاین لە پروسیای ڕۆژهەڵات لەنێوان نوێنەری فەتحعەلی شای قاجار و ناپلیۆنی یەکەم مۆرکرا. لە ترسی گوشارەکانی ڕووسیا، بە تایبەت بۆسەر قەوقازیا، ئێران خۆی لە ناپلیۆنی یەکەم نزیک کردەوە لەکاتێکدا ئەمەی دوایی لە جەنگدابوو لەگەڵ ڕووسیا. ناپلیۆن گەرەنتی یەکپارچەیی خاکی ئێران و جگە لەوە چەند بەشێکی جۆرجیا و قەوقازیاشی وەک موڵکی ئێران ناسی. هەروەها ناپلیۆن وەعدی دا چەک و ئەسلەحە و ئەفسەر و کرێکار بۆ ئێران بنێرێت لەبەرانبەردا دەبوو ئێران هەموو پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ بەریتانیا بپچڕێنێت و لە ئێران وەدەریان بنێت. بڕوانە:

Iradj Amini, Napoléon et la Perse, Paris, Fondation Napoléon, 1995, 254 p.

بە بەریتانیا ڕابگەیەنێ (بەشی هەشتەم) و ڕێگە بەهێزەکانی فەرەنسا بدات لە ئێرانەوە هیندستان داگیر بکەن، کە ئەمە بەشێک بوو لە نەخشە گەورەکەی ناپلیۆن[1]، بەڵام جەنگی ئێرانی-ڕووسی 1804-1813 ئەم پەیماننامەی خستە مەحەکەوە و هەڵیتەکاند، فەرەنسا ئیلتیزاماتەکانی خۆی بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە وەک لە مەتنەکەدا هاتوون بەجێ نەگەیاند.

بەریتانیا بۆ ڕێگەگرتن لە پلانەکەی ناپلیۆن و ڕێگەگرتن لە نزیکبوونەوەی فەرەنسایی- ئێرانی ئەم دەرفەتەی قۆزتەوە و یەکەمین نێردراوی خۆی بەسەرۆکایەتیی سێر بریدج هارفۆرد* ناردە تاران و ڕێکەوتنێکیان مۆرکرد، کە بەمپێیە شای ئێران ڕەزامەندبوو لەسەر ئەوەی هەموو پەیماننامەیەکی ئێران لەگەڵ دەوڵەتە ئاوروپیەکان هەڵبوەشێنێتەوە و ڕێگە بەهیچ دەوڵەتێکی ئەوروپایی نەدات بۆ گەیشتنە هیندستان خاکی ئێران بەکاربهێنێن[2]. هەر لەم ڕوانگەیەوە لە دوادواییەکەی ساڵی 1800 شاندێک بەسەرکردایەتیی سێر جۆن ماڵکۆڵم چووە تاران و لە کانوونی دووەمی 1801دا، پەیماننامەیەکی بازرگانی لەگەڵ ئێران مۆرکرد، مەبەستیش لەم پەیماننامەیە زیاتر ڕێگەگرتن بوو لە نفووزی فەرەنسا و بەرتەسککردنەوەی پرۆژەی هێرشەکانی فەرەنسا بوو بۆ سەر سنوورەکانی هیندستان[3]. لەهەمان کاتدا بەریتانیا پەیماننامەیەکی هاوبەشیشی لەگەڵ ئیمپراتۆریای عوسمانی دژی ناپلیۆن بۆناپارت مۆرکرد بوو[4]. بەریتانیا و ڕووسیا زۆر بە گەرمی بایەخیان بەسنوورەکانی ئێرانی-عوسمانی دەدا، لەکاتێکدا سنووری ڕووسیای قەیسەری لە باشوورەوە بەسنووری ئێرانی-

---

[1] Encyclopedie de L'Islam, éditions E. J. BRILL, Paris, 1986, t IV, P. 41.

* Sir Harford Brydge

[2] حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 105.

[3] فيروز منصوری، مصدر پیشین، ص 41.

[4] LORIMER, op. cit, p. 1291.

عوسمانییەوە بەندبوو، ئەمە تایبەت بە ڕووسیا. هەرچی بەریتانیا بوو بایەخی بە هەموو ناوچەکانی کەنداو دەدا، کە بۆ پلانە ستراتیژییەکانی ئەم پڕ گرینگ بوون، بە تایبەتی بۆ ڕێگەگرتن لە هێرش بۆسەر هیندستان.

دوای کشانەوەی سوپای فەرەنسا لە میسر لە 1ی ئەیلوولی 1801، پاش ئەوە لە مانگی شەشی ساڵی 1802 پەیماننامەیەکی ئاشتی و دۆستایەتیی فەرەنسایی- تورکی بەسترا. لەساڵی 1806 بەدواوە نفووزی فەرەنسا لە دەرباری عوسمانی تا دەهات زیاتر دەڕۆیشتە پێشەوە بەشێوەیەک فەرەنسا خەریک بوو نفووزی ئینگلیز لەم ناوچەیەدا ڕابماڵێت. ئەوەندە بەسە بڵێین، کە والی بەغدا سلێمان کوچووک، ساڵی 1808 بە پەسنی نوێنەری ناپلیۆن لە ئەستەنبووڵ، مسێو هۆراس سێباستیانی دامەزرا. ئینگلیزەکان لە مەترسی باڵادەستیی فەڕەنسی تێگەیشتبوون. بۆیە هەمان ساڵ ئینگلیز کونسوڵێکی نوێ، (کلۆدیوس جیمس ڕیچ)یان بۆ بەغدا هەنارد، کە هەر زوو بەرەو ڕووی دژایەتی سلێمان کوچووک بۆوە و دواتر لەگەڵ داود پاشا 1817-1831یش بەر یەککەوتن و دواجار داود پاشا، کلۆدیوس جیمس ڕیچی هەر بەیەکجاری لە بەغدا دەرکرد[1]. ڕووخانی مەمالیک لە عێراقی عەرەبی، لەو هۆیانەبوون گەشەی نفووزی بریتانییان لە عێراقی عارەبی و کوردستان زێدەتر کرد، ماوەی 1830-1876 دەورانی زێڕینی نفووزی بەریتانیا بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا، کە توانی بەسەر نفووزی فەڕەنسیدا زاڵ بێت[2]، بەشێوەیەک کە بەسرە و بەغدا و ڕێگە ئاوییەکانی دیجلە و فورات لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ دەوڵەتی بەریتانیا پڕ گرینگ بوون[3].

---

[1] عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث من نهايه حكم داود باشا الى نهايه حكم مدحت باشا، منشورات دار الكاتب العربي، القاهره 1968، ص 284.

[2] المصدر نفسه، ص 285.

[3] فيروز منصوری، مصدر پێشین، ص 45.

دوای ئەوەی جەنگی فەڕەنسا-ڕووسیا بەشکستی ناپلیۆن تەواوبوو و ئیدی ئینگلیز مەترسی نفووزی فەرەنسیی بۆ سەر سنوورەکانی هیندستان لا ڕەویەوە و ئیدی بۆ ئینگلیز لەمەودوا ڕووس بوو بە ئالتەرناتیڤی مەترسیی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز لە هیندستان، بەقسەی سریل ئەلگورد گوتەنی: (دێوی فەرەنسا کە هەمیشە هەڕەشەی لە هیندستان دەکرد، ئێستە بە دێوی ڕووس گۆڕدراوە)[1]. دوابەدوای پەیماننامەی تورکمانچای 1828[2] سیاسەتی

---

[1] AFCHAR, La politique europeen Perse? Quelques pages de l'histoire diplomatique, Paris, 1921, p. 61.

[2] پەیماننامەی تورکمانچای: ڕێکەوتننامەی نهێنی نێوان ئەنگلستان و ڕووسیا (1826) لەبارەی کێشەکانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت لەبارەی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بوو، ئەم پەیماننامەیە دەوڵەتی ڕووسیای قەیسەری سەرپشک کردبوو لە هەر هەنگاوێک کە بیەوێ لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا بینێت. یەکەمین لەشکرکێشی ڕووسەکان بۆ سەر ئێران بوو، نزیکەی دوو ساڵی خایاند. ئۆکتۆبەری ساڵی 1827، جەنەراڵ پاسکۆڤیچ دوای هەشت ڕۆژ جەنگی خوێناوی لە 15 ی ئۆکتۆبەر سەرانسەری سەرزەمینەکانی قەوقازیای داگیرکرد. دە ڕۆژ دواتر تەورێزیشی داگیرکرد. ڕووسیا خەریک بوو خۆی بۆ هێرشی تاران ئامادە دەکرد. شوباتی 1828 ئێران ناچار بوو پەیماننامەی تورکمانچای قەبووڵ بکات، کە ئەم پەیماننامەیە بۆ ماوەی یەک سەدە چارەنووسی ئێرانی دیاری کرد. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە بێجگە لەو ئەیالەتانەی کە بەگوێرەی پەیماننامەی گوڵستان لە ئێران جیاکرابوونەوە سەرباری ئەیالەتەکانی: نەخچەوان، ئێرەوان، تالش، قەرەباغ، شورەگل بە دەوڵەتی ڕووسیاوە لکێندران و بڕی دە کرور (پێنج ملوێن تومان) وەک غەرامە درا بە ڕووسەکان و جگە لەوەش کاپیتولاسیۆنی ڕووسیا بۆ ماوەی یەک سەدە وەکو تووڵەمار لە ملی ئێران گیر بووبوو. بڕوانە: معاهدات و قراردادهای تاریخی در دوره قاجاریه، به کوشش غلام رضا طباطبائی، مجد، تهران، 1373، صص 125-135. بۆ دەقی تەواوی پەیماننامەکە بە زمانی ئینگلیزی بڕوانە:

ڕووسیا لە ئێران وەرچەرخانێکی نوێی بەخۆیەوە بینی. پەیوەندییەکانی ڕووسی-ئێرانی لەچوارچێوەی پەیوەندییەکانی سیاسی-سەربازییەوە گۆردران بۆ شێوازێکی دیکە لە پەیوەندییەکانی سیاسی-ئابووری[1].

هەرچی پەیوەندییەکانی ڕووسی-ئێرانی بوو دوای جەنگێکی درێژخایەن و دوای ئەوەی بەریتانیا و ڕووسیا هاتنە ناو لێژنەی چوارینەی نێودەوڵەتی بۆ هێڵکێشانی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی، دوای ئەوەی بەریتانیا خۆی بەلای دەوڵەتی عوسمانییەوە کێشایەوە، ئێرانیش لەڕووی سیاسیی و بازرگانییەوە بەرەو لای ڕووسیا ڕۆیشت. لە دەورانی ناسرەدین شا (1848-1896)دا بالیۆزخانەی بەریتانیایی و ڕووسی لە تاران سەرچاوەی یەکەمی هێز و ناوەندی دەسەڵات بوون لە ئیدارەکردنی وڵات و هێزەکانی چەکداریدا[2]. دەوڵەتی قاجاری و دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەریتانیا دوو دەوڵەتی تامپۆنی و قایم بوون بۆ پاراستنی کێشوەری هیندستان، بۆ ئینگلیزەکان، هیندستان بوو بە بەرزبوونەوەیان لە دونیادا و دواتر تەوەرەی تەواوی سیاسەتی دەرەوەی، بۆیە ئینگلیز هەمیشە هەوڵیدەدا ڕێگە لە دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی دیکە بگرێ تا نفووزیان لەم دوو وڵاتەدا هەبێ[3].

وەک لەپێشدا گوتمان نزیکەی 60%ی سنووری هاوبەشیی ئێرانی-عوسمانی بەناو خاکی کوردستاندا ڕەتدەبوو و کوردستان کەوتبووە سەر ڕێگەی ویلایەتی بەغدا، کە شارەگی ژیانی ئینگلیز بوو و بەم شێوەیە

---

Hurewitz, J, C, Diplomacy in The Near and Middle East, A Documentary record 1535-1956, t, I, 1èr édition, New York 1956, pp. 96-102

(1) حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 112.

(2) AFCHAR, op. cit, p. 148.

(3) فيروز منصوري، مصدر پيشين، ص 49.

کوردستان گرینگییەکی دووەمی هەبوو بۆ فشار خستنە سەر هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران و بۆ ناچارکردنیان بۆ هاریکاریکردن لەگەڵ ئینگلیز و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز لە ناوچەکەدا[1]. بۆیە لەپلانی سیاسی-عەسکەری ئینگلیزدا کوردستان هەمیشە گرینگییەکی دووەمی هەبووە و سیاسەتی ئینگلیز لەبەرامبەر میر و بەگە کوردەکان بەردەوام لەم بازنەیەدا خولاوەتەوە تا کورد بکاتە هۆیەک بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسییە یەکەمینەکانی خۆی لەناوچەکەدا. سیاسەتی ئینگلیز ڕاگرتنی ستاتووی هەردوو ئیمپراتۆریا بوو لە ناوچەکە بەلاوازیی، دروستکردنی دەوڵەتێک بۆ کورد بە واتای گۆڕینی نەخشەی سیاسیی هەردوو ئیمپراتۆریا بوو، کە ئەمە بەهیچ جۆرێک خزمەتی بەرژەوەندییە کۆلۆنیالەکانی ئینگلیزی نەدەکرد. هەتا هێزە کۆلۆنیالەکانی دیکەش هیچ بەرژەوەندییەکیان لە دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیدا نەبوو. بۆ ئینگلیز و هەم بۆ هێزەکانی دیکەش، مانەوەی هەردوو ئیمپراتۆریا وەک خۆیان چاکتر خزمەتی بەرژەوەندییە سیاسی- ئابوورییەکانی ئەوانیان لە ناوچەکەدا دەکرد.

لەڕاستیدا بەدرێژەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم سیاسەتی ئەم دەوڵەتە کۆلۆنیالیانە ڕاگرتنی هاوسەنگی هێزبوو لە ناوچەکە و دواتر پاراستنی ستاتووی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی بوو[2] و ئەوە تەنیا لەگەڵ دوادواییەکەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بوو کە سیاسەتی هێزە گەورەکان گۆڕا بەرەو پارچە پارچەکردن و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی. لەسەرێکی دیکەوە ئینگلیز دەیویست وەکو (خێڵ) و (تیرە)ی جیاجیا، نەک وەکو یەک (نەتەوە) دەست لە پشتی میر و بەگە کوردەکان بدات،

---

[1] همان مآخذ، ص 60.

[2] عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، صص42-43.

که ئەمەش زیاتر بۆ چاوسوورکردنەوە و بەکارهێنانییان بوو وەک کارتی گوشار بۆسەر بەغدا و کرماشان، کە ئەمە دواتر لە پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆمدا (31ی ئایاری 1847) زۆر بەڕوونی ئەم سیاسەتەی تێدا بەرجەستە بوو.

## 2-4: کورد: خولانەوە لەناو بازنەیەکی بۆشدا

### یەکەم: کوردستان لە دوو دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا

### دیاریی والی بەغدا بۆ ئەستەنبووڵ: سەری بڕاوی کوردەکان

کوردستان هەمیشە مەیدانێک بووە بۆ ململانێ لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی و لە ڕووی ئیدارییەوە کوردستانی خوارووی (کوردستانی عێراقی ئێستە) بەڕەسمی سەر بەویلایەتی بەغدا بووە و لە ناوچەی قەڵەمڕۆی دەسەڵاتدارێتی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووە، بەڵام لەواقیعدا هەمیشە ناوچەیەکی ئێرانی بووە و بەکردەوە لە ناوچەی سنووری دەسەڵاتی قەڵەمڕۆی ئێراندا بووە. ئەم دوانەکییەی دابەشبوونی ڕەسمیی و دابەشبوونی بەکردەوە وایکردبوو کوردستان هەمیشە لەنێوان ئەم دوو دەسەڵاتەدا جۆرە ئازادییەکی نیسبیی بۆ خۆی هەبێ و بە تووندیش کار لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتدا بکات. دەوڵەتی ئێران هەمیشە لە پشتەوەی دەست لەپشتدانی میر و بەگە کوردەکان بووە دژی والی بەغدا و ئەگەر پێویستیشی کردبێ ئەوا بەچەک و یارمەتی لۆجستیکی لووتی لە کاروباری کوردەکان ژەنیووە، لەبەرامبەر ئەمەدا میرانی کورد ئەم یاریکردنەی ئێرانیان بۆ پاراستنی ئازادی نیسبیی خۆیان قۆزتۆتەوە، بەم جۆرە ئەگەر بشێ بڵێین (جۆرە پەیوەندییەکی پراگماتیکی) لە پەیوەندییەکانی ئێرانی - کوردیدا هەبووە.

## 4-2: کورد: خولانەوە لەناو بازنەیەکی بۆشدا

### یەکەم: کوردستان لە دوو دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا

### دیاریی والی بەغدا بۆ ئەستەنبووڵ: سەری بڕاوی کوردەکان

کوردستان هەمیشە مەیدانێک بووە بۆ ململانێ لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی و لە ڕووی ئیدارییەوە کوردستانی خواروو (کوردستانی عێراقی ئێستە) بەڕەسمی سەر بەویلایەتی بەغدا بووە و لە ناوچەی قەڵەمڕۆی دەسەڵاتدارێتی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووە، بەڵام لەواقیعدا هەمیشە ناوچەیەکی ئێرانی بووە و بەکردەوە لە ناوچەی سنووری دەسەڵاتی قەڵەمڕۆی ئێراندا بووە. ئەم دوانەکییەی دابەشبوونی ڕەسمیی و دابەشبوونی بەکردەوە وایکردبوو کوردستان هەمیشە لەنێوان ئەم دوو دەسەڵاتەدا جۆرە ئازادییەکی نیسبیی بۆ خۆی هەبێ و بە توونديش کار لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتدا بکات. دەوڵەتی ئێران هەمیشە لە پشتەوەی دەست لەپشتدانی میر و بەگە کوردەکان بووە دژی والی بەغدا و ئەگەر پێویستیشی کردبێ ئەوا بەچەک و یارمەتی لۆجستیکی لووتی لە کاروباری کوردەکان ژەنیووە، لەبەرامبەر ئەمەدا میرانی کورد ئەم یاریکردنەی ئێرانیان بۆ پاراستنی ئازادی نیسبیی خۆیان قۆزتۆتەوە، بەم جۆرە ئەگەر بشێ بڵێین (جۆرە پەیوەندییەکی پراگماتیکی) لە پەیوەندییەکانی ئێرانی - کوردیدا هەبووە.

پەیوەندییەکانی ئێرانی-عوسمانی لە هیچ دەورانێکدا تەباییان بەخۆیەوە نەبینیوە، بەڵام دوای مەرگی کەریم خانی زەند (1779) لە دوو دەیەی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم تارادەیەک ناوچە کوردییەکان "ئارام" بوون. بەڵام لەگەڵ هاتنی دەورانی قاجارەکان (1794-1925) و بەتایبەتیش لە سەردەمی فەتحعەلی شادا (1797-1834) و دوای هێرشی وەهابییەکان بۆ سەر کەربەلا (21 ی نیسانی 1802) پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو وڵات پشێوی تێکەوت و کێشەکانی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت تەواو پەرەیان سەند. دوای رووداوەکەی کەربەلا بە ماوەیەکی کەم، فەتحعەلی شا سکاڵای ناڕەزایی دژ بە دەستدرێژییەکانی هۆزی کوردیی (بلباس) بۆ سەر سنووری ئێرانی-عوسمانی بۆ دەسەڵاتکارانی عوسمانی دەربڕی. والی بەغدا عەلی پاشا (1802-1807) ساڵی 1803 بۆ خۆی سەرکردایەتیی هێرشی تەمێکردنی کرد بۆ سەر بلباسەکان[1].

ڕەنگە بتوانین ئەوە بڵێین کە زۆرینەی کێشە سنوورییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت لە سۆنگە و ئەنجامی سیاسەتی دابەشدانی خاکی کوردستان بووە لەنێوان خۆیاندا بە بێ ئەوەی ڕەچاوی هیچ هەڵکەوتەیەکی ئیتنیکی، مرۆیی و جوگرافیایی ناوچەکە بکەن. بەدرێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، ناوچە و دەڤەرەکانی شارەزوور هەمیشە زیاتر ناوچەیەکی سەر بە ئێران بوون زیاتر لەوەی ناوچەیەکی عوسمانی بووبن. لە دوو دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، دەوڵەتی قاجار پێشوازی لە میرەکانی کوردستان دەکرد و موچەی بۆ دەبڕینەوە و لە هێندێک ناوچەکانیدا دایدەمەزراندن[2]، بەم جۆرە ئێران بوو

---

[1] مهدی جواد حبیب، "الصراع العثماني-الفارسي وأثره في العراق حتى أواخر القرن التاسع عشر"، في كتاب: (الحدود الشرقيه للوطن العربي)، بغداد، دار الحريه للطباعه، 1981، ص 81.

[2] رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص 177.

بووە نوایەک بۆ حاکمانی کوردستان دوای ئەوەی لەلایەن والی بەغداوە لێدەخران[1]. بەم پێیەیش میرە کوردەکان هەمیشە کارتێکی ئێرانی بوون دژ بە والی بەغدا بۆ فشار خستنە سەر دەوڵەتی عوسمانی. یارمەتی و پشتگیری دەوڵەتی ئێران بۆ میرەکانی بابان هەر لەم پێودانەدا بوو تا والی بەغدای پێبترسێنێ و دەسەلاتی عوسمانی لەناوچەکە لاواز بکات. جگە لەوە چ دەوڵەتی ئێران و چ عوسمانییەکان سەرومڕ خەریکی دادۆشینی ئابووری کوردستان بوون، بە نموونە میرانی بابان ساڵانە (1600) تومەنی ئێرانییان بەناوی دیاری و خەلعەت و باجی ساڵانە بۆ حاکمی کرماشان دەنارد وەک بەشێک لە باجی شوانکارەیی مەڕوماڵاتی عەشیرەتی جاف و عەشیرەتە کوردەکانی دیکە، بۆیە هەوڵیان دەدا لە-هەموو کاتدا- دەستیان لە (شارەزوور)دا هەبێت و حاکمانی بابان گوێڕایەڵیان بن و لە قسەیان دەرنەچن[2].

لە دەڤەری شارەزوور، ئاوڕەحمان پاشای بابان ساڵی 1805 دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەری، لە دەربەندی بازیان هێزەکانی والی بەغدا، عەلی پاشا کەهیە (عەلی دووەم) (1802- 1807) و هێزەکانی ئاوڕەحمان پاشای بابان لە نزیک سلێمانی، لە دەربەندی بازیان لە یەکگیربوون و دوای کوژرانی سێسەد (300) کەس لە لەشکری بابان، ئەوڕەحمان پاشا شکا. والی بەغدا فەرمانی دا سەری دیل و کوژراوە کوردەکانی بابان ببڕن و شەش سندوقی لێوە پڕکردن و وەک دیاریی بۆ ئەستەنبوولی هەنارد[3]. دوای ئەم لەشکرکێشییەی والی بەغدا، شاری سلێمانی لەلایەن هێزەکانی والی بەغدا داگیرکرا و لەلایەن والی بەغدا، خالید

[1] المصدر نفسه، ص 117.

[2] محمد أمين زكي، تاريخ السليمانيه...، ص 138-139.

[3] ياسين العمرى، غايه المرام في تاريخ محاسن بغداد دار السلام، بغداد، 1968، ص 207.

ئەحمەد بابان کرا بە موتەسەریفی سلێمانی و سولێمان ئیبراهیم پاشا کرا بە حاکمی کۆیە و حەریر و ئاوڕەحمان پاشای با پەنای بردە بەر دەوڵەتی ئێران و چووە ئەمارەتی ئەردەڵان لای میری ئەردەڵان ئەمانوڵڵاخان[1]. ئەمەی دوایی کێشەی ئاوڕەحمان پاشای بابانی گەیاندە فەتحعەلی شای قاجار. پەنابردنی ئاوڕەحمان پاشا بۆ دەرباری ئێران پەیوەندییە سیاسییەکانی ئێرانی-عوسمانی شڵەژاند. فەتحعەلی شای قاجار چەندین نامەی بۆ والی بەغدا نووسی و داوای لێکرد ئاوڕەحمان پاشای بابان بگێڕێنێتەوە بۆ پلەی پاشایەتی سلێمانی[2]، بەڵام بێسوود بوو و هەموو هەوڵەکانی هیچ ئەنجامێکی ئاشتییانەیان لێوە شین نەبوو. عەلی پاشا، والی بەغدا وەڵامی نامەی فەتحعەلی شای قاجاری دایەوە و تاوانەکانی ئەورەحمان پاشای بابانی تێدا نووسی و داوای لێبوردنی لە دەسەڵاتکارانی قاجاری کرد و داوای کرد ئەورەحمان پاشا تەسلیم بە بەغدا بکەنەوە. لە ئیستەنبووڵ نازیری حەربییەی عوسمانی داوای لە نوێنەری ئێران کرد، کە بەگوێرەی پەیماننامەی نێوان هەردوو دەوڵەت دەبێ هەڵاتووەکان لە هیچ لایەک قەبووڵ نەکرێن، بۆیە پێویستە ئەورەحمان پاشای بابان تەسلیم بە بەغدا بکەنەوە[3]. بەڵام فەتحعەلی شا سووڕ بوو لەسەر گەڕانەوە و دانانەوەی ئاوڕەحمان پاشا بۆسەر فەرمانڕەوایەتی ئەمارەتی بابان، بۆیە کوڕەکەی شاهزادە محەممەد عەلی میرزا، کە حاکمی کرماشان بوو، ئەم ئەرکەی بەو سپارد. دوای

---

[1] مهدی جواد حبیب، المصدر السابق، ص83-84.

[2] عبدالرزاق مفتون دنبلی، مآثر سلطانیه، تاریخ جنگهای إیران وروس، با مقدمه وفهرستها: غلام حسین صدری أفشار، انتشارات ابن سینا، تهران، 1351، ص 166

[3] بۆ دەقی تەواوی نامەکانی بگەڕێوە بۆ: دکتر محمد رضا نصیری، إسناد و مکاتبات تاریخی إیران (قاجاریە)، انتشارات کیهان، تهران، جلد أول، 1366، نامەی یەکەم، لا: 51-52، نامەی دووەم، لا: 55-56.

ئەوەی شازادە بێهیوا بوو لەوەی کە بەشێوەیەکی ئاشتییانە ئاوڕەحمان پاشای بابان بگەڕێنێتەوە بۆسەر کورسی حوکمڕانی لە سلێمانی، دەستیکرد بە ئامادەکردنی سوپایەک بۆ پشتگیری لە ئاوڕەحمان پاشای بابان و بەباشترین شێوە چەکداری کرد[1].

وەختایەک کە شازادە خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ هێرش بۆ سەر کوردستان و عێراقی عارەبی، والی بەغدا، عەلی پاشا هێزێکی بەسەرکردایەتیی سولێمان پاشای کەهیە نارد و دەستپێشخەری کرد و هەرزوو سوپاکەی والی بەغدا گەیشتە سلێمانی و لەشکری والی بەغدا، بەسەرکردایەتیی کەهیە سلێمان پاشا کاتێك گەیشتە سلێمانی و ویستی زیاتر بچێتە پێشەوە، بەڵام خالید پاشای بابان ئامۆژگاری کەهیە سلیمانی پاشای کرد بوەستێ و پەلە نەکات، بەڵام ناوبراو گوێیی بەم ئامۆژگارییانە نەدا و بەرەو سنووری ئێران بەرێکەوت[2]. هێزەکەی کەهیە چووە ناو خاکی دەوڵەتی قاجاری و هێزەکەی ئاوڕەحمان پاشای بابان لە نزیک مەریوان بەرەو ڕووی هێزەکەی سلێمان کەهیە بوونەوە[3]، لەم بەرەوڕووبوونەودا هێزەکەی والی تێکشکا و سلێمان کەهیە بەدیلی کەوتە دەست ئاوڕەحمان پاشای بابان[4] . والی بەغدا کە ئەوکاتە لە کوردستان لە

---

[1] مستوره، تاريخ اردلان، با مقدمه و تصحيح وتحشيه ناصر آزاد پور، چاپخانه بهرامى 1946، ص 155.

[2] سليمان فائق، تاريخ بغداد، نقله إلى اللغة العربية: موسى كاظم نورس، دار الرافيدين، ص 39

[3] خوسرو بن محمد بن منوچهر، لب التواريخ، دەستنووسی کتێبخانەی نیشتمانیی پاریس، ل 80، هەروەها:

RICH, C, J., Narrative of a residence in Koordistan, t I, London, 1836, p. 384.

[4] سليمان فائق، تاريخ بغداد، نقله إلى اللغة العربية: موسى كاظم نورس، مطبعة المعارف، بغداد، 1962، ص 31، هەروەها: ميرزا محمد تقى لسان الملك سپهر، ناسخ التواريخ دوره كامل تاريخ قاجاريه، انتشارات أمير كبير، تهران، 1337، ص 91.

شاری کفری بوو یەکسەر پەیوەندی بەلایەنی ئێرانییەوە کرد و تکای لێکردن، کە کەهیە و سەربازەکانی ئازاد بکات و بیانگێڕێتەوە بۆ وڵات لەبەرانەر ئەمەدا لە ئاوڕەحمان پاشای بابان خۆش دەبێ و دووبارە دەیکاتەوە بە حاکمی سلێمانی و ئەمە کرا و والی گەڕایەوە بۆ بەغدا[1]. دوای ئەم سەرکەوتنە ئەورەحمان پاشای بابان نامەیەکی عوزرخوازی بۆ والی بەغدا، عەلی پاشا نووسی و داوای بەخشینی لێ کرد. والی بەغدا وەک بەڵگە بۆ قەبووڵکردنی بەخشینەکەی خەلعەتی بۆ ئاوڕەحمان پاشای بابان نارد[2].

دوای جەنگی مەریوان، ئاوڕەحمان پاشا توانی دووبارە بگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی و دەستیبەسەردا بگرێتەوە و تێپەربوونی هێزەکانی عوسمانی بۆناو سنووری ئێران و هێرش بۆسەر خاکی دەوڵەتی ئێران، بیانوویەکی دایە دەست شازادە محەممەد عەلی میرزا بۆ لەشکرکێشی بە ئاراستەی بەغدا، هێزێکی نارد کە دوای گەیشتنی ئەم هێزە بۆ قزلرەبات تاڵانی کرد و دواتر لەشکرەکە گەڕایەوە بۆ ئێران[3]. ئەم بزاوتە گەورە سەربازییەی ئێران، والی بەغدای ناچارکرد ڕازی ببێ بەوەی ئاوڕەحمان پاشا ببێتەوە بە حاکمڕانی (پاشا)ی سلێمانی و لە بەرامبەر ئەوەدا ئێران سلێمان بەگ کەهیە و دیلەکانی دیکە ئازاد بکات[4]. دوای ئەم لەشکرکێشییەی ئێران، بابی عالی نێردراوێکی تایبەتیی خۆی بۆ دەرباری ئێران نارد بۆ زانینی هۆیەکانی ئەم لەشکرکێشییە. دەرکەوت هۆیەکان جگە لە هەڵوێستی دوژمنکارانەی والی بەغدا و هەڵوێستی ئەمسەر و ئەوسەری میرانی کورد بووە، نەخوازەش هەڵوێستی میرەکانی بابان،

---

[1] سليمان فائق، المصدر السابق، ص 31.

[2] مهدی جواد حبيب، المصدر السابق ، ص 85.

[3] رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص 236- 237.

[4] سليمان فائق، المصدر السابق ، ص 31.

بەجۆرێک ئەم میرانە هەموو هەڵوێستێکیان دەقۆزتەوە بۆ سەقامگیرکردنی سەربەخۆیی خۆیان و دوور خستنەوەی دەستێوەردان و لووت تێوەژەنینی هەردوو دەوڵەت لە کاروبارەکانی ناوخۆیاندا، کە ئەم هەڵویستانە لای هەر دوو دەوڵەت ناسراو بوو. دواتر هەردوو دەوڵەت لەسەر ئەوە ڕێککەوتن هێزەکانی ئێران لە سلێمانی بکشێنەوە و ئاوڕەحمان پاشا بگەڕێتەوە بۆ پۆستی پاشای سلێمانی[1].

دەورانی ئەمجارەی ئاوڕەحمان پاشای بابان هێندە تەمەن درێژ نەبوو و جارێکی دیکە والی بەغدا، سلێمان پاشای کوچووک (1807-1810) کەوتە کەلکەلەی لەشکرکێشی بۆ سەر کوردستان، بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتای مانگی حەوتی ساڵی 1808دا لەشکرکێشی کرد بۆ سەر کوردستان، لەم گەلەکۆمەکییەدا سوپای والی مووسڵ و والی شارەزووریش لەگەڵ هێزەیلی دیکە هاوپەیمانییان لەگەڵ والی بەغدا کرد و بەگوێرەی برێک لەسەرچاوە مێژووییەکان ژمارەی سوپاکەی والی دەگەیشتە 70تا 75 هەزار سەرباز. بەگوێرەی کرۆنیکی ئەلعەمری، سوپای کورد و والی بەغدا لە دەربەندی بازیان لە یەکدیگیربوون و سوپای کورد تێکشکا و ئاوڕەحمان پاشا پەنای بردە بەر ئێران. سوپای داگیرکار چوونە ناو شاری سلێمانی و شاریان تالاّن کرد. دوای ئەوە ڕۆژی 17ی تەممووزی 1808 سوپای والی بەغدا شاری سلێمانی بەجێدەهێڵن و بەفەرمانێکی والی، سولێمان پاشای بابان دەکرێتە حاکمی سلێمانی[2].

دوای داگیرکردنەوەی شاری سلێمانی لەلایەن سوپای والی بەغدا، ئاوڕەحمان پاشای بابان، پەنای بردەوە بەر حاکمی کرماشان لە ئێران، بەجۆرێک

---

[1] حسن الدجیلی، المصدر السابق، ص 102.

[2] یاسین العمری، غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، نشره محمد صدیق الجلیلی، الموصل، 1940، ص: 78

که دەوڵەتی ئێران هەمیشە ناوچە و ویلایەتە کوردییەکانی سەر سنووری عوسمانی بە بەشێک لە خاکی خۆی دەزانی و بەهیچ جۆرێک لێی پاشگەز نەدەبۆوە. جەنەڕاڵ گاردان نوێنەری ناپلیۆن لە ئێران لە نامەیەکدا لە 26ی ئابی 1808دا بۆ وەزیری کاروباری فەرەنسای نووسیوە: "جەنابی فەتحعەلی شا بەو هیوایەی بتوانێ لە ڕێگەی ئیستەنبووڵەوە بەئاسانی لەگەڵ فەرەنسا پەیوەندی بگرێ، هەوڵدەدا لەگەڵ بابیعالی پەیوەندییەکی دۆستانە بپارێزێ، بەڵام دەرهەق بەو هەرێمە تورکییانەی، کە هاوسنووری ئێرانن بەهیچ جۆرێک ڕەوتاری خۆی ناگۆڕێ و هەمیشە لە ناکۆکییەکانی نێوان پاشاکانی بەغدا و سلێمانیدا دەست تێوەردان دەکات. هێزەکانی ئێران بەرەو سنووری کوردستان جولەیان پێکراوە، دەتوانین پێشبینی ئەوە بکەین وێڕای ئەو گەرەنتییە پۆزەتیڤانەی کە لەلایەن وەزیرەوە دراون، ئەوە ڕێگە لەوە ناگرن کە ئەم هێزانە نەچنە ناو خاکی عوسمانییەوە "[1]. فەتحعەلی شا، نامەی بۆ والی بەغدا نووسی و بەگەرمی داوای لێکرد ئاوڕەحمان پاشا بگێڕدرێتەوە بۆ پۆستی حوکمڕانی سلێمانی، بەڵام والی داوایەکەی ڕەتکردەوە و دەرگای دۆستایەتیی کلیلدا[2]. چەندین جار وەفدی هەردوولا چاویان بەیەک کەوت، ئێران داوای کرد حوکمڕانی ناوچەی شارەزوور بدرێتەوە بە ئاوڕەحمان پاشای بابان، بەڵام والی بەغدا سەرپێچی دەکرد.

ئەم گرژییە دیبلۆماسیەی ئێرانی-عوسمانی لە کاتێکدا بوو کە فەرەنسا بەدوای ئەوەدا دەگەڕا هاوپەیمانێتییەک لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا دژ بە ئینگلیز و ڕووسیا دروست بکات. لەسەرێکی دیکەوە هەم ئێران لەژێر هەڕەشەی ڕووسیا دا بوو، هەم والی بەغداش لەناو کۆمەڵێک کێشەی ناوخۆییدابوو، ئەم ڕەوشە مێژووییە بۆ چەند ماوەیەکی کەم، ئاشتییەکی بێ

---

[1] ALFRED DE GARDANE., op. cit, p. 184-185.

[2] خوسرو بن محمد بن منوجهر، مصدر پیشین، ص 77.

سبەینێی لەنێوان ئاوڕەحمانی پاشای بابان و والی بەغدا سلێمان پاشادا دروست کرد. جەنەرال گاردان لە ڕاپۆرتێکدا بۆ شامپانی وەزیری دەرەوەی ناپلیۆنی نووسیوە: "هەر ئێستە ڕاستیی ئەم هەواڵەم پێگەیشتووە کە ئاورەحمان پاشای بابان خەلعەتی پاشایەتی شارەزووری بۆهاتووە. بەڵام وا دەردەکەوێ ئەم ئاشتبوونەوەی نێوان سلێمان پاشا و ئاغا کوردەکە هەر تەنیا ڕواڵەت بێت"[1].

چەند ساڵێک دواتر، پەیوەندییەکانی ئاوڕەحمان پاشای بابان لەگەڵ ئێران و عوسمانی بەرەو گرژی دەرۆیشتن: دوای شەڕی مەریوان، ئاوڕەحمان پاشا بیری ئازادی کوردستانی لە مێشکیدا چەقیبوو لە کاروبارەکانی حوکومڕانی ناوخۆیدا سەربەخۆییێکی تەواوی وەدەست هێنابوو، تەپڵی دوژمنایەتی لە دژی هەردوو دەوڵەتی ڕۆم (عوسمانی) و عەجەم (ئێران) دەکوتا و ڕووی لە هەردووکیان وەرگێڕا بوو[2]. مێژوونووسیی کرۆنیکی (مێژووی بەغدا) سلێمان فایق بەگ دەنووسێ کە ئاوڕەحمان پاشا پەیوەندی بە نوێنەری عوسمانی، حاڵەت ئەفەندی کردووە و پێشنیازی ئەوەی بۆ کردووە کە ساڵانە پێنج هەزار بەدرە دەدات ئەگەر دەوڵەت پایەی ویلایەتی بەغدا، بەسرە و شارەزووری پێ بدات[3]. حالەت ئەفەندی ئەم پێشنیازە و بەڵێنامەیەی بەهاوەڵی یەکێک لەو ئاغەواتانەی کە جێگەی متمانەی بوون بۆ ئەستانە ڕەوانە دەکات، لەسەرووبەندی مانەوەی حاڵەت ئەفەندی لەم وڵاتەدا پیاوانی دەوڵەت لە ئەستانە لەمبارەیەوە ڕاوێژیان پێ کردبوو، وەڵامی ئەو ئەوە بوو، کە ئەم بڕە پارەیە بەشێوەیەکی ئاسایی لەلایەن والیانی بەغداوە دابین دەبێت و پێدانی ئەم مەنسەبە بە ئاوڕەحمان پاشای بابان تووڕەیی مەمالیکەکان دەوروژێنێ و دەبێتە

---

[1] ALFRED DE GARDANE., op. cit, p. 212-213.

[2] مەستوورەی کوردستانی، سەرچاوەی پێشوو، ل 180.

[3] سليمان فائق، المصدر السابق، ص 41.

هۆی خوێنڕشتن و پشێوی بێکوتایی و دواجار وڵات دەخاتە باوەشی بێگانان و بەتایبەتیش ئێرانییەکان لە سۆنگەی مەیلی بابانییەکان بۆ ئێرانییەکان. مێژوونووسیی (مێژووی بەغدا) سلێمان فایەق خۆی لە ئیستەنبووڵ بووە و بەچاوی خۆی ئەو ڕاپۆرتەی بینیووە کە بە دەستخەتی حاڵەت ئەفەندی نووسرا بوو[1].

ساڵی 1811 بۆ ماوەیەکی کەم پەیوەندییەکانی نێون شازادە محەممەد عەلی و ئاوڕەحمان پاشای بابان تێکچوو، بۆیە ئەمجارە هەم ئێران و هەم والی بەغدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە بەهەر ڕێگەیەک بێ دەبێ ئاوڕەحمان پاشا لێبخەن، بۆ ئەم مەبەستە شازادە محەممەد عەلی بەخۆیی سوپایەکی گەورەوە بەرەو ناوچەکانی کوردستان هەڵکشا و لەکۆیە نزیک بۆوە، کە ئاوڕەحمان پاشا خۆی تێدا قایم کردبوو و گەمارۆی دا. ئاورەحمان پاشا کارتێک بوو هەریەکەیان دەیەویست یاری پێوە بکات و بۆ ترساندنی لای دیکە سوودی لێوەربگرێت. لەم پێودانگەوە هەرچی پەیوەندی بە هەڵویستی کورد هەیە لەم ململانێیەدا، یەکێك لە توێژەرەکان ئاماژە بەوە دەکات، کە کوردەکان بەگوێرەی سەرکەوتنی هەر لایەکیان لە شەڕەکە ڕەوتاری خۆیان دەگۆڕی و سوودیان لە هەڵکەوتەی شوێنی سەرسنووریی وڵاتەکەیان لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ململانێکار وەردەگرت بۆ پەیرەوکردنی سیاسەتیی یاریکردن لەسەر دوو پەت، کە میرەکانی بابان بەتایبەتی لەبەکارهێنانی ئەم سیاسەتە تەواو کارامە بوون و بە شێوەیەکی تایبەت بەکاریان دەهێنا[2]. لەم پێودانگەوە میر و بەگە کوردەکان دەیانەویست یاری بە ناکۆکییەکانی نێوان هەردوولاوە بکەن بۆ گەیشتن بەئارمانجەکانی خۆیان و هەردوولاش دەیانەویست یاری بە میر و بەگە

---

[1] المصدر نفسه، ص 42.

[2] د. سعدی عثمان، کوردستان الجنوبیة....، ص 276

کوردەکان بکەن. هەروەک ریچ گوتەنی: "بێگومان ئەمە پرسی "فریودان بەرانبەر بە فریودان بوو"، بەم شێوەیە پاشای بەغدا هەوڵی دەدا هەر یەکە لە پاشای کوردستان و شازادەی کرماشان هەڵبخەڵەتێنێ، لەکاتێکدا هەرچی شازادەی کرماشان بوو هەر یەك لە پاشای بەغدا و پاشای کوردستانی هەڵدەخەڵەتاند. ئەوانیش بە کۆمەڵ و بەتاك هەموویان هەوڵیان دەدا لە شوێنی خۆیانەوە فێڵ لە بابیعالی بکەن، کە بێگومان لە هەموو ئەوانی دیکە زیان بەرکەوتووتر دەردەچوو، کە لە هەموو کاروبارەکان وایدەکرد خۆی ببێتە دوژمنی هاوبەشی هەمووان [2].

هێندەی نەبرد هەرزوو پەیوەندییەکانی شازادە محەممەد عەلی میرزا و ئاوڕەحمان پاشای بابان چاک بوونەوە و دوای پانزە ڕۆژ لە گەمارۆدانی شارۆچکەی کۆیە، رێککەوتن حوکمڕانی سلێمانی بدەنەوە دەست خالید پاشا و کۆیە و حەریریش بدەنە ئاوڕەحمان پاشا و بەمە شازادە خۆیی و هێزەکەی گەڕایەوە کرماشان[1]، بەڵام هەر زوو ئاوڕەحمان پاشا دەستی بەسەر شاری سلێمانیشدا گرتەوە.

---

[2] RICH, op. cit, p. 72.

[1] علاء نورس، حكم المماليک في العراق 1750-1831، بغداد، 1975، ص 220.

## دووەم: جەنگی کفری 18ی حوزەیرانی 1812

### کەللە منارە لەسەری کورد!

سیاسەتی والییەکانی بەغدا لە بەرامبەر میر و بەگە کوردەکان هەمیشە ئەوەبووە، کە هەرزوو لێیان بخەن و ڕێگەیان پێ نەدەدان دەست بەخۆیاندا بهێننەوە و ببنە هێزێک تا لە ڕووی والی بەغدا بوەستنەوە. ئاوڕەحمان پاشا بە بیانووی دەست درێژیکردنە سەر ئاواییەکان و ملهوڕێتی، لە زستانی 1811 لەلایەن والی بەغداوە لێخرا[1].

بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە، هاوینی ساڵی دواتر والی بەغدا هێرشێکی گەورەی بۆسەر کوردستان دەستپێکرد کە خۆی سەرکردایەتیی دەکرد بۆ تەمێکردنی ئاوڕەحمان پاشا و وەک مەستوورەی ئەردەلانی بە ئاماژەپێکردنێکی زیادەڕۆییانەوە گوتەنی والی بەغدا سوپایەکی لە ژمارەی ئەستێران زیاتری ئامادەکرد[2] و ڕۆژی پێنجشەممە 18-6- 1812 جەنگێکی خوێناوی لەنێوان هەردوولا لە نزیک کفری[3] بەرپابوو. سەرەتای جەنگەکە

---

(1)LONGRIG, op cit, p. 233.

(2) مستورە، تاریخ اردلان، ص 159.

(3) لەبارەی مێژووی جەنگی کفرییەوە ڕای جیاجیا هەیە، سەرچاوە کوردییەکان بەهەڵە ساڵی 1808 دەستنیشان دەکەن: بڕوانە: د.جمال نبز، الامیر الکردی میر محمد الرواندزی، اربیل، 2003، ص. 95، سەرچاوەی دیکەی کوردی تەنیا ساڵی جەنگەکە بە ساڵی 1812 دەستنیشان دەکات و ئاگادارییەکی زیاتر بەدەستەوە نادات ( بڕوانە: محمد امین زکی، تاریخ السلیمانیە... ، ص 127، بەڵام ریچ ساڵی 1811/1226 دەست نیشان دەکات، بگەڕێوە:

RICH ،op. cit, TI, p. 387.

سەرکەوتن هی سوپای بابانەکان بوو، بەڵام لەدوایین جاردا ئاگری تۆپەکانی سوپای والی بەغدا، کە عەبدوڵلا پاشا خۆی سەرکردایەتیی دەکرد، بەرگرییەکانی سوپای کوردیان تێکشکاند و ئاوڕەحمان پاشا لەگەڵ بیست هەزار لە سوارچاکەکانی خۆی هەڵاتن بۆ ئێران و سوپای والی بەدوایاندا کەوتن و دواتر لە گۆڕەپانی جەنگدا وەکو عادەتی باوی ئەودەم بۆ ترساندنی دوژمن سوپاکەی والی چەندین کەللە منارەیان لە سەری کوژراوە کوردەکان دروست کرد[1]. جەنگی کفری و پەنابردنی ئاوڕەحمان پاشای بابان بۆ کرماشان دەرفەتێک بوو بۆ دەرباری قاجار بۆ ملدانەواندنی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەت لەکاتێکدا فەتحعەلی شا ڕقی لە دەوڵەتی عوسمانی هەڵگرتبوو، کە بەبێ راوێژی ئەم لەگەڵ ڕووسیا وتوێژی کردبوو[2] و ڕێککەوتنامەی (بوخارست)ی مۆر کردبوو، کە لەم ڕێکەوتنامەیەدا بەهیچ جۆرێک نە بەرژەوەندییەکانی ئێران لەبەر چاوگیرابوون و نە بەهیچ کلۆجێ ناوی ئێرانیشی تێدا هاتبوو.

---

هەرچی ئیبن سندە ساڵی 1812 دیاری دەکات بڕوانە: مطالع السعود... ص 276، بەڵام ڕووداونووسیی والی بەغدا، رەسوول کەرکووکییە دروست ڕۆژی دەرچوونی والی بەغدا و سوپاکەی دەستنیشاندەکات بەرەو کوردستان کە ڕۆژی 2ی حوزەیرانی 1812، بڕوانە: دوحة الوزراء، ص 256. دواجار LORIMER, J, G ڕۆژی تەواوی جەنگەکە تۆمار دەکات کە ڕۆژی 18ی حوزەیرانی 1812یە. بڕوانە: LORIMER, J, G., P. 1130 بەمپێیە ئەمە یەکەمینجارە بە دروستی مێژووی جەنگی کفری دیاری بکرێت.

[1] الشيخ عثمان بن سند البصرى، خمسه وخمسون عاما من تاريخ العراق 1118هـ- 1242 هـ القاهره، المطبعه السلفيه، 1952، ص 115.

[2] علاء نورس، حكم المماليك في العراق...، ص 222.

## سێیەم: کورد و بەرتەکی ئێران

دوای ئەوەی ئاورەحمان پاشای بابان پەنای بردە بەر دەرباری ئێران، شازادە محەممەد عەلی میرزا، حاکمی کرماشان لای والی بەغدا نێوانگیری بۆ کرد و نامەیەکیشی بۆ نارد و داوای لێکرد لە ئاورەحمان پاشای بابان ببوورێ. بەڵام والی گوێی پێ نەدا. دوای ئەم ڕەتکردنەوەیەی داوای حاکمی کرماشان. هێزەکانی شازادە بڕیاریان دا هێرش ببەنە سەر بەغدا، لە کرماشانەوە هێزەکانی شازادە هەڵکشان تا گەیشتنە ئاوایی قزلرەبات[1].

والی بەغدا لەبەرکێشەکانی ناوخۆی نەدەپرژایە سەر جەنگ و کەوتە سازشکاری لەگەڵ شازادە و بڕیاری دا ئاورەحمان پاشا بگەڕێنێتەوە بۆ پۆستی پاشای سلێمانی وەکو پێشوو، هەروەها بۆ دڵڕاگرتنی ئێرانییەکان چەردەیەک پارەشی بە دیاریی بۆ شازادە محەممەد عەلی میرزا نارد[2]. سەرەتای ساڵی 1813 هەردوو دەوڵەت کەوتنە وتوویژ و لەم باسە گرینگانەی کە هەردوو دەوڵەت لەسەری کێشەیان بوو:

1- داواکردنی ئێران بەوەی ڕای هەبێ لە دامەزراندنی حاکمانی سلێمانی.

2- دانی بڕێک پارەی ساڵانە لەلایەن حاکمانی سلێمانی بۆ ئێران.

3- کێشەی گواستنەوەی عەشایرە کۆچەرنشینەکان لەنێوان خاکی عوسمانی و ئێران.

4- کێشەی مامەڵەکردن لەگەڵ زیارەتکارانی شوێنە پیرۆزەکان.

5- کێشەی کورد و داڵدەدانی پەنابەرەکان[3].

---

[1] المصدر نفسه، ص 222

[2] رسول الكركوكلي، المصدر السابق ، ص 145.

[3] جودت، تاريخ جودت، ج (10)، ص 121- 122 . ڕاگوێزراوە لە : عبدالعزيز سليمان نوار، داود باشا... ، ص 162.

بەڵام هەرزوو وتووێژەکان بە بنبەست گەیشتن و لەم سۆنگەیەوە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا بەشڵەژاوی مانەوە. لەم سەروبەندەدا بوو هەواڵهات، کە ئاورەحمان پاشا بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد (19 ی نیسانی 1813). شایانی گوتنە دەوڵەتی ئێران لە دەورانی حوکمڕانی ئاورەحمان پاشادا نفووزێکی زۆری لەناوچە کوردنشینەکان پەیداکرد، هەتاوەکو هێندێک ناوچە کە جێگەی گومان بوون لەنێوان هەردوولادا، ئێران داگیری کردن، هەروەها ئێران هەندێک ناوچەی سەر بەعێراقیشی داگیرکرد و ناوچەکانی (زەهاو) و دەرتەنگ، قەسری شیرین کە ئەمانە بەشێک لە کوردستانی بندەستی عوسمانی بوون داگیرکرد[1].

[1] عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا...، ص 162.

## چوارەم : کورد و داود پاشا

دوای مەرگی پاشای کوردستان، ئاوڕەحمان پاشا لە 19ی نیسانی 1813دا، مەحموود پاشای کوڕی لە جێگەی ئەودا بوو بە پاشای کوردستان. لە هاوکێشەی ململانێی نێوان دەرباری ئێران و والی بەغدادا، کوردستان هەمیشە ئەمبەر و ئەوبەری دەکرد. والی بەغدا سەعید پاشا (1813-1816) لە ساڵی 1816 بڕیاری لێخستنی بۆ مەحموود پاشای دەرکرد و عەبدوڵڵا بەگی برای (کە لە بەغدا جێنشین بوو) لەشوێنی ئەو کرد بە حاکمی سلێمانی، بەڵام حاکمی کرماشان هێزێکی دە هەزار (10.000) سەربازی بۆ کۆمەگی مەحموود پاشای بابان ڕەوانەی سلێمانی کرد و عەبدوڵڵا بەگ ناچار بوو هەر هەمان ساڵ گەڕایەوە بۆ بەغدا[1].

ساڵی 1816 لەگەڵ بەدەسەڵات گەیشتنی والی بەغدا، داود پاشا (1816-1831) بۆ پایەی والی بەغدا ئەو کێشە بچووك و کێشمەکێشە عەسکەرییە دیاریکراوانەی، کە پێش دەورانی داود پاشا ڕوویان دەدا، گۆڕدران و بوون بە داگیرکاری و ڕووبەڕووبوونەوەی عەسکەریی بەرفراوان لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران، کە ڕەنگە ویستی داود پاشا بۆ خۆی هۆکارێك بووبێ لەو هۆکارانەی کە زیاتر ئاگرەکەیان خۆش دەکرد[2]. لێرەوە دەورەیەکی نوێ لە ژیانی سیاسیی کوردستان دەستی پێ کرد. داود پاشا ویستی ڕادەیەک بۆ دەستێوەردانی ئێران لە کوردستان دابنێ و بۆ ئەم مەبەستە ساڵی 1818 میهردار عینایەتوڵڵا ئاغای بۆ سلێمانی نارد تا چاو لە مەحموود پاشای بابان سووربکاتەوە و ئامۆژگاریشی بکات واز لە هاوپەیمانییکردن لەگەڵ ئێران بهێنێ. بەڵام مەحموود پاشا بەتوندی ئەوەی ڕەتکردەوە، چونکە لای وابوو تەرازووی هێزی کرماشان لە

---

[1] مهدی جواد حبیب، المصدر السابق، ص 92.

[2] أ.د. جمیل موسی النجار، المصدر السابق، ص 36

هێزی والی بەغدا بەرزترە و لە سەرێکی دیکەشەوە هەمووی ماوەیەکی کورتە، کە داود پاشا بە زەبری شمشێری کورد[1] دەسەڵاتی بەدەست گرتووە، بۆیە لەم ڕەوشەدا داود پاشا ناتوانێ هێرش بکاتە سەر کوردستان[2]. دوای ئەوەی مەحموود پاشای بابان، خواستەکانی داود پاشای ڕەتکردنەوە، والی بەغدا بە فەرمانێکی ڕەسمی مەحموود پاشای لە حاکمڕانی کۆیە و حەریر لێخست و ساڵی 1818 هێرشێکی تەمێکردنی بەسەرۆکایەتیی عینایەتوڵڵا ئاغا بۆ سەر کوردستان دەست پێ کرد[3].

بەردەوامی ململانێ و ناکۆکی باوی ناو بنەماڵەی بابان هەمیشە هۆیەک بووە بۆ شکاندنی کورد خۆی، وەختایەک مەحموود پاشای بابان بە نزیکبوونەوەی ئەم لەشکرکێشییەی زانی داوای حەسەن بەگی براکەی کرد، کە حاکمی قەرەداغ بوو سەفەری ئێران بکات بۆ چاوپێکەوتنی شازادە محەممەد عەلی میرزا. بەڵام حەسەن بەگ لە بریتی ئەوەی بچێتە ئێران ڕووی خۆی وەرسووڕاند و بەخۆیی و پێنجسەد سوارەوە چوو بۆ بەغدا. لە بەغدا خۆی خستە بەرفەرمانیی داواد پاشا کە پێشوازیی لێکرد، هەرچی عینایەتوڵڵا بوو توانی بەو هێزەی کە لەگەڵیدا بوو و پشتبەستوو بە

---

[1] داود پاشا بەر لە دەسەڵات بەدەست گرتن چووە سلێمانی و ماوەی چل (40) ڕۆژ میوانی مەحموود پاشای بابان بووە و لەوێوەوە بەکۆمەگی زۆری سوارەی کوردەوە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. بڕوانە: عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا، ص 164. شایانی گوتنە داود پاشا هەر لە سلێمانییەوە بە پاڵپشتی و بەزەبری شمشێری پیاوە ئازاکانی مەحموود پاشای بابان و بە زەبری هێزی پێنج تا شەش هەزار سوارەی کوردی بابان توانی پاشایەتی بەغدا بگرێتە دەست، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: تاریخ بغداد، صص 62-64.

[2] علاء نورس، حکم الممالیک...، ص 226.

[3] رسول الکرکوکلی، المصدر السابق، ص 283.

سەربازەیلی ئەربیل و هۆزەیلی شەمامک و دزەیی توانی دەست بەسەر کۆیە و حەریر دا بگرێت و نامەی بۆ والی داود پاشا نووسی و ئەم هەواڵەی پێراگەیاند، والی فەرمانێکی دەرکرد بە دامەزراندنی حەسەن بەگ وەک حاکمی کۆیە و حەریر ولەگەڵ پێدانی پلەی پاشایەتی پێی[1]. والی بەغدا خەریکی لەشکرکێشی بوو بۆ سەر سلێمانی بەکۆمەکی و هاوپەیمانیی سەربازانی هەولێر و عەشایرەکانی شەمامک و دزەیی، حەسەن بەگی برای مەحموود پاشای بابان، بەخۆیی و پێنج سەد سوارەوە بۆ پاڵپشتی کردن لە والی بەغدا هەڵاتە بەغدا. لە پاداشتی ئەمەدا والی، حەسەن بەگی کرد بە حاکمی کۆیە و حەریر و پلەی پاشایەتیشی بۆ نارد[2]. لەو لای دیکەوە مەحموود پاشای بابان بۆ پێشگیری لە لەشکرکێشی والی بەغدا، داوای کۆمەکی لە دەرباری ئێران کرد. دەوڵەتی قاجاری سێ سوپای بۆ پشتگیریی مەحموود پاشا هەنارد، هەریەکە و لە قۆڵێک.

قۆڵی یەکەم: سوپایەک بەسەرکردایەتیی محەممەد عەلیخانی بەیاتی بەخۆیی و 10 هەزار سەربازەوە بەرەو کوردستان.

قۆڵی دووەم: سوپایەک لە هێزەکانی لوڕستان بە سەرکردایەتیی حەسەن خانی فەیلی بەرەو مەندەلی.

قۆڵی سێیەم: سوپایەک بەسەرکردایەتیی عەلیخانی کەلهور و کەلب عەلیخانی گەرۆس بەچوار هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو بەدرە و جەسسان[3].

لە بەرامبەر ئەمەدا والی بەغدا، داود پاشا ئامادەیی تەواوی خۆی وەرگرت بۆ بەرپەچدانەوەی هێرشەکانی ئێران. ئەم ئامادەییە لێبڕاوانەیەی والی بەغدا، حاکمی کرماشان شازادە محەممەد عەلی والێکرد، کە بۆخۆی سەرکردایەتیی

---

[1] عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا...، ص 164.

[2] عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا...... ص: 164

[3] علاء نورس، حکم الممالیک...، ص 227.

هێرشەکە بکات[1]. شایانی گوتنە چ هێزەکانی والی بەغدا و چ هێزەکانی حاکمی کرماشان بەشی زۆریان لە جەنگاوەرە کوردەکان خۆیان بوون. سوپای ئێران و سوپای والی بەغدا لە پای تاق لەناو خاکی کوردستان پێکدا هەڵپڕژان و چەند پێکدادانێک دروست بوو. هەردوو لا لە سۆنگەی کۆمەڵێک کێشەی خۆیانەوە دەیانەویست کێشەکە بەئاشتی چارەسەر بکەن، دەوڵەتی قاجاری لەبەر مەترسیەکانی ڕووسیا و والی بەغداش لەبەر هەڵگەڕانەوەی عەشایرەکانی خواروو، بەم جۆرە هەردوولا نەدەپڕژانە سەر بەردەوامبوونی جەنگ. بۆ ئەم مەبەستە داود پاشا و شازادە محەممەد عەلی میرزا گەیشتنە وتووێژ و مفاوەزەی ئاشتی[2] هەردوولا لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێککەوتن، کە هەموویان لە نزیکەوە پەیوەندییان بە ئەمارەتی بابانەوە هەیە:

1- مەحموود پاشای بابان، حاکمی سلێمانی لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوە و لەگەڵ ئەمەیش حوکمدارێتی کۆیە و حەریریشی پێدەدرێ، بەمەرجێک گوێڕایەڵیی لە فەرمانەکانی والی بەغدا بکات.

2- لێبوردن لەوانەی هەڵاتوون بۆ ئێران و گێڕانەوەیان بۆ شوێنی خۆیان.

3- کشانەوەی هێزەکانی قاجاری لە دەوروبەری مەندەلی و بەدرە و جەسسان[3].

---

[1] المصدر نفسه...، ص 227.

[2] مێژوونووسی تورک جەودەت دەنووسێ: "هێزەکانی مەحموود پاشا و شازادە دەستەپاچە بوون لەوەی بەرامبەر بە بەرگرییەکی سەختی والی بەغدا هیچ سەرکەوتنێک بەدەستبهێنن، بۆیە ئەمە وایکرد داوای ڕێککەوتن بکەن"، بڕوانە، جودت، ج (11)، لا: 30- 32. بەڵام ئەم گێڕانەوەیە لە ڕاستییەوە دوورە، چۆن ئەگەر وابوایە ئێران مەرجەکانی خۆی بەسەر والی بەغدا نەدەسەپاند.

[3] علاء نورس، حكم المماليک... ، ص 229.

هێزەکانی دەوڵەتی  قاجاری لە ناوچەکانی کوردستان کشانەوە.  بەڵام مەترسییەکانی ڕووسیا بۆ سەر ئێران، دەوڵەتی قاجاری هاندا، موحیب عەلیخان وەکو وەفدێک بنێرێ بۆ ئیستەنبووڵ لەگەڵ چەند دیارییەکی شکۆمەندانە، لەوانە فیلێکی گەورە وەکو دیاریی بۆ سوڵتانی عوسمانی، مەحموودی دووەم (1808-1839) و لەم وتوێژانەی ئیستەنبووڵ دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی  لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێککەوتن:

1- دەوڵەتی ئێران پەیمان دەدات دەست نەخاتە ناو کاروباری کوردستانەوە.

2- ئێران پەیمان دەدات پەناهەندەکان (مەبەست لە کوردەکانە) بگەڕێنێتەوە و ئەوەی پەنای بۆ ببات وەریانەگرێ. بەهەمان شێوەیش دەوڵەتی عوسمانی پەیمان دەدات پەناهەندە ئێرانییەکان بەخۆیەوە نەگرێ و ئەوانەی هەڵدێن بیانداتەوە بە دەوڵەتی ئێران.

3- بازرگانانی هەردوو دەوڵەت مامەڵەیەکی هاویەکیان لەگەڵ دەکرێت.

4- مامەڵەکردنێکی باش لەگەڵ ئەو زیارەتچییانەی کە بۆ سەردانیکردنی شوێنە پیرۆزەکان دێنە عێراق[1].

بەڵام هەموو ئەم وتووێژانە هیچیان بەشێوەیەکی یەکجارەکی چارەسەری کێشەکانییان نەکرد. گرژی پەیوەندییەکانی قاجاری و عوسمانی هەمیشە زەوینەیەکی لەباربوون بۆ جەنگ و پێکداهەڵپڕژان لە هەر ئانوساتێک بووایە و سەرچاوەی هەموو پشێوییەکانیش بەشی زۆریان لە داگیرکردنی خاکی کوردستان و دابەشکردنی جوگرافیایی هۆز و عەشرەتە کوردییەکانی نیشتەجێی نێوان سنووری هەردوولاوە سەرچاوەیان هەڵدەگرت. بۆیە هەرزوو پەیوەندییە شڵەژاوەکان لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و قاجاری بەرەو جەنگ دەچوون

---

[1] جودت، تاريخ جودت، ج (11)، ص 34-35، (لە: علاء نورس، حكم المماليك... ص 230).

و دەوڵەتی عوسمانی دەستی کرد بەهاندانی عەشایرە سنوورنشینەکانی ئازەربایجان و کوردستان[1] و بۆ ماوەی دوو ساڵ جەنگێکی خوێناوی لەنێوان دەوڵەتی قاجاری و عوسمانیدا درێژەی کێشا.

---

[1] دکتر غلا مرضا ورهرام، تاریخ سیاسی و سازمانهای اجتماعی إیران در عصر قاجار، انتشارات معین، تهران، 1369، ص 222.

## پێنجەم: کوردستان و جەنگی 1821–1822ی ئێرانی– عوسمانی

پەیوەندییە بەردەوام شڵەژاوەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی هەمیشە زەوینەیەکی لەباربوون بۆ جەنگ و لەشکرکێشیی بۆسەر بەیەک. ساڵی 1820 دوو کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەتی کۆچەری حەیدەرانلوو[1] و سپیکانلی[2] لە خاکی ئێرانەوە پەنایان بردە بەر خاکی عوسمانی. شازادە عەبباس میرزا (حاکمی تەورێز) داوای لە والی ئەرزەرۆم* کرد ئەم عەشیرەتە کوردانە بگێڕێتەوە بۆ ئێران، بەڵام والی دەمودەست داواکەی ڕەتکردەوە.

---

(1) مێژوونوسی کورد ئەمین زەکی بەگ دەنووسێ پێنج سەد خانەوادەی هۆزی حەیدەرانلوو لە ئێران چوونە (موش) و لەوێدا جێگیربوون. حوکوومەتی ئێران سوور بوو لەسەر ئەوەی، کە ئەم خانەوادانە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی نیشتەنی خۆیان، بڕوانە: : خلاصە تاريخ الكُرد...، ص 224،، هەر لەمبارەیەوە دیپلۆمات و گەڕیدەی ئینگلیزی مارک سایکس نووسیویە ئەم هۆزە بیست هەزار (20.000) خێزانن، گەورەترین هۆزی کوردن لەو ناوچەیەی، کە دەکەوێتە نێوان موش و ورمێ. بڕوانە:

Mark Sykes., The Kurdish tribes of the ottoman empire. In (The journal of the Royal anthropological institute, vol XXXVIII, July to Decembre 1908, p 478.

(2) سپیکانلی: مارک سایکس ئەم هۆزە بە (3000) خانەوادە دەخەملێنێ، هۆزی سەرەکین لە سەرووی گۆلی وان. بگەڕێوە بۆ:

Mark Sykes., op. cit, p. 477.

* ئەرزەرۆم (سێۆدوسێۆپولس، کارینیتیس، گارین): شارێکە لە تورکیای ئاسیایی (ئەنادۆڵ)، ناوەندی ویلایەتێکە بە هەمان ناو. کەوتۆتە دامێنی چیایەکی هێندە دوورنا لە ڕووباری فورات. ژمارەی دانیشوانی نزیکەی 60000 کەسە. ناوەندی ئەسقەفییەی یۆنانییە، کە سەر بە پاتریارکی ئەنتاکیایە، ساڵی 415 ی زایینی لە ناوە ئەرمەنییەکەی گارین بوو بە سێۆدۆسێۆبولس، لەسەر شەرەفی سێۆدۆسی بچووك کە شووراکەی بونیات نا، پاشان سەلجوقییەکان لەسەدەی یانزەهەم داگیریان کرد و

ئەم کێشە بەردەوام بوو تا ساڵی 1821 جەنگی نێوان هەردوو دەوڵەت لەسەر دوو کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەتی کۆچەریی کورد حەیدەرانلوو و سپیکانلی هەڵایسا. دەوڵەتی قاجار جەنگی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند و پەلاماری زەوییەکانی عوسمانیدا[1] لێرەدا نوێنەری ڕووس لە ئێران مازارۆفیتش* دەوری هەبوو، کە دەیەویست هەردوو دەوڵەت بەیەک بدات و لاوازیان بکات، چونکە ڕووسیا هەردوو دەوڵەتی بە دوژمنی خۆی دادەنا[2]، هەرچی دەوڵەتی ئینگلیز بوو بەمەبەستی بەرگرتن لە نفووزی ڕووسیا لە دەرباری ئێراندا دژی جەنگ بوو، هەتا کارداری دەوڵەتی ئینگلیز سیر هێنری ویلک Sir Henry Wilock باڵیۆزی ئینگلیز لە تاران بەگەرمییەوە هەوڵیدا تا دەوڵەتی ئێران سیاسەتێکی ئاشتیانە پیادە بکات و واز لە جەنگ بهێنێ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، هەتا وەکو کار گەیشتە ئەوەی پێشنیازی ئەوەیشی کرد، کە کۆمەکی ماڵیی ساڵانەی ئینگلیز بەگوێرەی پەیماننامەی مۆرکراوی تاران لە ساڵی 1814 پێشتر بدات[3]، لەکاتێکدا کە داود

---

پاشان عوسمانییەکان لە ساڵی 1517 ی زایینی. ڕووسەکان ساڵی 1829 داگیری دەکەن بەڵام ساڵی دواتر دەیدەنەوە دەست عوسمانییەکان. ساڵی 1859 بوومەلەرزەیەکی وێرانکەر لێی داوە. بڕوانە: س. موستراس، المعجم الجغرافي للامبراطورية العثمانية، ترجمة وتعليق: عصام محمد الشحادات، دار ابن حزم، بيروت، 2000، صص 44-45

[1] لەبارەی بیانووی ئێران بۆ ڕاگەیاندنی ئەم جەنگە بڕوانە نامەی شاهزادە محەممەد عەلی میرزا لە کتێبی: محەممەد حەمە باقی، میرنشینی ئەردەلان، بابان، سۆران لە بەڵگەنامەی قاجاریدا: 1799-1847، هەولێر، 2002، ل 85-90.

*Mazarofitch

[2] عبدالعزیز سلیمان نوار، تاریخ العراق الحدیث... ص 172.

[3] غلا مرضا طباطبائی مجد، معاهدات وقراردادهای تاریخی دردوره قاجاریه، تهران، 1373، ص 107.

پاشا سەرقاڵی بەهێزکردنی سوپاکەی خۆی بوو، هەواڵی مۆڵدانی سوپای ئێرانی لەسەر سنوور پێگەیشت و شازادە موحەمەد عەلی میرزا پەناهەندە بابانییەکانی نارد تا بچنە پێشەوە و ناوچەی زەهاو یان گرت و پەلاماری خانەقین یان دا بەڵام لە لەشکرکێشیی وەستان دوای ئەوەی سوپای عوسمانی بەرەو ڕوویان بۆوە[1]. ئەم لەشکرکێشییە سەرەتای هێرشێکی گەورە بوو بۆ سەر کوردستانی عوسمانی، سوڵتانی عوسمانی بەشێوەیەکی ڕەسمیی جەنگی دژ بە دەوڵەتی قاجار ڕاگەیاند و داوای لە والی بەغدا، داود پاشا کرد جاڕی جەنگ بدات دژ بە دەوڵەتی قاجاری. لەم سەروبەندەدا گەرچی دەوڵەتی عوسمانی سەرقاڵی جەنگی یۆنان بوو، بەڵام چەک و تەقەمەنییەکی زۆری بۆ والی بەغدا نارد لەوانە پانزە دانە تۆپ و باری پێنج سەد حوشتر ئازووقە و کەلوپەلی جەنگیی[2]. نوماینەدەی ئینگلیز، میستەر کلۆدیوس ڕیچ وەختایەک لە ئاڵتون کۆپری بووە بە چاوی خۆی باری ئەم چەکانەی بینیوە[3].

لە تشرینی دووەمی ساڵی 1820دا، سوپای ئێران دەستی گرت بەسەر شارەکانی: تۆپراق، بەتلیس و ئەرگیش لە باکوری کوردستاندا[4]. پاشان ئۆپیراسیۆنەکانی جەنگیی تا بەهاری ساڵی 1821 وەستان. لەگەڵ هاتنەوەی وەرزی بەهار هێزەکانی عوسمانی بەرەو ئاراستەی قەڵای تۆپراق هێرشی پێچەوانەیان دەست پێ کرد. هێزەکانی عەبباس میرزا بەسەر هێزەکانی والی

---

(1) علاء نورس، حكم المماليك في العراق...، ص 232.

(2) رسول الكركوكلي، المصدر السابق ، ص 175.

(3) RICH, op. cit, t II, P. 11.

(4) لەبارەی ئۆپیراسیونە سەربازییەکان لە بەرەی سەربازیی باکووری کوردستان، بگەڕێوە بۆ : دەقی نامەی شازادە عەبباس میرزا لە کتێبی: محەممەد حەمە باقی، سەرچاوەی پێشوو، ل93، هەروەها: محمد امين زكي، خلاصه...، ص225.

دیاربەکردا سەرکەوتن، نایب سەلتەنە عەبباس میرزا لە جەنگی ئەرزەرۆم (1821) لە نزیك شاری ئەرزەرۆم بە سەرکردایەتیی سوپایەکی 30.000 جەنگاوەری قاجاری توانی سوپایەکی عوسمانی کە 50.000 سەرباز بون تیکبشکێنێت، بەڵام بڵاوبوونەوەی کۆلێرا هێزەکانی عەبباس میرزای لاواز کرد و بەری سەرکەوتنەکانی لەدەست دا، عەبباس داوای ئاشتی کرد[1].

هەرچی لە کوردستانی باشوور بوو دەوڵەتی عوسمانی دوو هەزار و پێنجسەد (2500) سەربازی بۆ قایمکردنی سنوورکانی خۆی نارد، ئەم هێزە لە زەنگاباد نیشتەجێ بوون. هێزەکانی والی بەغداش لە ئەیلوولی 1821دا لەژێر سەرکردایەتیی کەهیە محەممەد ئاغا بۆ پشتگیری لەو هێزە بەخۆیان و (30) دانە تۆپەوە بەڕێککەوتن و لە شێروانە بارەگای سەرکردایەتییان لێدا و نزیکەی (40) ڕۆژ لەوێ مانەوە. دوای ئەوە هێزەکانی عوسمانی بەناو کوردستاندا هەڵکشان بەرەو سلێمانی و گەیشتنە ئاوایی باریکە. بەڵام پەتای نەخۆشی کۆلێرا هەر ڕۆژ 15-20 سەربازی عوسمانی لێ دەکوشتن[2]، پاشان سوپای میرنشینی بابان بەسەرکردایەتیی عەبدوڵڵا پاشای بابان هێرشی بۆ کردن و لەگەڵ پێنج هەزار جەنگاوەری ئێرانی[3] لە شارەزووەوە هەڵیان کوتایە سەریان و شەڕ لە سپێدەیەکی

---

[1] عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا... ص 172.
[2] رسول الكركوكلی، المصدر السابق ، ص 297.
[3] لونگریک نوسیویە کە عەبدوڵڵا پاشا لەگەڵ پێنج هەزار (5000) سەربازی ئێرانەوە هاتۆتە ناو شارەزوور بڕوانە:
LONGRIG, Op. cit, p. 244.
هەرچی ڕووداونووسی داود پاشایە، ئیبن سند نووسیویە کە شازادەی کرماشان بە پانزە هەزار (15000) سەربازەوە کۆمەگی عەبدوڵڵا پاشای کردووە، لە کاتێکدا سوپای والی هەر تەنیا سێ هەزار (3000) جەنگاوەر بووە. بگەڕێوە: الشیخ عثمان بن سند البصری، خمسە وخمسون عاما من تاریخ العراق، ص 143.

زووەوە تا ئێوارە درێژەی کێشا، دوای زیانێکی زۆر هەموو چەک و تۆپەکانی سوپای والی بەغدا کەوتنە دەست کوردەکان و سوپای والی بەغدا بەشکاوییەوە هەڵات. ئەم سەرکەوتنەی کوردەکان بووە هۆی ئەوەی کوردستان لەدەست داگیرکارێکەوە بکەوێتە دەست داگیرکارێکی دیکە. گەڕیدە و وەڵاتناس مونشی بەغدادی، باسی ئەوە دەکات کە کوردستان لە ساڵی 1821 چووەتە ناو بازنەی قەڵەمڕۆی عەجەم و هەر ساڵەی بیست هەزار تۆمەن دەدا جگە لە دیاری ساڵانە[1].

دەوڵەتی عوسمانی لەم سەروبەندەدا بە قۆناغێکی سەختدا تێپەر دەبوو و بەتووندی گرفتاری جەنگی سەربەخۆیی یۆنان بوو و بەشی زۆری سوپاکەشی لە بەرەکانی ئەورووپادا بوو، بۆیە نەیدەتوانی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی خۆی بپارێزێ. شازادە محەممەد عەلی میرزا ئەم دەرفەتەی قۆزتەوە و بە سوپاکەیەوە بەناو کوردستانی عوسمانییەوە بەتایبەتی بەناو شارەزەوور و ناوچەکانی ئەمارەتی بابان هاتەناوە و لەشکرکێشییەکەی ساڵی 1822 گەیشتە شارۆچکەی دەللی عەبباس (مەنسوریەی ئێستا) لە ڕێگەیدا بەرەو بەغدا. ئەمەش دوای ئەو سەرکەوتنەی کە هێزەکانی بەسەر هێزەکانی ئەیالەتی بەغدا سەرکەوتن کە هێزەکانی ئەمارتی بابانیشیان لەگەڵدابوو. بەڵام ئێرانییەکان نەیانتوانی بەردەوام بن لەبەرەو پێشوەچوونیاندا بەهۆی بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێرا لە ئۆردووەکانیاندا گەڕانەوە وڵاتەکەیان بە خۆیان و تەرمی سەرکردەکەیان شازادە محەممەد عەلی میرزا، کە بەم پەتایە کۆچی دوایی کرد[2]. لەسەرێکەوە هەڕەشە و گوڕەشەی باڵیۆزەکانی

---

[1] محمد بن السيد أحمد الحسيني البغدادي، رحله المنشيء البغدادي، ترجمه: عباس العزاوي، بغداد، 1948، ص 61.

[2] سليمان فائق، المصدر السابق، ص 66-77، د.سعدی عثمان هروتی، کوردستان والامبراطورية...، ص168-169.

بەریتانیا لە تاران و ئیستەنبووڵ کاریگەریی هەبوو لەسەر ئەوەی ئێرانییەکان واز لە بیرۆکەی داگیرکردنی بەغدا بهێنن[1].

مەرگی شازادە محەممەد عەلی میرزا جەنگی ڕانەگرت و جەنگ هێشتا لە کوردستانی باکوور و ئەرزەڕۆم هەر بەردەوام بوو[2] و ناوچەی سلێمانی لەنێوان میرە کوردەکانی سەر بەئێران و سەر بە والی بەغدا ئەمدەست و ئەودەستی دەکرد. دەکرێ بڵێین میرە کوردەکان بەقەد ئەوەی هۆی جەنگەکانی ئێرانی - عوسمانی بوون و لە هەمان کاتیشدا ئەنجامی جەنگەکەش بوون. جەنگ لە بەرەکانی کوردستانی باکوور و ئەرزەڕۆم بەردەوام بوو، ڕاپۆرتەکان هەواڵی سەرکەوتنی سوپای ئێرانیان ڕادەگەیاند، بەڵام کۆلێرا بڵاوەی پێکردن بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێرانییەکان سەرکەوتوو بوون و جەنگ تا ساڵی 1822 هەر بەردەوام بوو، بەڵام دواجار شازادە عەبباس میرزا ناچار بوو پەیوەندی بە محەممەد ئەمین ڕەئووف پاشای والی ئەرزەڕۆم و سەرۆکی گشتیی سوپای ڕۆژهەڵاتی عوسمانییەوە بکات و دەستپێشخەریی بکات و داوای ئاشتەوایی لێ بکات. بابیعالی لەسەر ئەمە ڕازیبوو و ئەرزەرۆم هەڵبژێردرا بۆ مفاوەزە لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران و لە ئەنجامدا لە (28ی تەممووزی 1823) دا پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم لە یەک پێشەکی، حەوت مادده و یەک کۆتایی (خاتیمە) مۆرکرا[3].

---

[1] فیروز منصوری، مصدر پیشین، ص 70.

[2] علاء نورس، حکم الممالیک في العراق...، ص 240.

[3] المصدر نفسه، ص 242.

## 3-4: پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم (28 ی تەممووزی1823): ڕێگەیەکی بنبەست.

جەنگی دوو ساڵەی ئێرانی-عوسمانی 1821-1822 لە هەموو قۆناغەکانیدا سەرکەوتنی هێزەکانی دەوڵەتی قاجاری بوو بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا. چەندین شار و ئاوایی زۆری عوسمانی: ناوچەکانی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات، شارەکانی: قارس، بایەزید و دەوروبەری هەموویان بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی سوپای ئێراندا بوون[1]. جگە لەوە ناوچەی شارەزووریش (ناڕاستەوخۆ) هەر لەژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسیی قاجاریدا بوو. کەچی پارادۆکسەکە (مفارقە) لەوەدابوو دواتر دەوڵەتی عوسمانی لەسەر مێزی مفاوەزە وەکو دەوڵەتی سەرکەوتوو مەرج و داواکارییەکانی خۆی بەسەر ئێراندا سەپاند. نهێنی ئەمەش لەوەدا بوو کە ئەمڕۆژانە دەوڵەتی عوسمانی یەک مەڵبەند و هێزی نەبینراوی (ئینگلیز)یان لە پشتەوەبوو و جگە لەوەش ئینگلیز بە هەموو شێوەیەک ئاشتی دەویست لە ناوچەکە و بەهەموو ڕێگەیەکەوە گوشاری دەخستە سەر هەردوو دەوڵەت بۆ ڕێککەوتنی ئاشتی و دەستبەرداربوونی جەنگ. جگە لەوە دەبێ ئەوەش بگوترێت کە هەردوو لایەنی عوسمانی و

---

[1] میرزا محمد تقی لسان الملک سپهر، ناسخ التواریخ دوره کامل تاریخ قاجاریه، انتشارات امیر کبیر، تهران، 1337، ص: 193

ئێرانی لەسەروبەندی مۆرکردنی پەیماننامەکە هەردوولایان مەیلیان بەلای ئاشتی و ڕاوەستانی جەنگ بوو، کە لەسەر خاکی ئەنادۆڵ بەرێوە دەچوو. ئەم ویستە بوو بە نامەکاریی و نامەگۆڕینەوە لەنێوان عەبباس میرزای کوڕی محەممەد عەلی میرزا و ڕەئووف پاشا، سەرکردەی هێزەکانی عوسمانی لەبەرانبەر ئێرانییەکان لە ئەنادۆڵ، پاشان یەکتر بینین، دانیشتەکانی گفتوگۆی ئەرزەرۆم کە هەر یەکێکیان لەوانە نوێنەری ڕەسمیی دەوڵەتی خۆیان بوون.

گفتوگۆکانی ئاشتی لە بەهاری ساڵی 1823 لە ئەرزەرۆم دەستی پێ کرد، محەممەد ئەمین ڕەئووف پاشا، سەرعەسکەری ڕۆژهەڵات مەرجی ئەوەی بوو، کە پێویستە هەموو ئەو ناوچە و زەوییانەی لەسەر سنوورەکانی ئازەربایجان لەدەوڵەتی عوسمانی داگیرکراون بگێردرێنەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و بێجگە لەوە دەوڵەتی ئێران لە داواکردنەوەی گێڕانەوەی هۆزە کوردەکانی سپیکانلی و حەیدەرانلوو، کە پەنایان بردبووە بەر خاکی عوسمانی واز بهێنێ. هەروەها پێویستە ئێران پەیماننامەی (4ی ئەیلوولی 1746) ی نێوان نادر شا و سوڵتان مەحموودی یەکەم لەبەرچاو بگرێ و هەموو شارەکانی ناوچەی شارەزوور: کۆیە، هەریر، زەهاو و ئێلی بابان لە سنوورەکانی کوردستان و کرماشان بداتەوە بە دەوڵەتی عوسمانی[1] . ناچار لەژێر گوشار و هەڕەشەکانی کارداری ئینگلیز، دەوڵەتی ئێران ناچار بوو ڕەچاوی پەیماننامەی زەهاوی 1639 بکات و بچێتە ناو بازنەی مفاوەزەوە. هەر لە سەرەتای مفاوەزەکەدا ڕەوتی گفتوگۆکان و دوایش دەقی پەیماننامەکە بەدڵخوایی ئێران نەبوو و هیچ چەشنە قازانج و ئیمتیازاتێکی بۆ ئێران تێدانەبوو، بەڵام هەردوو دەوڵەتی کۆلۆنیالیست بەپلەی یەکەم بەریتانیا و دواتر ڕووسیا بەگەرمی فشاریان خستە سەر هەردوو دەوڵەت بۆ ڕاگرتنی جەنگ و پێکهاتنی پرۆسێسی ئاشتی.

---

[1] فیروز منصوری، مصدر پیشین، ص 83.

یەکەمین دانیشتنی کۆنگرەی ئەرزەڕۆم لە 28ی حوزەیرانی 1823 (15 ی شەوالی 1238ی کۆچی) بەسترا، دوا دانیشتنیش لە 23ی تەممووزی هەمان ساڵ و دواجار ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەی ئەرزەرۆم لەلایەن هەردووکیانەوە لە 19 ی ذی ئەلقەعدەی 28/1238 ی تەممووزی 1823 کۆتایی هات و لە 15 ی ذی ئەلحیجە 1238 ك/23 ی ئابی 1823 لەلایەن تاران و ئیستەنبوڵ موسادەقە کرا[1]. ڕاستییەکەی پەیماننامەکە شتێکی وا نویێ تێدا نەبوو و تەنیا گەڕانەوەیەک بوو بۆ پەیماننامەی کوردانی ساڵی 1746 لەگەڵ ئەو بنەوان و مەرجگەلانە و دانپیانان بە مەرجەکانی پەیماننامەکە لەترسی ڕاستکردنەوەیەک، کە هیچ سوودێکی وای تێدا نەبوو و بەواتەیەکی دیکە دانانان بە ڕەوشی هەنووکەیی* ناوچەکانی سەر سنوور، کە ئەمە بوو بەهۆی ناکۆکییێکی بەردەوام و بانگەشەی وەک یەک لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا[2]. ئێمە لەم باسەدا هەوڵدەدەین تەنیا ئەوەی پەیوەندی بەکوردستانەوەیە باس بکەین. بۆ ئەم مەبەستە لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین پەیماننامەکە لەسەر پێنج تەوەر بیناکرا بوو.

تەوەرەی یەکەم: هەموو ئەو شار و شارۆچکە و قەڵا و گوندە کوردییانەی کە پێشتر دەوڵەتی ئێران داگیری کردبوون دەبێ لەماوەی شەست ڕۆژدا بدرێنەوە بە دەوڵەتی عوسمانی. (هیچ کارێک نەکرێت، کە ببێتە هۆی وروژاندنی ڕق و تووڕەیی نێوان هەردوو دەوڵەت. هەموو ئەو قەڵا و زەوی و ئاوایی و شارانەی کە موڵکی دەوڵەتی عوسمانی بوون و چ بەئاشتی و چ بە جەنگ چوونەتە ناو زوونی دەسەڵاتی ئێرانەوە، دەبێ لە ماوەی شەست ڕۆژ لە مێژووی ئەم پەیماننامەیە بگێردرێنەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش لە

---

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 40

*Statut quo

[2] حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 89.

ڕێگەی ئەو دەستە دیاریکراوانەی کە بۆ ئەم مەبەستە پێک دەهێنرێن - مەرجی پێشینەی پەیماننامەکە)[1].

تەوەرەی دووەم: دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی یەکتری: ئێران نابێ دەست وەربداتە ناو کاروباری کوردەکانی ویلایەتی شارەزوور، کە دەوڵەتی عوسمانی بە بەشێک لە ویلایەتەکانی خۆی دەناسێ (هەردو دەوڵەتی بەرز ئەبێ دەس وەرنەدەنە کاروباری ناوخۆی یەکترییەوە. لێرە بە دواوە خۆ تێهەڵقورتان لە لای بەغداد و کوردستانەوە نەشیاوە، لەوانە مەڵبەندەکانی سەر بە سەنجەقەکانی کوردستان، بە هیچ بەهانە و لە هیچ رویەکەوە دەوڵەتی بەرزی ئێران نابێ ڕێ بە خۆ تێهەڵقورتان و، دەسدرێژی و، پەلامار و، داڵدەی موتەصەڕیفەکانی پێشو و لە مەودوایان بدات.... (ماددەی یەکەم)[2].

تەوەرەی سێیەم: پیادەکردنی سیاسەتێکی ئابووری هاوبەش لەلایەن هەردوو دەوڵەت بۆ باجگیری لەو هۆزە کوردانەی، کە لەو دیو سنوورەوە گەرمیان و کوێستان دەکەن و هەموو جار دەبن بەهۆی کێشە و هەرای سەر سنوور بۆ وەرگرتنی ڕەسمی ئاسایی گەرمیان و کوێستان یا هەر داوایەکی تر، بۆ ئەوەی نەبێتە ناخۆشی و کێشە لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا، دەبێ کارەکان بەهاوبەشی لەنێوان وەلیعەهدی دەوڵەتی ئێران و پاشای بەغداوە بەلاوە بخرێ (ماددەی یەکەم). کە ئەمە زیاتر پیادەکردنی سیاسەتی دادۆشینی ئابووری کوردستان بوو لەلایەن هەردوو دەوڵەت لە بەرامبەر ئەو هۆزانەی کە بەدوای

---

[1] مشير الدوله، رساله تحقيقات سرحديه، انتشارات بنياد فرهنگ إيران، تهران، 1348، ص 19.

[2] همان مأخذ، ص 19.

ئاژەڵدارییەوە سنووریان دەبڕی. بۆ ئەم مەبەستە وەلیعەهد عەبباس میرزا و والی بەغدا هاوکاردەبن لە چارەسەرکردنی کێشەکان و ئەو سەرچێغ چوونانەی کە دەشێ لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا روودەن[1].

تەوەرەی چوارەم: سیاسەتی دژە کوردانەی هاوبەش لە بەرامبەر هۆزە کوردەکان. هەردوو دەوڵەت هەم لەسەر هۆزە کوردەکان و تەبەعیەتی ئەم هۆزانە بۆ ئەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەت جەنگیان هەڵدەگیرساند، لە هەمان کاتیشدا لەسەر مێژی مفاوەزە لەسەر هەمان هۆز و عەشیرەت دەکەوتنە مفاوەزە. بەم جۆرە پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم دەکرێ بەسەرەتای سیاسەتێکی هاوبەشیانەی هەردوولا دابنێین بەرامبەر بە هۆزە کوردەکان. پەیماننامەکە زۆر بەروونی و بەئاشکرا سیاسەتی هەردوولا لەبارەی هەردوو هۆزی کوردیی حەیدەرانلوو و سپیکانلی، کە پەنایان بردبووە بەر دەوڵەتی عوسمانی دیاری دەکات، چۆن ئەوانە لەپێش پەیماننامەکە یەک لە هۆیەکانی جەنگ بوون و لەکاتی مفاوەزە و نووسینەوە پەیماننامەکەش بوون بە ماددەی سێیەمی پەیماننامەی ئەرزەڕۆم.

تەوەرەی پێنجەم: سیاسەتی مافی داڵدەنەدانی سیاسیی، بەشێوەیەک هەردوو دەوڵەت لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە نابێ هیچ لایەک داڵدەی کەسان و عەشایرەکانی لای دیکە بدات. لەمەشدا بە پلەی یەکەم مەبەستیان لەسەرکردە و سەرۆکهۆزە کوردەکان بوو. ئەمە ڕەنگڕشتنی سیاسەتی دوژمنکارانەی هەردوو دەوڵەت بوو لە بەرامبەر میللەتێک کە خۆیان لەناوخۆیاندا بەشیان کردبوو و هەریەکەشیان خۆی بەخاوەنی شەرعیی ئەم بەشەی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەزانی (ماددەی چوارەم).

---

[1] حسن الدجیلی، المصدر السابق، ص 91.

هەروەها (خاتیمە)ی پەیماننامەکە دووپاتەی پێویستی .پابەندبوونی هەردوو دەوڵەت دەکاتەوە لە پەیوەستبوونیان بە ماددەکانی پەیماننامەکە بۆ وەلانانی هەموو ناکۆکیەک کە ڕویداوە یان لە دواڕۆژدا ڕوودەدات، جگە لە باسکردنی پرسگەلێکی دیکە وەک داوانەکردنەوەی دارایی کە لە ئەنجامی جەنگ هاتوونەتە پێش لەنێوان هەردوو دەوڵەت و هەروەها برێک کاراییکردنی پرۆتۆکۆلیی، کە تایبەتن بە پرۆسەی گۆرینەوەی پەیماننامەکە لەنێوانیاندا[1]. شایانی گوتنە لەگەڵ مۆرکردنی پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەت لەماوەی نێوان هەردوو پەیماننامەی ئەرزەرۆمدا بەگوێرەی ماددەی حەوتەمی پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم بوو بەسۆنگەی گۆڕینەوەی نوێنەرایەتێکردنی دیپلۆماسی لەنێوان هەردوو دەوڵەت. میرزا جەعفەر خان موشیر ئەلمەلیك، -کە دواتر بە موشیر ئەلدەولە ناسرا- وەك بالیۆزی ئێران لە ئیستەنبوڵ دەستنیشانکراو و خاوەنی پێگە و ڕێزێکی زۆربوو لە دەرباری عوسمانی. هەروەها بالیۆزی دەوڵەتی عوسمانی لە تاران لەلایەن شا و پیاوەکانی دەربار پێشوازی لێ دەکرا و خاوەنی ڕێزبوو، کە ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە بەرەوپێشەوچوونێکی بەرچاو لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت لەدوای مۆرکردنی پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆوم (28 ی تەمموزی 1823) هاتبووە ئاراوە[2].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم نەیتوانی چارەسەری کێشەکانی سنووری قاجاری –عوسمانی بکات، چونکە کێشەکانی ئەم سنوورە پەیوەندییان بە زەوی وزار و خاکی نەتەوەیەکی بێدەوڵەتەوە (بە دەوڵەت نەگەیشتوو) هەبوو، کە هەردووکیان بەبێ هیچ لەبەرچاوگرتنێکی جوگرافیایی،

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 41.

[2] نفس المصدر ، صص 45-46

ئیتنیکی و بگره ئەخلاقیش لەناو خۆیاندا دابەشیان کردبوو. بۆیە لەناو کێشەی پەیوەندییەکانی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتدا، کێشەی سنووری وڵاتێکی دیکەی بێسنوور دەبینرێ کە لەناو ئەم کێشەیەدا شاردراوەتەوە و لەبەرچاو نییە. کێشەکانی سنووری قاجاری-عوسمانی، دواتر ئێرانی - عێراقی و هەروەها عێراقی - تورکی هیچ ڕۆژێک ناتوانن ئارامی بەخۆیانەوە ببینن چونکە بەناڕەوا بەناو کوردستاندا ڕەتبوون و هیچ هەڵکەوتەیەکی ئیتنیکی و نەتەوەیی کوردیان لەبەرچاو نەگرتووە.

پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم (28 ی تەمووزی 1823) هەر بە مردوویی لە دایک بوو و هیچ کام لە دەوڵەتەکانی ئیمزاکار پابەندی بەندەکانی بڕیارنامەکان نەبوون. دەوڵەتی قاجار، هەمیشە ناکۆکی نێوان میرەکانی بابانی وەکو کارتێکی سیاسی دژ بە والی بەغدا دەقۆستەوە و لەبەرانبەردا دەوڵەتی عوسمانی بۆ هەمان مەبەست ئەمارەتی سۆرانی هەم دژ بە ئێران و هەم دژ بە ئەمارەتی بابان هان دەدا. دواجار ململانێی خوێناوی ناوخۆیی کورد و کورد لەسەر ئیمتیازاتی میرایەتی ڕێگەیان لە وەدیارکەوتنی چەکەرەکردنی هەستی نەتەوەیی کورد گرت، کە ئەمە دواتر زۆر نێگەتیڤانە تاسیری خۆی لەسەر بەدرەنگ کەوتنی لەدایکبوونی ناسیۆنالیزمی کورد بەجێهێشت. پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم (28 ی تەمووزی 1823) بەتوندی نفووزی ئێرانی لە کوردستاندا نەدەهێشت، بۆیە دەوڵەتی ئێران زۆر هەوڵیدا ئەوەی پەیوەندی بە ئەمارەتی بابانەوە هەیە دەستکاری بکات و بیگۆڕێ. عەبباس میرزا لە نامەیەکدا بۆ محەممەد ڕەئووف پاشای والی ئەرزەڕۆم، داوای کردووە وەک چۆن ئێران دەستی هەڵگرتووە لە داواکردنەوەی ئێلەکانی سپیکانلی و حەیدەرانلوو، ئاوا دەوڵەتی عوسمانیش دەست لە داوای گێڕاندنەوەی ئێلی بابان هەڵبگرێ[1].

[1] بگەڕێوە بۆ نامەی عەبباس میرزا بۆ محەممەد ئەمین ڕەئووف پاشای والی ئەرزەڕۆم،

ئێران زۆر هەوڵیدا مادەی یەکەمی پەیماننامەکە کە تایبەت بوو بە کوردستان بگۆڕێ، بەڵام ئەمەی بۆی نەکرا.  وەختایەک ئێران بێئومێد بوو لەوەی لەڕێگەی ئاشتیەوە ئەمە بکات کەوتە گوێپێنەدان بە بڕگەکانی پەیماننامەکە، کە ئەمە دوای مۆرکردنی پەیماننامەکە هەرزوو حاڵەتی نە جەنگ و نەئاشتی گواستەوە بۆ حاڵەتی جەنگ و پێکدادان، چونکە نەمانی نفووزی ئێران لە سلێمانی، کە تا ئەو دەم ناوچەیەکی سەر بە ئێران بوو، زیانێکی سیاسیی زۆری بۆ ئێران بەدواوە بوو.

---

بابەت پەیماننامەی ئەرزەڕۆم، لە کتێبی: دکتر محمد رضا نصیری، اسناد و مکاتبات تاریخی إیران (قاجاریە) جلد دوم، تهران 1368، ص 49-50، سند شمارە 11.

## 4-4: کوردستان لەنێوان هەردوو پەیماننامەی ئەرزەڕۆمدا

### شەڕی دوو برا کوردەکە!

پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم کە لە 28ی تەممووزی 1823دا مۆرکرا، هەرزوو بە کۆتاییەکی بنبەستوو گەیشت. ئەگەرچی پەیماننامەکە زۆرینەی کێشەکانی سنووری قاجاری-عوسمانی خستە بەرچاو، بەڵام ناکۆکییەکان هەر وەکو خۆیان بەچارەسەرنەکراوی مانەوە. بەشێوەیەک پەیماننامەکە نەیتوانی چارەسەری کێشە کۆنینەکانی سنوور بکات لەنێوان عوسمانی و ئێرانییەکان بەتایبەتی کێشە سنوورییەکانی ئەیالەتی بەغدا لەگەڵ ئێران و کێشەی گواستنەوەی هۆزە کۆچەرەکان لەنێوان هەردوو دەوڵەت هیچ چارەسەرییەکی بنەبڕی بۆ دانەنرا، چونکە ڕەوشی مۆرکردنی ئەم پەیماننامەیە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی تا بەخێرایی بگەنە کۆتایی هێنان بە حاڵەتی جەنگ، کەچەندین ساڵ پێش مۆرکردنی پەیماننامەکە لەنێوان هەردوو دەوڵەت لەئارادابوون، مۆرکردنی پەیماننامەکە بەپەلەپرۆزێی بووە. پاشان تاونبارکردنی هەر دەوڵەتێک بۆ ئەوی دیکە بە دەستدرێژیکردنە سەر سنووری وڵاتەکەی دوای پەیمانامەی 1823 و هەروەها تاوانبارکردنی یەک بۆ یەکتری بە داڵدەدانی ئەو هۆزانەی، کە دەبنە هۆی کارەیلی دزی و تێکدانی ئاسایش لەناو خاکی ئەویتر[1].

---

[1] جمیل موسی النجار، المصدر السابق، صص 108-109

برگەکانی پەیماننامەکە لەڕووی دەستنیشانکردنی هێلەکانی سنوور و دیاریکردنی خاڵەکانی سەر سنوور ئاشکرا و بنەبڕ نەبوون، سەرباری ئەمانەش گواستنەوە و هەوارگۆڕینی عەشایرەکانی سەر سنوور کێشەی زیادی بۆ دیاریکردنی هێڵکێشانی* سەر سنوور دیاری دەکرد و جیاوازییەکانی زۆرتر دەکرد[1]. دەوڵەتی قاجار بەپێچەوانەی ماددەی یەکەمی پەیماننامەکە بەردەوام وەکو هێزێکی نەبینراو لە ناوچەکانی سلێمانیدا دەبینرا، ناوچەی کوردنشینی زەهاو بەپێچەوانەی ئەوەی کە دەبوایە بەگوێرەی پەیماننامەکە بۆ دەوڵەتی عوسمانی چۆڵکرابوایە، کەچی هێزەکانی قاجاری هەر تێیدا مانەوە. ئێران وەکو هێزێکی نەبینراو و هێندێک جاریش وەکو هێزێکی بینراو[2] لە ناوچەی شارەزووردا ئامادە بوو.

دروست ئەم ڕۆژانە، هێزێکی نوێی دیکەی کوردیی لە ناوچەکە هاتە ناو شانۆی سیاسیی ناوچەکە، ئەویش ئەمارەتی سۆران بوو، کە لە ساڵەکانی 1826-1837 هاتە ناو بازنەی ململانێیەکە، بەم جۆرە ئاسایی بوو کە کێشەوناکۆییەکانی

---

*delimitation

[1] د. غلا مرضا ورهرام، مصدر پيشين، ص 223.

[2] لە ساڵی 1834، گەڕیدە و دیپلۆماتی ئینگلیزی فرەیزەر لە گەشتەکەی بۆ سلێمانی سوپایەکی ئێرانی بینیوە کە پێنجسەد (500) سەرباز دەبوون لەگەڵ تۆپخانەی جەنگییەوە، بگەڕێوە:

FRAISER, J, B., Travels in Koordistan, Mesopotamia, including an account of parts of those contries and manners of the Koordistan and arab tribes, TI, London, 1840, p. 145.

هەروا لونگریک دەنوسێ کە ئۆردوویەکی سوپای ئێرانی تا مەرگی فەتحعەلی شا هەر لە سلێمانی مابوو. بڕوانە:

LONGRIG, S, H., op. cit, p. 249.

نێوان بەغدا و کرماشان لەبارەی پرسی کوردەوە زیندووبێتەوە ئەویش لە سۆنگەی بەردەوامیی دەستێوەردانی هێزەکانی قاجار لە کاروباری ئەمارەتی بابان و بەهۆی مانەوەی هێزەکانی قاجار لە زەهاو وێڕای ئەوەی، کە لە پەیماننامەی ئەرزەرۆمی یەکەم (28ی تەمموزی 1823) وەک بەشێک لە خاکی عوسمانی ناوی هاتبوو، بەڵکو بازنەی ناکۆکییەکانی کورد- قاجاری توندتر بوو کاتێک ئەمارەتێکی کوردیی تازە پەیدابوو، کە ئەمارەتی سۆران بوو لە ڕەواندز و وەک هێزێکی نوێ دەیویست لەسەر حیسابی ئێران و ئەمارەتی بابان لە سلێمانی و هەروەها لەسەر حیسابی ویلایەتی مووسڵ فراوان بێ[1]. هەموو ئەم کێشانە پابەندبوون بە ناوچەکانی کوردستان و ڕەوشی هەنووکەیی پاش پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆمیان گەیاندە حاڵەتی نە جەنگ و نە ئاشتی و دواتر گەلێک زوو کێشەکان بەرەو جەنگ و پێکدادان چوون. هەر ساڵێک دوای مۆرکردنی پەیماننامەکە، ساڵی 1824 ناوچەی کوردستان ئالۆز بوو و مەحموود پاشای بابان و عەبدوڵڵا پاشای بابان پەنایان بردە بەر دەرباری ئێران و شازادە عەبباس میرزا بەگەرمی پێشوازی لێوەکردن، ئەمە لەلایەنی عوسمانییەوە بە دەستێوەردانی ئاشکرا دانرا لە کاروباری ناوەخۆی دەوڵەتی عوسمانی. شازادە وەڵامی دایەوە، کە ئەو ناکۆکییەی لەناوچە سنوورییەکان و ئەوناوچانە کە بۆ لەوەرگە دیاریکراون ڕوودەدەن، تەنیا ئەو مافی پاکتاوکردنی هەیە بەو ڕێگەیەی کە بۆی گونجاو بێت و لەسەر ئەم بنەوانە داوای دانەوەی باجی کۆچەری و دانانی مەحموود پاشا یان عەبدوڵڵا پاشا وەک موتەسەریفی ناوچەکانی زەهاو و کۆیە و حەریر و سلێمانی و کشانەوەی محەممەد پاشای دەکرد لە کەرکووک[2]. بێگومان نابێ لێرەدا ڕۆڵی ئینگلیز لە

---

[1] عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث...، ص 29.

[2] حسن الدجيلي، المصدر السابق ، ص 152.

ناوچەکە و پەرەسەندنی سەرمایەداریی ئینگلیزی لە بەرچاو نەگرین، هەروا ڕۆلی دەولەتە کۆلۆنیالەکانی دیکە لە ناوچەکە وەک فەرەنسا و ڕووسیا، کە ئەم دەولەتانە لووتیان لە پەیوەندییەکانی عوسمانی-ئێرانی دەژەند. لە سەرێکی دیکەوە دەولەتی عوسمانی لەم ماوەیەدا دەستی کرد بوو بە سیاسەتی چاکسازیی لە دەسەلات "تەنزیمات" بەتایبەت بەستنەوەی هەموو ویلایەتە دوورەدەستەکانی خۆی ڕاستەوخۆ بەدەسەلاتی ناوەندی ئیستەنبوولەوە، بەویلایەتەکانی کوردستانیشەوە. ئەم سیاسەتە بۆخۆی بووە هۆی زیادبوونی شەپۆلێکی نارەزایی و بێزاری لەلای میر و سەرۆکە کوردەکان، ئەوانەی کە بۆخۆیان توانیان دەرفەتی ئەو ئاستەنگ و کێشە سیاسییە دەرەکیانە و ئەو سەرقالییە ناوخۆییانەی دەولەتی عوسمانی بقۆزنەوە لەپێناو دامەزراندنی میرنشینگەلی سەربەخۆی کوردی[1].

بەهێزبوونی ئەمارەتی سۆران لە ناوچەی ڕواندز و فراوانخوازی میری ڕواندز دژ بە ئەمارەتی بابان، بەجۆرێک دەسەلاتی میری سۆران هێندە هەلکشابوو تا کوردستانی ئێران ڕۆیشتبوو، تەنانەت شارەکانی شنۆ و سەردەشت لەژێر دەسەلاتی ئەمارەتی سۆران دا بوون. دەولەتی قاجاری لە دەست ئەمارەتی سۆران وەزالە کەوتبوو و عەبباس میرزا داوای لە کونسولی ئینگلیز و کاربەدەستانی عوسمانی کرد بۆ تەمێکردنی میری ڕواندوز یان وەکو ئەوەی ئەو دەلێ دژ بە "کۆیلەی سەریاخی"[2] هەنگاو هەلبگرن.

---

[1] د. جمال نبز، المصدر السابق، ص.24

[2] ئەم دەربڕینە سالی 1838 لە نامەیەکی وەزیری کاروباری هەندەرانی ئێران، میرزا مەسعود خان بۆ وەزیری کاروباری هەندەرانی عوسمانی بەکارهاتووە. بڕوانە دەکۆمێنتی ژمارە 65، بابەت تەمێکردنی میری رواندوز لە (گزیده اسناد سیاسی إيران و عثمانی دوره قاجاريه، دفتر مطالعات سیاسی و بين المللی وابسته به وزارت امور خارجه جمهوری إسلامی إيران، تهران، 1369، جلد (1)، ص 262.

دەوڵەتی قاجار کارتی ئەمارەتی بابانی بەدەستەوە گرتبوو دژ بە والی بەغدا داود پاشا 1817-1831، هەرچی داود پاشا بوو پێی وابوو ئەمارەتی سۆران تاکە هێزە کە بتوانێ لەیەک کاتدا هەم دژی ئەمارەتی بابان بوەستێ و هەم بەرپەچی دەستدرێژییەکانی ئێرانیش بداتەوە، لەکاتێکدا هێزەکانی والی بەغدا داود پاشا بۆ خۆیان تا دوایین ڕۆژەکانی حوکمی داود پاشا نەیانتوانی حوکمی خۆیان بەسەر کوردستاندا بسەپێنن[1]. ئەم سیاسەتەی والی بەغدا جەنگی خوێناوی کورد- کوردی گەیاندە ئاستێک، کە جەنگی خوێناوی نێوان ئەمارەتی بابان و سۆران هەڵبگیرسێ[2]. سەرقاڵیی دەوڵەتی عوسمانی بەجەنگ لەگەڵ ڕووسیا 1826-1828، ڕێگەی بۆ دەستێوەردانی حوکومەتی قاجاری لە کاروباری ناوخۆیی کوردستان خۆش کرد، هەروەها ئاگری جەنگی کورد- کوردی خۆشتر کرد. لێرەدا جەنگی نێوان میرە کوردەکان و نێوان حوکومەتی قاجاری و مەمالیکەکانی بەغدا یەک لە دوای یەک و سەرسوڕهێنەر بوون. هەموو ئەم هەلومەرجانە کێشەی کوردییان بۆ ئاستی تەنگژەیەکی نێودەوڵەتی بەرزکردەوە، کە ڕێگەیان بۆ بەریتانیا خۆش کرد دەست لە کاروباری ناوخۆی کوردستان وەربدات بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی و دوورخستنەوەی مەترسی ڕووس و دواجار ڕاکێشانی کورد بۆ پاڵپشتی حوکومەتی بەریتانیا، کارێک کە بووە هۆی ئاڵۆزبوونی گەیشتن بە چارەسەرێکی کۆتایی بۆ کێشەی کورد[3].

لەلایەکی دیکەوە والییەکانی بەغدا لەسەردەمی مەمالیکدا( 1750-1831) پێویستیان بە هێزی سەربازیی میرەکانی بابان هەبوو بۆ چوونە سەرحوکم و

---

[1] عبدالعزیز سلیمان نوار، تاریخ العراق الحدیث...، ص 29.

[2] محمد أمین زکی، تاریخ السلیمانیه وأنحائها...، ص 150-151

[3] عبدالعزیز سلیمان نوار، تاریخ العراق الحدیث...، ص 100.

بەرگریکردن لە دەستێوەردانەکانی ئێران بۆ ناو کوردستان. بەڵام وەختایەک دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی 1831 دوا زنجیرەی حوکمڕانی مەمالیکی لە عێراقی عارەبی ڕووخاند و ڕاستەوخۆ ویلایەتی بەغدای بەدەسەڵاتی ئیستەنبووڵەوە بەستەوە، ئیدی کورد لەم هاوکێشەیە فڕێدرایە دەرەوە، کە ئەمە سەرەتای کۆتایی دەسەڵاتدارێتی ناوخۆی کوردبوو لە ناوچەکە. والییەکانی بەغدا هەمیشە سیاسەتی هەڵگیرسانی جەنگی ناوخۆییان لەکوردستاندا پیادە دەکرد و برا و ئامۆزایان دژ بە برا هاندەدا تا نەوەکا ببنە هێزێکی بەدەسەڵات لەناوچەکە و هەڕەشە لە ئاسایش و بەرژەوەندی ئەوان بکەن. ئەوەی میرە کوردەکانیش زیاتر بەلایانەوە گرینگ بوو ئیمتیازی کەسیی خۆیان و بنەماڵەکەیان بوو تا سەروەری نەتەوەیی، ئەوە بەئاسانی ئەوە لێکدەداتەوە بۆچی لەشەو و ڕۆژێکدا میرێکی کورد لەزوونی دەسەڵاتی ئێرانەوە دەبوو بەپاڵپشتی والی بەغدا و بەپێچەوانەشەوە لە ناوچەی نفووزی بەغداوە دەچووە ناو بازنەی زوونی نفووزی ئێران.

ناوچەی شارەزوور لە دەورانی دوو میرە براکە: مەحموود پاشای بابان (1813-1834) و سولێمان پاشای سێیەمی بابان (1829-1838) هێندە جەنگ و براکوژی بەخۆیەوە بینی کە ناوچەکەیان کرد بە شانۆی جەنگی نێوان دەوڵەتی قاجاری و سوپای والی بەغدا. هەرلایەک ژێر دەکەوت پەنای بۆ ئێران یان بەغدا دەبرد و سوپای داگیرکاری ئەولای لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و لەپێناو گەڕانەوەیان بۆ سەر کورسی پاشایەتی خۆیان، بەمە کوردستانیان وێران دەکرد. دواتر ڕەشاو- طاعون- وێرانییەکەی وێرانتر کرد. فرێزەر دیپلۆمات و گەڕیدەی ئینگلیز وێنەیەکی جوانی ئەم واقیعەی کێشاوە و نووسیویە: "تاکۆکییەکانی نێوان ئەم دوو برایە جێگەی نیگەرانی بوون بۆ ئێمە و وڵاتەکەشیان بەتەواوی وێران کرد. نە مەحموود پاشا و نە سولێمان پاشا

نەیانتوانی سێ ساڵان بەسەریەکەوە حوکمڕانی بکەن. دوایش سوپای ئێران دەهات و بەناوی ناوبژییەوە ناوچەکەی وێران دەکرد و بە لەشکرەوە هەڵیدەلووشی، دواتر ڕەشاو و پاشانیش قاتوقڕی دەهات و ئەم نەتەوەی پارچەپارچە دەکرد"[1].

لە ئەنجامدا کوردستان هیچ کاتێک دەورانێکی ئارام و ئاسایشی بەخۆیەوە نەبینووە و هەموو گەشەیەکی کولتووری و سیاسی و ئابووری تێدا ئیفلیج بوو. لە وتووێژێکی مەحموود پاشای بابان لەگەڵ میستەر کلۆدیوس ڕیچی نوێنەری کۆمپانیای ئینگلیزی لە بەغدا ساڵی 1820 هاتووە: "وڵاتەکەم و خێزانەکەم هەرگیز ڕۆژێک ناتوانن ئاوها بەهێز ببن، مادام لەم خێزانەدا ئەوەندە ئەندامی بەهێز هەیە"[2]. ئەمەی دوایی هیوا دەخوازێ کە ڕۆژێک وڵاتەکەی چاک بێ، بەڵام مەحموود پاشای بابان بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: (بەڵێ ئەمە ڕوودەدات ئەگەر خوا کارەساتێکمان بۆ بنێرێ تەنیا یەکێکمان تێدا بمێنێتەوە). (ئەوە دەشێ ببێ بە بێ ئەوەی پێویستی بە تاعون بێت، خودا دەتوانێ هەموو شت بکات) ڕیچ وەڵامی دەداتەوە. (بێگومان خودا دەتوانێ ئاگری دۆزەخیش بکوژێنێتەوە، بەڵام نایکوژێنێتەوە) ئاوا مەحموود پاشا وەڵامی ڕیچی دایەوە[3].

وەختایەک والی بەغدا یەکێک لە میرەکانی بابانی لێدەخست و لە دەستەڵاتی حوکمڕانی دووری دەخستەوە، هەر زوو میری لێخراو پەنای دەبردە بەر دەرباری ئێران و هێزی ئێرانی دەهێنا بۆ گێڕانەوەی بۆ سەر حوکم. بەم شێوەیە لە ساڵی 1834 وەختایەک والی بەغدا، مەحموود پاشای بابانی لێخست

---

[1] FRAISER, op.cit. p. 180.

[2] RICH, op. cit. tI, p. 323.

[3] Ibid., p. 323.

و سولێمان پاشای برای کرد بەحاکمی سلێمانی. هەردوو برا بۆ خۆیان لە قەرەقووڵ کەوتنە جەنگی یەکتر و لەم شەڕەدا هێزەکانی مەحموود پاشا شکا و ناچار پەنای بردە بەر دەوڵەتی ئێران. لە ئێران مەحموود پاشا هێزەکانی خۆی لەناو هۆزەکانی بانە، سەردەشت، پشدەر، مەرگەوەڕ کۆکردەوە و لەگەڵ خۆیدا سوپای ئێرانی هێنایەوە بۆ سەر ئەمارەتی بابان و بەرەو سلێمانی هەڵکشا. لە بەرانبەردا سولێمان پاشای بابان شاری سلێمانی بەجێهێشت و داوای هێزی لە والی بەغدا کرد. دواجار هێزەکانی والی بەغدا بە هاوکاری سولێمان پاشای بابان توانیان شاری سلێمانی بگرنەوە. بەڵام دیسان مەحموود پاشای بابان سوپای ئێرانی هێنایەوە و هەردوو لەشکر لەناڵپارێز بەرەو ڕووی یەک بوونەوە. سولێمان پاشا بە برینداری هەڵات بۆ بەغدا و بەیارمەتی بەغدا سلێمانی گرتەوە و ناچار مەحموود پاشا هەڵاتەوە بۆ ئێران[1].

بەم جۆرە میرنشینی بابان بەتەواوی بوو بوو بە ناوچەیەکی ناکۆکی ململانێی ئێرانی-عوسمانی و لەژێر پۆستاڵی سوپای هەردولا پلیشایەوە و دواتر پەتای کۆلێرا لە ساڵی 1830، کوردستانی هەر بەڕاستی کرد بە "نیمچە بیابانێک" بۆ خۆی. فریزەر گەڕیدەی ئینگلیز لەم ماوەیەدا لە سەردەشتەوە تا سلێمانی گەڕاوە تاکە یەک ئاواییەکی شک نەبردووە کە ئاوەدانی تێدابێت[2].

بابیعالی دەمێک بوو بڕیاریدا بوو هەموو ویلایەتەکانی عێراقی عارەبی و کوردستان بخاتە ژێر قەڵەمڕۆی ڕاستەوخۆی خۆیەوە و کۆتایی بەحوکمڕانی مەمالیک 1750- 1831 لە بەغدا بهێنێ. بۆ ئەم مەبەستە ساڵی 1831 بە فەرمانێکی سوڵتانیی، ڕاستەوخۆ لەلایەن ئەستەنبووڵەوە عەلی ڕەزا، وەکو والی

---

[1] نەوشیروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەمدا، چ 2، سلێمانی، 1998، ل 156.

[2] FRAISER, op. cit, p. 146.

لە جێگەی داود پاشا کرا بە والی بەغدا. عەلی ڕەزا بە خۆیی و سوپاکەی بەرەو بەغدا دەهات و لەگەڵ  خۆشییەوە فەرمانی لابردنی داود پاشا لە والیەتی بەغدا و فەرمانی بە والی بوونی خۆی پێ بوو. بەڵام داود پاشا گاڵتەی بە هاتووەکان دەهات و خۆی بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە کردبوو و متمانەی بە سوپاکەی خۆی بوو، کە کۆشش و پارەو پوولێکی زۆر و راهێنانی پێ کردبوو و پێداویستی بۆ ئامادەکردبوو. بەڵام لەناو بەغدا تاعوون خەڵکەکەی لەناو دەبرد و تووشبوانی تاعوون ڕۆژبەڕۆژ هەرچەند عەلی رەزا لە بەغدا نزیکتر دەبۆوە زیاتر دەبوو و لاشە لە کوچە و کۆڵانەکان کەوتبوو و مزگەوتەکان توانای ئەوەیان نەبوو ئەو ژمارە زۆرە وەربگرن بۆیە خەڵکی بۆ خۆڕزگاربوون لە کەلاك و بۆنی گەنیو، کە هەموو بەغدای گرتبۆوە لاشەکانیان فرێ دەدایە ناو ڕووباری دیجلە. یەکێك لە نووسەرەکان ژمارەی مردووەکان لە ڕۆژێکدا بە دەهەزار کەس دەخەملێنێ و لە سوپاکەی داود پاشا و دارودەستەکەی تەنیا (46) کەس مایەوە[1] و بەم جۆرە کۆتایی داود پاشا کۆتایی حوکمڕانی مەمالیک بوو لە عێراقدا.

لەگەڵ ڕووخاندنی حوکمی مەمالیک لە عێراق، هەرزوو بابیعالی کەوتە ویزەی بەستنەوەی ڕاستەوخۆی کوردستان بە دەوڵەتی عوسمانییەوە. ساڵی 1834 والی بەغدا عەلی ڕەزا، مەحموود پاشای بابانی بەدەستبەسەریی ڕەوانەی ئیستەنبووڵ کرد. دوای ئەوە سولێمان پاشا بە تەنیا جلەوی حوکمڕانی ئەمارەتی بابانی گرتە دەست، بەڵام زۆری نەبرد لە ساڵی 1838 سولێمان پاشا کۆچی دوایی کرد. دوای مردنی سولێمان پاشا، کوڕە گەورەکەی ئەحمەد پاشا بوو بە حاکمی سلێمانی. ئەحمەد پاشا لەناو هەموو سەرچاوەکان بە پیاوێکی زەبر بەدەست، جەسوور، دڵڕەق و پاشای شمشێر باسی دەکەن و لە هەمان کاتیشدا

---

[1] یوسف عزالدین(د) ، داود باشا ونهایة ممالیک في العراق، منشورات دار البصري، بغداد، 1967، صص 48-49

وەسپی دادپەروەری و حەزی زۆری بۆ ڕێکخستنی وڵات و پێکەوەنانی سوپایەکی مۆدێرنی لێ دەگێرنەوە. فێلیکس جۆنز* کە لە ماوەی ساڵەکانی 1844 لەگەڵ وەفدی ئینگلیزی کۆمسیۆنی دیاریکردنی سنووری ئێرانی-عوسمانی بووە ڕایەکی نایابی لەبارەی ئەحمەد پاشا(1838-1847) نووسیووە و دەڵێ هەر یەک ساڵ دوای بە دەستەڵات گەیشتنی توانی "هێزێکی سەربازیی بەرچاو لەسەر شێوەی تاکتیکی ئەوروپایی ڕێکبخات و ڕایانبهێنێ، ئەم هێزە لە کاتی ئێستەیدا نزیکەی 800 جەنگاوەر دەبێت"[1]. دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت، کە ئەحمەد پاشا لەکاتێکی زۆر ناسکدا بەدەسەڵات گەیشت لە ساتەوەختێکدا، کە کوردستان بڕیاری بەستنەوەی ڕاستەوخۆی بەئیستەنبوولەوە درابوو، ئەمە واتەی کۆتایی هاتنی ئەمارەتی بابان بوو، بۆیە لەگەڵ هەموو هەوڵ و کۆششە زۆرەکانی بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەمارەتی بابان و دامەزراندنی سوپایەکی "مۆدێرنی کوردی"، بەڵام ئەم کۆششانە بەریان نەبوو و ڕێگەیان لەوە نەگرت میرنشینەکە سەربەخۆیی ناوخۆیی سیاسیی خۆی لە دەست نەدات.

ئۆپیراسیۆنە سەربازییەکانی ئەحمەد پاشای بابان بۆ ناو سنووری دەوڵەتی ئێران، هەڵوێستی بابیعالی ناڕەحەت کردبوو و لە بەرامبەر پرۆتێستەکانی ئێران و بەتایبەت لە کاتێکدا کە هەلومەرجی نێودەوڵەتیی ئەوەی دەخواست کە هێمنی و ئاسایش بەدرێژایی سنووری ئێرانی-عوسمانی بپارێزرێ، تاوەکو کۆمسیۆنی نێودەوڵەتیی چوارینەی سنوور بتوانێ هێڵێک بۆ سنووری هەردوو دەوڵەت دابنێت و ڕادەیەک بۆ ناکۆکییەکانی نێوانیان دابنێت[2]. دەوڵەتی ئێران داوای لە والی بەغدا کرد بەوپێیەی ئەحمەد پاشای بابان دەستدرێژی کردۆتە سەر

---

*Felix Jones

[1]Edmonds, op. cit, p. 55.

[2] عبدالعزیز سلیمان نوار، تاریخ العراق الحدیث... ص 116.

حاكمی سنه، ڕەزا قوولّی خان، لە پۆستی پاشایەتی سلێمانی دوور بخاتەوە و لە شوێنییەوە مەحموود پاشای بابان دابنێت[1]. ئەحمەد پاشای بابان لەکاتی حوکمڕانی خۆیدا و بەتایبەت لەسەروبەندی کۆبونەوەکانی لێژنەی چوارینەی بۆ دیاریکردنی سنوری ئێرانی-عوسمانی، گوشار و فشارێکی زۆری دەکرد بۆسەر هێزەکانی جێنشین لەسەر ناوچە سنوورییەکان تا تەبەعیەتی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕابگەینن. بەجۆرێک دەوڵەتی قاجاری لەدەست هەوڵەکانی ئەحمەد پاشای بابان بێزار بوو و دانانی ڕادەیەک بۆ هێرشەکانی بۆ ناو خاکەکەی، هێزەکانی لە زەهاوەوە بەرەو خانەقین جولاند، ئاڵۆزبوون و گریکوێرەبوونی وەزعەکەیان خستە ئەستۆی ئەحمەد پاشای بابان. ئێران ئەوکاتە داوای لە والی بەغدا کرد ئەحمەد پاشای بابان لە دەسەڵات دوور بخاتەوە، کاتێکیش بەم ئامانجەی نەگەیشت، سەرۆک وەزیرانی ئێرانی ساڵی 1841 لەرێگەی بالیۆزی ئێران لە ئیستەنبوڵ نامەیەک بۆ ڕەفعەت پاشا ڕەوانە دەکات و بەگەرمی داوا دەکات ئەحمەد پاشا لە دەسەڵات دووربخرێتەوە[2]، هەروەها ئاماژە بە دەستدرێژیی ئەحمەد پاشای بابان و هێرشەکانی بۆ ناو سنووری ئێران دەکات[3]. بۆیە والی بەغدا نەجیب پاشا (1842-1847) کاتێک بینی لێخستنی ئەحمەد پاشا بۆ هێورکردنەوەی کاروباری سنوور و ڕێگە خۆشکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمی بابانەکان و حوکمگێڕانی ڕاستەوخۆی سلێمانی کارێکی پێویستە، بڕیاری لێخستنی ئەحمەد پاشای دا. لە ئازاری 1842دا ئەحمەد پاشای بابان، بەتۆمەتی دەستدرێژیکردنە سەر زەوییەکانی

---

[1] مهدی جواد حبیب، المصدر السابق، ص 117.

[2] FO.881/10024, Enclosure I in n° 10, In (Extracts from correspondence relative to the Turco-Persian boundary negotiations) part I, 1843-184, p. 57.

[3] FO.881/10024, Enclosure 2 in N° 10. (Extract from Note from Persian Prime Minister to Grand Vizier relative to Suleimanieh, dated July 20 (about), 1841

دەرەوەی سنووری حوکمڕانی خۆی بەرکەنار خرا[1] بەڵام والی بەغدا، ساڵی 1842 عەبدوڵڵا پاشای برای لە بریتی مەحموود پاشا بە هاریکاری ڕاستەوخۆی هێزەکانی والی بەغدا کردەوە بە حوکمڕانی سلێمانی. ئەوەش پاڵی بە ئێرانەوە نا بۆ هێرشکردنە سەر کوردستان بە بیانووی گێرانەوەی مەحموود پاشای بابان بۆسەر حوکم. ئێران لە ڕێگەی والی ئەردەلانەوە هێرشێکی گەورەی بۆ سەر کوردستان دەست پێ کرد. هێزەکانی ئێران لە ساڵی 1842 بە پێنج هەزار (5000) سەربازەوە هێرشیان کردە سەر شاری سلێمانی، بەڵام هێزەکانی پاشای نوێی شار، عەبدوڵڵا بەگی بابان توانیان هێزەکە تێکبشکێنن و زیانی (150) کوژراو و (75) دیلیان لێ بدەن[2]. گەرچی بەشێکی هێزەکەی مەحموود پاشا توانیان دزە بکەنە ناو شاری سلێمانی و زیانێکی زۆر لەناو شارەکە بدەن، بەڵام بەدەست هێزەکانی عەبدوڵڵا پاشا تێکدەشکێن و هێزەکانی عەبدوڵڵا پاشای بابان[3] بەرگری دەکەن و هێزەکانی ئەردەڵان و هێزەکانی مەحموود پاشای سەر بە ئێرانیان تێکشکاند. هێرشی والی ئەردەڵان و مەحموود پاشا بۆ سەر سلێمانی هەرا و گرژییەکی زۆری نایەوە بەوەی ئێران هێرشی کردۆتە سەر خاکی عوسمانی. ئەم هێرشە دەوڵەتی عوسمانی زۆر نیگەران کرد و باڵیۆزی عوسمانی هێرشی ئێرانی بۆ سەر سلێمانی بەپێچەوانەی بڕیارنامەی پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم (28ی تەمموزی 1823) ناسی[4].

---

[1] Taylor to Sec. Comm. Ap 24, 1842. (India office political and secret departement recorde. Vol, 13, pp. 46 and Mch. 24. 1842, pp. 33-37.
(لە: عبد العزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث، ص 116، ڕاگوێزراوەتەوە)

[2] مهدی جواد حبيب، المصدر السابق، ص117.

[3] بڕوانە نامەی عەبدوڵڵا پاشای بابان قایمقامی سلێمانی بۆ والی ئەرزەڕۆم لە کتێبی: (د. محمد رضا نصيری، مصدر پیشین، ص 184-185)

[4] د. محمد رضا نصيری، مصدر پیشین، ص 19.

دوای ئەم شکستە مەحموود پاشا بە خۆیی و بندەستەکانی خۆییەوە پەنای بۆ ئێران برد. لە پێناو هێورکردنەوەی ئالۆزییەکانی سەر سنوور و بۆ ڕاکێشانی هۆزە کوردییەکان بەلای ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە، ساڵی 1842 ئەحمەد پاشا بە فەرمانی والی بەغدا دووبارە بۆ سێیەمینجار دەکرێتەوە حاکمی سلێمانی[1].

بەم شێوەیە تەقوتۆقی سەربازیی لەناوچەی سلێمانی لەنێوان ئێرانییەکان و عوسمانییەکان بەدرێژەی ساڵانی 1841 و 1842 هەر بەردەوام بوو و عوسمانییەکان بۆ سووکردنی گوشاری ئێران بۆسەر سلێمانی فیرقەیەک لە هێزەکانی سوپای عوسمانی چوونە ناو خاکی ئێران بۆ پەلاماردانی بارەگای میرنشینی ئەردەڵان، بەڵام هێزەکانی ئێران توانیان بەرەوڕوویان ببنەوە و تیکیانبشکێنن، کە ئەمە زیاتر ڕەوشی ململانێ و پشێوی نێوان هەردوو لای لە ناوەڕاستی ساڵی 1842 زیاتر کرد[2]. لە دوادواییەکەی ساڵی 1842 ناکۆکی نێوان عوسمانی و ئێرانییەکان گەیشتەچڵەپۆپە، هەر یەکەیان گەلاڵەی تاوانبارکردنی بۆ لای تر ئامادەکردبوو بە پێشێلکردنی بەندەکانی پەیماننامەکانی پێشوو کە لەنێوانیاندا مۆرکراوە و دواینیشیان پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆمی ساڵی 1823 بوو و گەلاڵەیەک لە سکاڵانامە، لە بەرایشیانەوە داڵدەدانی پەناهەندە سیاسییەکان بوو. ئەمە وێرای نارەزایی دەربڕینی کۆنینەی ئێرانییەکان لە خراپی مامەڵەکردن لەگەڵ هاووڵاتییەکانی لە بارزگان و زیارەتکارانی عەتەباتە پیرۆزەکان لەلایەن دەسەڵاتی عوسمانی لە عێراق و هەروەها

---

[1] ئەحمەد پاشا بۆ جاری یەکەم لە ساڵی 1838 بوو بە میری بابان بەڵام ساڵی 1840 لێخرا، بۆ دووەمجار لە ساڵی 1841 کرایەوە میری بابان وهەروەک لە پێشدا وتمان ساڵی 1842 جارێکی دیکە لادرایەوە.

[2] جمیل موسی النجار، المصدر السابق، ص107

بەهەمانشێوە نارەزایی عوسمانییەکانیش لە نارەزایی ئێرانییەکان کەمتر نەبوو لەبارەی دەستێوەردانی ئێران لە کاروباری ئەمارەتی بابان (سلێمانی)[1]. ئەوە لەم سەروبەندەدا بوو، کە کۆمسیۆنی چوار قۆڵی نێونەتەوەیی خەریکی ساغکردنەوەی سنووری قاجاری-عوسمانی بوو. بۆ قۆزتنەوەی دەرفەتەکە هەریەکە لە دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران هەوڵیان دەدا دانیشتوان و ناوچە سنوورییەکان بۆلای خۆیان ڕابکێشن، کار بەوە گەیشت کە لەم سۆنگەوە هەردوو دەوڵەت خەریک بوو جارِی جەنگ بدەن.

کەشوهەوای ناوچەکە بۆنی جەنگی لێوە دەهات، بەڵام هەردوو باڵیۆزی ڕووس بووتێنیەف* و باڵیۆزی ئینگلیز سیر ستاردفۆرد کانینگ** لە دەرباری عوسمانی هاتنە ناو کێشەکە و لە 29ی ئۆکتۆبەری ساڵی 1842دا داوایان لە والی ئەرزەڕۆم کرد کە ئاسایشی سنوورەکانی بپارێزێ، تا ئەوکاتەی کێشەکانی سنوور لەلایەن کۆمیسۆنی چوارینەی نێودەوڵەتییەوە یەکلایی دەکرێنەوە و چارەسەر دەکرێن[2].

لە پێشەوەدا وتمان، کە نەجیب پاشا (1842-1847) والی بەغدا، بۆ جاری سێیەم و دوایینجار ئەحمەد پاشای بابان دەکاتەوە بە والی سلێمانی. بەم شێوەیە لە ناوەڕاستی ساڵی 1842 تا کۆتایی حوزەیرانی 1846 ئەحمەد پاشای بابان هەر حاکمی سلێمانی بووە و حوکمڕانی کۆیە و حەریریشی خراوەتە ژێردەست. کۆتایی حوزەیرانی ساڵی 1846، عەبدوڵڵا پاشای برای یاخی دەبێت و لە سلێمانییەوە ڕادەکاتە بەغدا بۆ لای والی بەغدا و دواجار لە کۆتایی

---

(1) نفس المصدر، ص 107

*Butenief

**Cannig Staratford Sir

(2) عبد العزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث...، ص 19.

حوزەیرانی ساڵی 1846، لەژێر فشاری لەشکری والی بەغدا و عەبدوڵلا پاشای بابان، والی بەغدا بە خۆیی و لەشکرێکی 3000 کەسییەوە چۆتە سەر ئەحمەد پاشای بابان و لە نزیک کۆیە ئەحمەد پاشا تێکشکاوە، سوپای والی بەغدا بە یاریدەی سوپای عەبدوڵلا پاشای بابان بەرەو سلێمانی هەڵدەکشێت و ئەحمەد پاشا ناچار دەکەن پەنا بباتەوە بەر ئێران[1] و لە پاداشتی ئەم هاوکارییەی لەگەڵ والی بەغدا، عەبدوڵلا پاشا لە شوێنی ئەحمەد پاشای بابان دانراوە بۆ ئیدارەدانی کاروباری سلێمانی، نەک وەک حاکمێکی سەربەخۆ، بەڵکو وەک فەرمانداریێکی عوسمانی بە پلەی قایمقام و ساڵی 1851 لە کار لادراوە و لە شوێنییەوە فەرمانبەرێکی عوسمانی دانراوە. هەرچی ئەحمەد پاشای بابان بوو بە خۆیی ژمارەیەک زۆر خێزان و پیاوانی بابانەوە هەڵاتە مەریوان و چەند ڕۆژێک لە دوو فەرسەخی سنە بارگەی لێهەڵدا و دواتر لە کۆشکی ڕەزا قولیخانی والی سنە میوان بوو. ئەحمەد پاشای بابان، عەبدولڕەحمان خەزنەداری وەک نوێنەری خۆی نارده تاران بەڵام لە بەر ئەوەی ئێران لە سەرویەندی چارەسەرکردنی کێشەکانی سنووردا بوو لەگەڵ عوسمانی، وەڵامیان لێگێڕایەوە کە ئەمساڵ با لە وڵاتدا بە ئارامی دابنیشێ و پارێزگاری لە ئارامی ناوچەکە بکات.

ئەحمەد پاشا هەر لە بیری داگیرکردنەوەی سلێمانیدا بوو و بۆ ئەم مەبەستە خۆی بۆ دوایین هێرش کردن بۆ سەر سلێمانی ئامادەکردبوو، عەبدوڵلا بەگی برای بەو خۆئامادەکردنەی زانی و بە دوو هەزار سەرباز و سێ هەزار سوارەوە بۆ

---

[1]FO: 195/237, Rawlinson to Addington, N° 4, June 26, 1846.

( ئەم سەرچاوەیە لە : الدكتور عبدالعزيز سليمان نوار، "دور العراق العثماني في حرب القرم"، المجلة التاريخيه المصريه، المجلد الثالث عشر، القاهره 1968، ص 229. ڕاگوێزراوەتەوە).

بەرەنگاربوونەوەی ئەحمەد پاشا چووە ناو خاکی ئێران و هەردوو سوپا لەناو خاکی زەهاو تێکگیر بوون و لەم شەڕەدا سوپای ئەحمەد پاشا تێکشکا و بە پەنجا سوارەوە ڕێگەی کرماشانی گرتە بەر. لە ڕێگەی گەرۆس-ساین قەلا چووە شەمدینان و ماوەی پێنج مانگ لە تەکیەی شێخ تەها مایەوە.

لەلای دیکەوە وێرای خواستی کونسوڵی بەریتانی لە بەغدا، هێنری راولنسۆن* کە دەیەویست ئەحمەد پاشا وەکو کارتێک دژ بە ئیمپراتۆریای عوسمانی بەکاربهێنێ و یەکبینە هانی حکومەتەکەی خۆیی و عوسمانی دەدا تا ئەحمەد پاشا وەکو حاکمی سلێمانی دابنێنەوە. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی هێرشەکانی ئەحمەد پاشای بۆ سەر سلێمانی بە دەستدرێژی ئێرانی دەناسی و بە کارێکی دوژمنکارانەی ترسناکی دەناسی بۆ تێکوپێکدانی ئارامی سەر سنوورەکان. کونسوڵی گشتیی راولنسۆن هەمیشە لەلای حوکوومەتی بەریتانییەوە پشتیوانی لە ئەحمەد پاشای بابان دەکرد، دواجار دوای ئەوەی راولنسۆن بێهومێد بوو لەوەی ئەحمەد پاشا بگەڕێنێتەوە بۆ سلێمانی، پێشنیازی بۆ ئەحمەد پاشا کرد خۆی بچێتە ئیستەنبووڵ و دڵسۆزیی خۆی بۆ سوڵتانی عوسمانی رابگەیەنێت و داوای بەخشین و گەڕانەوەی بکات بۆ سلێمانی. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی دەمێک بوو بڕیاری بەستنەوەی کوردستانی جنووبیی دابوو بە حوکوومەتی ناوەندی و دواجاریش ڕێککەوتنامەی دووەمی ئەرزەڕۆم ( 31 ی ئاياری1847 ) هەموو دەرگەیەکی پشتیوانیی ئێرانی لە میرەکانی بابان بەست و نەک هەر ئەمە بەڵکو لەمەودوا وازیشیان لە داواکردنی لیوای سلێمانی هێنا. بەم جۆرە ئەحمەد پاشا تا ساڵی 1853 هەر لە ئیستەنبووڵ بە دوورخراوەیی مابۆوە و بە قسەی خاوەنی کرۆنیکی ( سیر الاکراد) ئەحمەد پاشا مانگانەیەکی

---

*Henry Rawlinson

وەردەگرت کە بەرانبەر سەد تومان بووە[1] . هەر لەم ساڵە واتە ساڵی 1853 لە سایەی داوەتی ڕۆژهەڵاتناس و ئێرانیناس ئەلیکساندەر خۆدزکۆ لەڕێگەی زەریاوە بە کەشتی هەڵمیی سەفەری پاریس دەکات و تا دوایین مانگەکانی ساڵی 1854 هەر لە پاریس لەلای خۆدزکۆ دەمێنێتەوە.[2]

دواجار والی بەغدا، نەجیب پاشا میرنشینی بابان هەڵدەوشێنێتەوە، و عەبدوڵڵا پاشای بابان، برای ئەحمەد پاشای کرد بە قایمقامی سلێمانی و ماوەی چوار ساڵ بەریوەبردنی کاروباری شارەکەی بەرێوەبرد و ئۆردویەکی لە سەربازانی تورک لەسلێمانی جێگیر کرد. وەختایەکیش ساڵی (1267ک-1851ز) داهات، والی بەغدا محەمەد نامیق پاشا بانگی عەبدوڵڵا پاشای کرد بۆ بەغدا و بە زنجیرکراوەیی ناردیە ئەستانە و میری میرانی تورک، ئیسماعیل پاشای بۆ سلێمانی ڕەوانە کرد. بەم شێوەیە ئەمارەتی بابان لەناوچوو و ساڵی (1267ک-1851ز) بەتەواوی ڕووخا و کۆتایی پێهات[3].

---

[1] عبدالقادر بن رستم بابانی ،سیر الاکراد در تاریخ و جغرافیای کردستان، بکوشش: محمد رئوف توکلی، تهران، 1377، ص: 167.

[2] بڕوانە Journal Asiatique p . 298 هەرچەند خۆدزکۆ باسی ئەوە ناکات ئەحمەد پاشا لە چ مانگێکی ساڵی 1853 گەیشتۆتە پاریس، بەڵام بە هەموو بارێکدا لە دوو ساڵ کەمتر لە پاریس ماوەتەوە و سەفەرەکەشی لە سایەی بانگهێشت و ڤیزەی خۆدزکۆ بووە، کە ئەوکات لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا کاریکردووە. نەوشیروان مستەفا ئەمین لە کتێبەکەی خۆی نووسیویە: ئەحمەد پاشا لە ئیستەنبوڵ ماوەیەك دەسبەسەر بوە. ئیزنی لە دەوڵەت خواستووە و چوە بۆ پاریس. دوو ساڵێ لەوێ ماوەتەوە، بڕوانە: میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەمدا، کوردستان، 1988، ل.168

[3] امین زکی، نفس المصدر، صص 161-162

## 5-4: پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم (31 ی ئایاری 1847): پاییزی کورد

### یەکەم: قۆناغەکانی هێڵکێشانی سنووری ئێرانی-عوسمانی

### ئا -1: یەکەمین قۆناغ لە 15 تا 24ی ئایاری 1843

ئەو ڕۆڵی ناوەندگیرییەی کە بەریتانیا و ڕووسیا گێڕایان دواجار بوو بەسۆنگەی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی قاجار ڕەزامەند بن لەسەر دەستپێکردنی مفاوەزە لەنێوانیان و بۆ ئەمە لە ئەرزەرۆم لە سەرەتای ساڵی 1843، دوو وەفد لە هەردوو دەوڵەتی ناوەندیکار بە مەبەستی گەیشتن بە پەیماننامەیەکی نوێ لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی قاجار ئامادە بوون، کە بۆ وەلاخستن و تێپەڕبوونی شکستەکانی ئەو پەیماننامەیە بوو، کە ساڵی 1823 لە ئەرزەرۆم ئیمزا کرا، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران، کە چەند ماوە بوو هەر بەچارەسەر نەکراوی مابوونەوە، لە بەرایشیاندا کێشەکانی سنووری نێوانیان [1]. بەریتانیا و ڕووسیا بەتەواوی دەستیان خستبووە ناو تەواوی کاروبارەکانی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی قاجاری، بەشێوەیەک هەردوو دەوڵەت بوو بوون بەنیمچە کۆلۆنییەکی ئەم دوو دەوڵەتە.

---

[1] جمیل موسی النجار، المصدر السابق، ص111

پەرەسەندنی سەرمایەداری پێویستی بە پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە هەبوو، بۆ ئەم مەبەستە هەردوو دەوڵەت بەگەرمی خۆیان هێنایە ناو بازنەی ململانێیەکە و لێژنەیەکی هاوبەشیان[1] پێکەوەنا بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی سنوور و دانانی نەخشەی ورد بۆ یەکلاکردنەوەی هەر کێشەیەک لەنێوان هەردوو دەوڵەت کە لەدوارۆژدا ڕوویدات. بۆیە لەدوای کوشتارگەی کەربەلا(13 ی کانوونی دووەمی 1843)، کە خەریک بوو ببێتە هۆکاری جەنگێکی نوێ لەنێوان هەردوو دەوڵەتی موسڵمان، دیبلۆماسیەتی بەریتانی و ڕووسی خەریکی هێورکردنەوەی نیگەرانییەکانی عوسمانییەکان بوون لە ئەگەری هێرشی ئێران بۆ ناو خاکی عوسمانی، هەردوو وەفدی بەریتانی و ڕووسی لە ماوەی یەکەم دانیشتنەکانی مفاوەزاتی کۆنفرانسی ئەرزەرۆم ئەوەیان بە هەردوو وەفدی عوسمانی و ئێرانی ڕاگەیاندبوو، کە بەریتانیا و ڕووسیا ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی بەرپرسیارەیەتی جەنگ ئەگەر هەڵگیرسا بخەنە ئەستۆی ئەو لایەنەی کە دەست بە هێرشبردن دەکات[2].

یەکەم دانیشتنی کۆمسیۆنی چوارینەی هاوبەش بۆ هێڵکێشانی سنووری ئێرانی-عوسمانی لە ئەرزەڕۆم لە 15ی ئایاری 1843دا دەستی پێ کرد. شایانی

---

[1] کۆمسیۆنەکە لە نوێنەرانی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی قاجاری، هەروەها لە نوێنەرانی بریتانیا و ڕووسیا بەم شێوەیەی خوارەوە پێکهاتبوو:

1- میرزا تەقی خان فەراهانی (ئێران)

2- ئەنوەر ئەفەندی (عوسمانی)

3- کۆلۆنێل فنویک ولیامز Fenwick Williamis. (بریتانیا).

4- کۆلۆنێل دیانیسە (ڕووسیا) و دواتر قەشە Curzun یش چووە پاڵ نوێنەرایەتیی بەریتانیا.

[2] أ.د. جمیل موسى النجار، المصدر السابق، ص 115

گوتنه له یەکەم کۆبوونەوەدا هەرکە یەکەم دانیشتنی کۆنفرانسی ئەرزەرۆم کرایەوە هەردوو مەندوبی عوسمانی[1] و ئێرانی[2] لەسەر پرسی کوشتارگەی کەربەلا بەتووندی قسەیان لەگەڵ یەکتر کرد و خەریك بوو کارەکانی کۆنفرانس بوەستێ، بەڵام ئامادەبوان ئاگادارییان دا لەوەی، کە ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە بابەتێکی دیکەی زۆر ترسناك هەیە لەڕووی سیاسییەوە ئەویش ئەوەیە: ئایا بەرچاوخستنی ئەم پرسە بۆ کۆنفراسێکی وەك ئەرزەرۆم نابێتە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی؟ بۆ ئەوەی خۆیان لەو پرەنسیپە ترسناکە دووربخەنەوە و هەتا کۆنفرانسیش بەردەوام بێ، بڕیاردرا لێژنەیەکی سێ لایەنی عوسمانی-ئینگلیزی-ڕووسی بۆ لێکۆڵینەوە لە پرسی کوشتارگەی کەربەلا پێکەوە بنرێت و ڕاپۆرتێك پێشکەش بکرێت، گەرچی نوێنەری ئێران ناڕازی بوو بەڵام دواجار ڕەزامەندی نیشان دا و کۆنفرانس چووە

---

[1] وەفدی عوسمانی بریتیبوو لە ئەنوەر بەگ سەرۆکی وەفد. بەکیر پاشا و کامیل ئەفەندی ڕەئیسولکیتاب، روشدی پاشا (وەرگێڕ) و زاعم ئاغا (کیتخدا-یاریدەدەری وەرگێڕ). بڕوانە: أ.د. جمیل موسی النجار، المصدر السابق، ص 113

[2] وەفدی ئێران پێکهاتبوو لە چەندین ئەندام لەنێویاندا ژمارەیەك نووسیار و وەرگێر، هەروا نوخبەیەك لە سوپای ناوچەی ئازەربایجانی ئێرانی لەگەڵدا بوو، ژمارەی وەفدی ئێرانی کە گەیشتە ئەرزەرۆم دووسەد کەس بوون، میرزا تەقی خانی وەزیر ( کە دواتر بە ئەمیر کەبیر ناسرا) سەرۆکی وەفدەکە بوو. هەروەها ئەندامانی دیکەی وەفدەکە بریتیبوون لە : میرزا ئەحمەد خان، ڕەئیسولکیتاب و ئەحمەد خان فەرهانی، چیراغ عالی زەنگەنە و جان داود (وەرگێڕ) و ئامیر مەدفەعیەی سوپا. وەفدی ئێرانی لەکاتی گەیشتنە ناو خاکی عوسمانی پێشوازییەکی گەرمی لێکرا و والی ئەرزەرۆم یەکێك لە گەورە ئەفسەرانی سوپای عوسمانی بەخۆیی و پەنجا سوارەوە بۆ پێشوازی وەفدی ئێران نارد بووە سەرسنوور. بڕوانە: أ.د. جمیل موسی النجار، المصدر السابق، ص 113

سەر پرسەکانی دیکە[1]. دوای ئەوە یەکسەر هەموو قورسایی گفتوگۆی کۆبوونەوەکە کەوتبووە سەر ڕەوشی شاری سلێمانی و هێرشی ئێران و (سوپای مەحموود پاشای بابان) بۆسەر سلێمانی و کۆمیسێری عوسمانی داوای قەرەبووکردنەوەی لەلایەنی ئێرانی کرد. نوێنەری عوسمانی بەشێوەیەکی لێبڕاوانە داوای کرد پێویستە ئیدی ئێران هەژموونی خۆی بەسەر سلێمانی نەمێنێت. بەقسەی مەندوبی عوسمانی، سلێمانی هەر لەیەکەم پەیماننامەی ئەرزەرۆمەوە (28 ی تەمووزی 1823) لەژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی دابووە[2].

لە دانیشتنی چوارەم لە 27 ی تشرینی یەکەمی 1843، کۆمیسێری ئێران بەگوێرەی ڕێنوێنییەکانی وەزیری دەرەوەی ئێران گوتی: "وێرای ئەوەی کە سلێمانی بەشێکە لە خاکی ئێران و ئێران ئامادەیە قەرەبووی ڕەعیەتە عوسمانییەکان بکاتەوە، کە لە ئەنجامی هێرشەکانی مەحموود پاشا زیانیان پێکەوتووە، بەڵام بەمەرجێک تورکیا ئەوە قەبووڵ بکات کە قەرەبووی ئەو تاڵان و برۆییە بکاتەوە کە چەتەکان کردوویانەتە سەر ئۆردووی والی سنە. دواتر کۆمیسێری عوسمانی بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە سلێمانی شارێکی عوسمانییە، لە دانیشتنی پێنجەمدا کۆپی نامەیەکی حاجی میرزا ئاقاسی، وەزیری دەرەوەی ئێرانی نیشان دا کە داوا لە دەسەڵاتکارانی عوسمانی دەکات ئەحمەد پاشا لە پۆستی حاکمڕانی سلێمانی لابدەن[3]. هەر لە یەکەمین

---

[1] الدكتور عبدالعزيز سليمان نوار، العلاقات العراقية-الإيرانية: دراسة في دبلوماسية المؤتمرات (مؤتمر أرضروم 1843-1844، دار الفكر العربي، القاهرة، 1974، ص79

[2] نجاة عبدالله (د)، الامبراطوريات، الحدود والقبائل الكردية، كردستان ونزاع الحدود التركي-الايراني (١٨٤٣- ١٩٣٢)، بنكەی ژین، طهران، 2020، 302

[3] Public Record Office, FO: 424/7B (confidentiel10024), (Extracts from correspondence relative....op.cit., Enclosure 1 in N° 10, Protocol of Fifth conference.

کۆبوونەوەکانی کۆمسیۆن خواستی هەردوولا و گفتوگۆکان زۆر لەیەکەوە دووربوون بۆیە بەهیچ ئەنجامێکی وا نەگەیشتن. چەند کارێک هاتنە پێشەوە، کە خەریک بوو ئاگری جەنگ لەنێوان هەردوولا هەڵبگیرسێنێتەوە.

کوشتاری ژمارەگەلێکی زۆر شیعە لە کەربەلا (13 ی کانوونی دووەمی 1843) بەدەستی والی بەغدا[1] پەیوەندییەکانی ئێرانی-قاجاری بەتەواوی شێواند[2]. بەهەمانشێوە باری شڵەژاویی هەردوو ناوچەکانی کوردستان و موحەممەرەی عەرەبی لەو هۆیانە بوون، کە کارەکانی لێژنەکەیان بەرەو بێهیوایی برد و لەم سۆنگەیەوە کۆبوونەوەکانیان دواخست و تێڕوانینی هەردوولا زۆر لەگەڵ یەک ناکۆک بوون. بەگشتی لەم قۆناغە هەر تەنیا سێ کۆبوونەوە ئەنجام دران لە ڕۆژەکانی: 15 و 19 و24ی ئایاری 1843، بەڵام هەرزوو دەرکەوت دەسەڵاتەکانی هەردوو وەفدی گفتوگۆکار زۆر بەرتەسکن[3] و دواجار لە دوای سێیەمین دانیشتن، کردەی لێژنەکە بۆ پێنج مانگ پچڕا[4].

---

(1) سەرچاوەکان ژمارەی جیاواز جیاواز بەدەستەوە دەدەن، س. ژ. ئەدمۆندز (22000) کوژراو دەنووسێ بڕوانە EDMONDS, op. cit., p. 131، د. عبدالعزیز نوار بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی فارین ژمارەی هەرە زۆری پێنج هەزار (5000) کوژراو دەنووسێ، بڕوانە: عبدالعزیز نوار، تاریخ العراق الحدیث، ص 92، سەرچاوە ڕەسمییەکانی عوسمانی تەنیا (350) کوژراو دەنووسن کە هەموویان ئێرانین و ژمارەی زیانەکانی سوپای تورکی بە (400) کوژراو و دووسەد بریندار دادەنێ، بڕوانە: حسن الدجیلي، المصدر السابق، ص 158، هەرچی سەرچاوە ڕەسمییەکانی ئێرانە ژمارەی کوژراوەکان بە (9000) کوژراو دەنووسن، بڕوانە: گزیدە اسناد سیاسی إیران وعثمانی، ج (أول)، ص 31.

(2) بۆ زانیاریی زێدەتر لەم بارەیەوە بڕوانە: جمیل موسی النجار، المصدر السابق، صص 55-100

(3) Public Record Office, F. O. 371, 18971.,Perso- Iraqi frontier desputes: proces-verbaux of the conference of Erzurum, London.

(4) EDMONDS, C, J., Kurds Turks and Arads, travel and research in North-Eastern Iraq 1919- 1025, London, Oxford university press, 1957, p. 131

## قۆناغی دووەم: 8ی تشرینی دووەمی 1843 تا 2ی ئاداری 1844

لەم قۆناغە لێژنە بڕیاریدا دەکۆمێنتەکانی تایبەت بە سنووری ئێرانی-عوسمانی کۆبکاتەوە، بەڵام کێشەکان و ڕووداوە ناوخۆییەکان زیاتر بەرەو گرژی و ئاڵۆزی دەچوون. داواکانی دەوڵەتی قاجار دەرهەق بەکێشەکانی هەوار گۆڕینی عەشایرەکانی سنوور بوو لەم دیو سنوورەوە بۆ ئەم دیو، هەرچی سەبارەت بە کوردستان و باسەکەی ئێمەوەیە دەتوانین لەم چەند خاڵانەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە:

1- بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە (شا)ی ئێران لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی هەقی بەشداریکردنی هەبێ لە دامەزراندنی حاکمەکانی سلێمانیدا.

2- بژاردنەوەی زیانی هێرشەکانی محەممەد پاشای میری ڕواندوز بۆ سەر ناوچە سنوورییەکانی ئێران و نەخوازەش ئەو زەرەر و زیانانەی لە ناوچەی مەرگەوەر کەوتوون.

هەرچی داواکانی لایەنی عوسمانی بوون سەبارەت بە باسەکەی ئێمەوە دەتوانین لەم چەند خاڵانەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە:

1- کشانەوەی ئێران لەناوچەی زەهاو.

2- لەبەرچاوگرتنی پەیماننامەی زەهاوی 1639، پەیماننامەی کوردانی 1746 و پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی یەکەم 1823.

3- دیاریکردنی عەشیرەتەکانی نزیک بە سنوور و گەڕانەوەی ئەو عەشیرەتانەی چوونەتە ناو خاکی ئێران و ئاشکراکردنی تەبەعیەتی ئەم عەشیرەتە کوردانەی کە دەچنە ناو خاکی عوسمانییەوە: سەنجابی، هەورامان، کەلهوڕ، جاف و مەنگوڕ.

4- بژاردنەوەی زیانی هێزەکانی عوسمانی لە ناوچەی سلێمانی ساڵی 1840[1].

بەم شێوەیە دەبینین زۆربەی داواکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی تایبەت بوون بەکوردستان یان پەیوەند بوون پێیەوە. لە گفتوگۆی وەفدی ئینگلیزەوە ئەوە زۆر بە ڕوونی دیاربوو، کە دەیانەوێ بۆ ڕێکەوتنی هەردوو لا سازش بە خاک بکەن وەک ئەمرازێک بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن.

## قۆناغی سێیەم (ئەوروپا): ئاداری 1844 تا 31 ئایاری 1847

لە دوای دانیشتنی 2ی ئاداری 1844ەوە، لە سۆنگەی هەڵەیەکی گەمژانەی کۆمسیری عوسمانی، ئەنوەر بەگ کۆبوونەوەکانی لیژنە بەرەو بنبەست بوون چوون کاتێک هاوتا ئێرانییەکەی، میرزا تەقیخان داوای کرد حوسەینییەك بۆ شیعەکان لە تورکیا درووست بکرێت[2] و داواکە ڕەتکرایەوە.

کارەکانی کۆمسیۆن وەستا و دواجار کاروبارەکانی کۆمیسیۆن گەیشتە ئەوروپا. لەم ماوەیەدا کێشەکان ئاڵۆزتربوون و هەردوو دەوڵەت لەناو جەنگێکی هەمیشەیی جارِ نەدراودا دەژیان. تاڵان و بڕۆیی هۆزەکانی کورد، کە زۆربەی جار بە پێچەوانەی پەیمانامە مۆرکراوەکان سنووریان دەبڕی دەبوونە چاوگەی پرۆتستۆ و نکوڵیکردن. هۆزە کوردەکانی جاف لە پشدەر لەمێرگەکانی هەردوو دیوی سنوورەوە دەسووڕانەوە. هەمەوەندەکان لە کەرکووکەوە تا هەمەدان هەڵیان دەکوتایە سەر سنوور و تاڵان و بڕۆییان دەکرد[3]. شایانی ئاماژە پێدانە، کە جێگۆکێ و هەوارگۆڕینی عەشیرەتەکانی کورد هەمیشە هۆیەك

---

[1] عبدالعزیز سلیمان نوار، تاریخ العراق الحدیث...، ص 339.

[2] LORIMER, op. cit, p. 1357 .

[3] LONGRIG, op. cit, p. 278.

بووه بۆ نانەوەی پشێوییەکانی سنوور و ناکۆکی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی. ڕاپۆرتە بەریتانییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە والی بەغدا نەجیب پاشا بە مێجەر فارانت، کە وەکو مەندوبی تایبەتیی بەریتانیا لە بەغدا بۆ چاودێریکردنی کاروبارەکانی سنوور دەستنیشان کرا بوو ڕاگەیاندووە، کە وێرای ئەو هەنگاوانەی کە گیراونەتە بەر بۆ قەدەغەکردنی دەستدرێژییەکانی عەشایریی "بەڵام بەشێك لە هۆزی گەورەی جاف کە لە سلێمانی نیشتەجێن کتوپڕ پەلاماریان بردۆتە ناو خاکی ئێران و هۆزەکانی ئەوێیان ڕووت کردوونەتەوە". هەروەها ئەوەشی پێڕاگەیاندووە کە ئەو بۆخۆی نامەی بۆ حاکمی سلێمانی نووسیوە و داوای لێ کردووە ڕێکاری پێویست بگرێتە بەر بۆ ڕێگەگرتن لە کاری لەوجۆرە. فارانت بە حوکمی سروشتی وەزیفەکەی کە بۆی دەستنیشانکرابو، لەڕێگەی کونسوڵگەریی ئێران لە بەغدا نامەی بۆ هەریەکە لە حاکمی سلێمانی و حاکمی شاری سنەی ئێران نووسیوە و " ئارەزووی خۆی دەربڕیوە بۆیان بەوەی دەخوازێ ڕەعیەتە کوردەکان پارێزگاری لە ئەمن و ئاسایش بکەن، بەڵام ئەم هەوڵدانانە هیچ سوودێکی نەبووە"[1].

دواجار دانیشتنەکانی کۆنفرانسی ئەرزەڕۆم ساردییان تێکەوت و ڕاوەستان و هەردوولا شەڕیان بەیەکتر دەفرۆشت. کێشەکانی سنوور هێندە ئاڵۆز بوو بوون، کە ئەندامەکانی لێژنە دوای چوار ساڵ پێیان وابوو باشترین ڕێگە بۆ تێپەڕاندنی ئاستەنگەکان و گەرەنتی بۆ لێکتێگەیشتن، تەنیا بەستن و مۆرکردنی پەیماننامەیەکی سەرلەبەرە بۆ چارەسەرکردنی هێندێک کێشەی سەرەکی و ڕەوانەکردنی کێشەکانی دیکە کە سروشتی تەکنیکی وردیان هەیە بۆ لێژنەی تەکنیکی بۆ بەجێهێنانیان[2]. دواجار هەردوو حوکوومەتی بەریتانی و ڕووسی

---

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 124

[2] حسن الدجيلي، المصدر السابق، ص 164.

بەتوندی فشاری زۆریان خستە سەر هەردوو دەوڵەت بۆ مۆرکردنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم. بەم شێوەیە لە 31ی ئایاری 1847دا دووەمین پەیماننامەی ئەرزەڕۆم بەچاودێری بەریتانیا و ڕووسیا مۆرکرا.

بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە دەوڵەتی عوسمانی و ئێران سازشێکیان لەسەر خاکی کوردستان کرد و جارێکی دیکەش کوردستانیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کردەوە. لە ماددەی دووەمی پەیماننامەکەدا هاتووە: (حوکوومەتی ئێران بەڵێن دەدات کە دەست لە هەموو زەوییە دەشتاییەکان، واتە زەوییەکانی بەشی ڕۆژئاوای ناوچەی زەهاو بۆ دەوڵەتی عوسمانی هەڵبگرێت. دەوڵەتی عوسمانیش لەلایەن خۆیەوە بەڵێن دەدات دەست لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی زەهاو، واتە هەموو زەوییە شاخاوییەکانی ناوچەی زەهاو لەگەڵ شیوی کەرەند بۆ حوکوومەتی ئێران هەڵگبرێت. حوکوومەتی ئێران بە گەرمی پەیمان دەدات واز لە هەموو خواستەکانی خۆی بهێنێ لە بەرامبەر شار و ناوچەی سلێمانی و هیچ کاتێک دەست وەرنەداتە ناو سەروەرێتی حوکوومەتی عوسمانی کە لە ناوچەی ناوبراودا هەیەتی (ماددەی دووەم)[1].

مانگێک بەر لە گەیشتن بە مۆرکردنی پەیماننامەکە، نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی لە 11ی نیسانی 1847دا یادداشتنامەیەکی دەربارەی چەند خاڵێک داوە بە باڵیۆزەکانی بەریتانیا و ڕووسیا لە ئیستەنبووڵ، لە یادداشتنامەکەدا هاتووە: (بابیعالی داوا دەکات لەوەی کە لە بڕگەی بەشێکی ماددەی دووەمدا هاتووە، ئایا مەبەست لەوە ئەو هۆزانەن کە بەتەواوی سەر بە تەبەعیەتی ئێرانن، بەڵام دابەشبوون و بەشێکیان لەسەر خاکی عوسمانین و بەشی دیکەیان لەسەر خاکی ئێران نیشتەجێبوون. ئایا ئەو بەشەی کە لەناو تورکیادایە ئەوانیش دەبن بە

[1] I.E.R.D.M.A., Le conflit Irako- Iranien, Editions du Monde Arabe, Paris, 1982, pp. 185- 186

بندەستەی ئێران و لە ئەنجامدا ئەو زەوییانەی کە لەبندەستیانە ئەوانیش دەبێ بەجێبهێلرێن بۆ ئێران، ئایا ئێران رۆژێک لە رۆژان هەقی ئەوەی دەبێ داوا لە بابیعالی بکات و هەقی وەبندەستختستنی ئەم زەویە ناوبراوانەی دەبێت؟)[1].

شایانی گوتنە وەك لە پێشەوەدا باسمان کرد هەردوو عەشیرەتی حەیدەرانلو و سپیکانلی لەدەست دەسەلاتی قاجاری رایان کردبوو بۆ ناو دیوی دیکەی خاکی کوردستان لەناو سنوری دەولەتی عوسمانی، بۆیە دەولەتی عوسمانی لەرێگەی ئەم یادداشتنامەیە روونکردنەوەیەوە دەیەویست رێگە لەبەرانبەر دەولەتی قاجاری بگرێت و دەیەوێ رێگە لەوە بگرێت لەژێر هیچ بیانوییێکدا، رۆژێک لە رۆژان دەولەتی ئێران هەقی داواکردنەوەی ئەم هۆزانە و ئەم زەویانەشی نەبێ کە ئەم هۆزانەی لەسەر نیشتەجێن.

لە وەلامدا هەردوو بالیۆزی بەریتانیا و رووسیا بۆ پالپشتی و دلنیایی ئیمپراتۆریای عوسمانی لە 26ی نیسانی 1847دا یادداشتنامەیەکی روونکردنەوەیان دا بە حوکومەتی عوسمانی و لەو یادداشتنامەیەدا لە پشتەوەی دەولەتی عوسمانییەوە هاودەنگی عوسمانییەکان بوون، کە ئێران بە هیچ بیانوییێک هەقی نییە داوای ئەو ناوچانە بکات کە کەوتونەتە کەناری چەپی شەتی عەرەب و نە ئەو زەویانەی سەر بە دەولەتی عوسمانین لە کەناری راست بەجۆرێک لەم کەنارە یان ئەو زەویوزارانەی، کە عەشیرەتی ئێرانی یان بەشێک لەو عەشیرەتانەی تێدا دەژین[2]. راستییەکەی مەسەلەی هەوارگۆرینی وەرزیی هۆزەکانی کورد گێچەلی زۆری لێ دەبۆوە و کاری لە پەیوەندییەکانی ئێرانی-عوسمانی دەکرد، چونکە هۆزە کوردەکان هەردوو دیوی سنووریان بە

---

[1] public record office, London.F.O. 371, 18970, The (explantorey note) and the ratification of the treaty of Erzerum.

[2] public record office, London.F.O. 371, 18970.,The (explantorey note) and the ratification of the treaty of Erzerum.

یەک نیشتمانی خۆیان دەزانی. کۆنسوڵی ئینگلیز لە ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، تایلۆر نووسیوویە: (هاونیشتمانێتی دووانە و ونبوونی ئاسایش لەسەر سنوور، گێچەڵ و ناکۆکی زۆری لەنێوان حوکوومەتی ئێران و تورکیادا دروستکردووە. کوردەکان لە هەردوو وڵاتدا هەستدەکەن لە نیشتمانی خۆیاندان، هەرکاتێک بیانەوێ و هەرکاتێک بەرژەوەندیان بخوازێ لە سنوور دەپەڕنەوە)[1]. نوێنەری حوکوومەتی عوسمانی ئەلسەیید موحەمەد ئەمین عالی لە 15ی ئایاری 1847دا وەڵامی یادداشتنامەکەی هەردوو باڵیۆزەکانی دایەوە و دڵنیایان دەکاتەوە کە ئەو لەسەر "یادداشتنامە ڕوونکردەوەییەکە" ڕازییە و ئامادەیە پەیماننامەکە مۆربکات[2]. دواجار لە 16 ی جمادی ئەلئاخیرە 1263 ك/31 ی مایس/ئایاری 1847 پەیماننامەکە لەلایەن ئەنوەر بەگ، سەرۆکی وەفدی عوسمانی و میرزا تەقی خان سەرۆکی وەفدی ئێرانی مۆرکرا، هەروەها لەلایەن هەردوو وەفدی بەریتانی و رووسی بۆ مفاوەزات بەسیفەتی شاهید لەسەر پەیماننامەکە و چاودێر لەسەر جێبەجێکردنی ماددەکانی پەیماننامەکە مۆرکران بەو مەرجەی نوسخەکانی پەیماننامەکە بەرزبکرێنەوە بۆ تەسدیق کردنیان لەلایەن سوڵتانی عوسمانی عەبدولمەجید و شای ئێران محەممەد شا. بەڵام پرۆسیسی تەسدیق کردنەکە و گۆڕینەوەی نوسخەکان لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران نزیکەی (دە) مانگی خایاند لەجیاتی (دوو) مانگ هەروەك لەپەیماننامەکدا هاتووە[3]. بەگوێرەی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم،

---

[1] ن. أ. خالفين، الصراع على كردستان، المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ترجمة: الدكتور احمد عثمان أبو بكر، بغداد، 1968 ص 16.

[2] Public Record Office, F.O. 371.18970 Annex.V., Replay of the ottoman governement to the British and Russian ambassadors at Constantinople.

[3] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص 132

ڕاستکردنەوەیەک لە هێڵی سنووری پەیماننامەی زەهاوی 1639ەوەکرا، کە بەقازانجی ئێران بوو، ئەویش ئەوەبوو ناوچەی زەهاو لە جیاتی ئەوەی تا سەرپێڵی زەهاو بۆ دەوڵەتی عوسمانی جێبهێلدرێ، لەم پەیماننامەیەدا بەهێڵێکی نوێ دابەشکرا کە تەواو بەرەو ڕۆژئاوا لار دەبۆوە[1].

سەبارەت بە گۆڕینەوەی نوسخەی پەیماننامەکە و ئیمزاکردنی کۆتایی لەلایەن هەردوو دەوڵەتەوە، دەوڵەتی ئێران تێبینی لەسەر "یادداشتنامە ڕوونکردەوەییەکە" هەبوو بەڵام دواجار لە 31ی کانوونی دووەمی 1848دا میرزا محەممەد عەلیخان وەڵامی هەردوو باڵیۆزەکانی ڕووسیا و بەریتانیای دایەوە، کە ئەو لەسەر هەموو بڕیارەکان ڕازییە بۆ گۆڕینەوەی دەکۆمێنتەکانی پەیماننامەکە و مۆرکردنی[2]. نوسخەکانی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم لە ئیستەنبووڵ ڕۆژی 21 ی ئاداری 1848 دوای موسادەقەکردنی سوڵتانی عوسمانی لەسەریا ئالوگۆڕ کران. میرزا محەممەد عەلیخان، کە قەرار بوو بچێتە پاریس وەکو سەفیری وڵاتەکەی لە فەرەنسا، لە ئیستەنبووڵەوە بەهۆی مردنی محەممەد شا گەڕایەوە بۆ ئێران و نوسخەیەکی لە پەیماننامەکە کە سوڵتان عەبدولمەجید ئیمزای لەسەر کردبوو لەگەڵ یادداشتنامەی ڕوونکردنەوەیی کە هەردوو سەفیرانی بەریتانی و ڕووسی لە ئیستەنبووڵ بۆ بابیعالی بەرزیان کردبۆوە و میرزا محەممەد عەلیخان بە نامەی 31 ی کانوونی دووەمی 1848 ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیبوو. لەکاتی گەیشتنەوەی بۆ تاران لەلایەن حوکوومەتەکەیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا چونکە ئەو ڕێگەی پێنەدرابوو بەوەی یادداشتنامە ڕوونکردنەوەییەکە مۆر بکات. حوکوومەتی ئێران تەنیا دەقی پەیماننامەکەی

[1] EDMONDS, op. cit, p. 131.

[2] Public Record Office, London, F.O. 371. 18970 Annex VI., Note from Mirza Mohammmed Ali Khan to the Russian and British ambasadors, dated January 14 th/ 31 st, 18, 1848.

ئیمزا کرد، که له شاری ئەرزەرۆم ئیمزاکرابوو، ئەمە بە قسەی مێژوونووس جەمیل موسی ئەلنەجار کەشوهەوایەکی گونجاوی خستەڕوو بۆ بەردەوامبوونی بڕێك لە پشێوی لە پێوەندییەکانی عوسمانی ئێرانی بۆ نیو سەدە دواتری دوای مۆرکردنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم، ئەگەرچی ئەم پەیماننامەیە زۆر پشێویشی وەلانا[1].

بەگوێرەی بڕگەی سێیەمی پەیماننامەکە پێویستە دەستەیەک لە تەکنیکاران و ئەندازیاران بۆهێڵکێشانی سنوور دابنرێن کە پێکهاتبوون لە: کۆلۆنێل ولیامز (بەریتانیا)، میرزا جەعفەرخان (ئێران)، دەروێش پاشا (دەوڵەتی عوسمانی) و کۆلۆنێل چیرکۆف (ڕووسیا). کاری دەستەی تەکنیکی هەر لە پێش دانیشتنەوە هەڕەشەی ترسناکی لێوەکرا. یەکەمین کێشەش لەسەر دابەشکردنی خاکی کوردستان بوو. دەروێش پاشای نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی لەبری ئەوەی کەدەبوو لە ئیستەنبووڵەوە بچێ بۆ بەغدا، کە بڕیاربوو دەستەی تەکنیکی ساڵی 1849 لە بەغدا کۆببنەوە، بەشداری نەکرد و بەهێزێکی چەکدارەوە هێرشی کردە سەر قووتوور و ئیدارەی ئێرانی تێدا دەرکرد و ئۆردوویەک سوپای نیزامی عوسمانی لێوەدانا و نیشانەی سنووری بۆ ماوەی 6 تا 7 میل لە دووری شاری (خوی)یەوە دانا و لەسەری نووسی، کە لەم مێژووە بەدواوە ئەم ناوچانە بە دەوڵەتی عوسمانییەوە بەندن. ئەمە سەرەتای زنجیرەیەک لە "هەڕەشە و گوڕەشەی ناپەسەندی گۆشەگیرانە"بوون، کە نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی بەدرێژایی چەندین ساڵان لەکاتی ڕاپەڕاندنی پەیامەکەیدا دەیکردن[2].

---

[1] أ.د. جميل موسى النجار، المصدر السابق،صص 134-135

[2] Ibid., p. 124.

دەروێش پاشا نەک بە تەنیا بە خۆیی و سوپاوە کانتۆنی قووتووری داگیرکرد، بەڵکو ئەو لە یادداشتنامەیەکی نهێنییدا (کە ساڵی 1849 و 1903 لە ئیستەنبوولْ چاپکراوە) ئەم تێزەی پەرەپێداوە کە تورکیا هەقی خاوەندارێتی بەسەر تەواوی کانتۆنە کوردییەکانی باشوور تا ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ وەهەیە[1]. کار و کردەوەکانی نوێنەری عوسمانی، دەروێش پاشا ڕەوشی هەنووکەیی* سنووری ئێرانی-عوسمانییان بەشێوەیەکی تەماوی هێشتەوە، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا فەرمانکارەکانی بەریتانی لەکاری پێوان و وردبوونەوەی درێژەی سنوور بەردەوام بوون، هەرچی لە مۆسکۆ بوو ڕووسەکان خەریکی سازکردنی نەخشە بوون. ئەم حاڵەتە تا هەڵگیرسانی جەنگی قرم 1853-1856 درێژەی کێشا[2].

جەنگ و کێشەکانی سنوور وێڕای ئیمزاکردنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم(31ی ئایاری 1847) کەچی هەر درێژەیان هەبوو و تا دواجار بەریتانیا و ڕووسیا هەڕەشەیان لەو لایەنە کرد کە حورمەتی سنوور دەشکێنێ. بەشێوەیەک هەرلایەک حورمەتی سنووری لای دیکە بشکێنێ، ئەوا بەریتانیا و ڕووسیا دەدەنە پاڵ لایەنەکەی دیکە و هەموو یارمەتی و کۆمەگییەکی پێدەکەن[3].

سنووری ئێرانی-عوسمانی ماوەی چوار سەدە هەر بە ناکۆکی مایەوە، ئەوە تەنیا یەک هێڵی سنوور نەبوو کە لەسەری پێک نەدەهاتن، بەڵکو ئەوە چەندین ناوچەی تەواوی سەرلەبەر بوو کە ناکۆکی لەنێوان هەردوو وڵاتی

---

(1)Encyclopedie de l'Islam, editions E. J. BRILL, Paris, 1986, p. 464.

*Statu quo

(2)LONGRIG, op. cit, p. 279.

(3)Rahmatollah, A,A, Le conflit de frontière irako-iranien, Paris, 1936 , p. 31.

هاوسێدا درووست کردبوو و بوو بوو بەهۆی چەندین جەنگی خوێناوی، کە هەمیشە ئاشووبی سیاسی- ئایینی چەندین بیانووی زۆریان بۆ جەنگ بەدەستەوە دەدا[1]. هەروەها ڕێکەوتننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم 1847 کۆتایی بەدەسەڵاتداریێتی ناوخۆیی کورد هێنا و لە ساڵی 1849 بەدواوە ناوچەی شارەزوور ڕاستەوخۆ بەسترایەوە بە ئیستەنبووڵەوە و دوای یەکەم جەنگی جیهانیش تا ئەمڕۆ وەکو میراتێکی ناڕەوا بۆ دەوڵەتی نەتەوەپەرستی عێراق تا ئەمڕۆ ماوەتەوە.

پرسیار ئەوەیە ئایا بۆچی کورد لە هاوکێشەی ناوەند/ پەراوێزدا هەمیشە لە پەراوێزدا ژیاوە؟ بۆچی کورد نەیتوانی سنووری تایبەت بەخۆی هەبێ لەکاتێکدا هەموو نەتەوەکانی دیکەی ناوچەکە لەمەدا سەرکەوتن؟ ئایا ئەم هەموو هەرەس و تێکشکانە تەنیا بەهۆی هێزەکانی داگیرکارانەوە بووە یان کوردیش خۆی تێیدا گوناهبارە و دەکەوێتە ژێر بەرپرسیارەتییەوە؟ دواین پرسیاری سەرەکی کە وەک هەمیشە خۆی زەق دەکاتەوە ئەوەیە: بۆچی کورد هەمیشە لەناو یەک بازنەی بۆشدا خولاوەتەوە و مێژووەکەیشی تەنیا مێژوویەکە لە خوێن، لە تراژیدیا، لە قەڵاچۆکردن و پاککردنەوەی ئیتنیکی و کارەساتەکان وەک خۆیان هەمیشە دووبارە و چەند بارە دەبنەوە؟

---

[1]Ibid, p. 31.

## کۆبەند: ڕوانین و مەسەلە

کوردستان وڵاتێکی شاخاوی داخراوە، بەحوکمی شوێنە جوگرافییەکەیەوە هیچ کاتێک یەک دەسەڵاتی سیاسی حوکمی تێدانەگێڕاوە. میکانیزمی دەسەڵات لە کوردستان پێویستی بەیەک دەسەڵاتی ناوەندی سەرتاپاگیر نەبووە. ئەم واقیعە جوگرافیاییە بۆخۆی کۆمەڵێک میرنشین و بنەماڵەی دەسەڵاتداری ناوخۆیی لێوە پەیدابوو، کە تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لێرە و لەوێ حوکمڕانی بەشێکی زۆری ناوچەکانی کوردستان بوون. شوێنی جوگرافیایی کوردستان وای کردووە کوردستان هەمیشە بەردەبازێک بێ بۆ هێزە گەورەکانی ناوچەکە و هەروەها وەک هەمیشەش ناوچەیەکی تامپۆنی و جیاکەرەوە بێ بۆ پاراستنی سنوورەکانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران.

دەوڵەتانی عوسمانی و ئێران کە لەسەر بنەمای ناوەندێتیی دەسەڵات دەوڵەتی خۆیان چەسپاند بوو، جگە لەمە ئەوان خاوەنی شارستانییەتێکی گەورە و کولتوورێکی بەرزتر بوون لە کورد. هەروەک بەهەمانشێوە سروشتی جوگرافیایی کوردستان و نەبوونی هیچ ڕێگەیەکی بەیەکگەیشتنی ئاسان لەنێوان بەشەکانی کوردستاندا، ئەم وڵاتەی دابەش کرد بۆ سەر چەندین میرنشینی ناوچەیی چکۆڵە کە ئەم میرنشینانە بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەبوایە یان گوێڕایەڵی سوڵتانی عوسمانی بن، یان گوێڕایەڵی (شا)کانی دەوڵەتی ئێران بین و لەجەنگەکانیشیاندا بەشداری بکەن. ئەمە وایکرد کوردستان هەر بەڕاستی ببێتە سنووری سروشتیی بۆ ئەم هێزە هاوسێیانە.

لەلایەکی دیکەوە ونبوونی پێکەوەبەندیی ئابووری ڕێگەی بۆ یەکنەخستنی کوردستان خۆش کرد و دواتر دابەشبوونی ئەم میرنشینە ناوخۆییانە لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بوو بەجۆرە دیفاکتۆیەک. دابەشبوونی کوردستان بەسەر چەند میرنشینی بچووک بچووکی ناوخۆیی و ونبوونی یەک دەسەڵاتی سیاسی کوردیی، مەسەلەی کوردی بەدرێژایی چوارسەدە زیاتر خستە ناو پەراوێزی سیاسیی ئەم دوو دەوڵەتەوە. دوای داگیرکردنی کوردستان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەشی زۆری کوردستان بەڕەسمی سەر بە ویلایەتی شارەزوور بوو، بەڵام ئەم ویلایەتە هێندە درێژەی نەکێشا، زۆری میرنشین و خانەوادەی بچووک بچووک، عوسمانییەکان وایان پێ باشتر بوو کە کوردستان بە پارچە پارچەیی لەژێر دەستی چەند میر و بەگێکی کوردا بمێنێتەوە، ئەو میر و بەگانە لە کاروبارەکانی ناوخۆیی خۆیاندا ئازادبن، بەڵام بەمەرجێک هاوسۆزی و هاوپەیمانیی خۆیان بۆ سوڵتانی عوسمانی ڕابگەیەنن و ببنە شوورەیەک بۆ پاراستنی سنووری دەوڵەتی عوسمانی. ئەمە جۆرە دەسەڵاتێکی تایبەتی لە کوردستاندا دروست کرد کە لەهیچ ویلایەتێکی دیکەی عوسمانیدا بەدی نەدەکرا جگە لە کوردستان و لوبنان. لەم هەڵکەوتەدا میر و بەگە کوردەکان بەدوای بەرژەوەندی Privilege تایبەتی خۆیاندا دەگەڕان و خۆشیان هەر بۆ بەرژەوەندی خۆیان بۆ ئەم مەبەستە جەنگیان بۆ ئەم و ئەو دەکرد. لۆجیکی ئەم جەنگانە زیاتر پاراستنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بوو لەو کانتۆنە بچووکانەی کە دەوڵەتی عوسمانی ڕێگەی پێدابوون میرایەتیی تێدا بکەن.

کورد وەکو گەلێکی ئازا و سوارچاک، لەجەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیدا نەخشێکی دیاری بووە، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە سوپای کورد هەرگیز سوپایەکی نیزامی نەبووە و هێزی چەکداری کورد هەمیشە غەیرە نیزامی

جەنگاوە. تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمیش کورد بە زەبری شمشێری خۆیەوە توانیویەتی تای هاوکێشەی (بێ وڵاتی) خۆی لەگەڵ دراوسێکانیدا ڕاستبکاتەوە. لەوە بەدوا پەرەسەندنی چەک و چۆڵ و سوپای مۆدێرینی هەردوو دەوڵەت شوێنێکیان لەم هاوکێشەیەدا بۆ کورد نەهێشتەوە. باڵکێشانی دەوڵەتە کۆلۆنیالەکان بەسەر دەوڵەتی عوسمانی و قاجاریدا، کە سوپای ئەم دوو وڵاتەیان مۆدێرنیزە و پڕچەک کرد، بەشێوەیەک جیاوازییەکی یەکجار گەورە کەوتە نێوان هێزی سوپایی هەردوو دەوڵەت و هێزی خێڵەکی کورد، بۆیە ئەمە سەرەتای کۆتایی ڕۆڵی جەنگاوەریی کورد بوو لە ناوچەکە.

تۆلێرانسی کاتیی عوسمانی لە بەرامبەر میر و بەگە کوردەکان تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم درێژەی کێشا. لە چارەگی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە، ئیمپراتۆریای عوسمانی کەوتە هەوڵی بێبەریکردنی میر و بەگە کوردەکان. ئەمە ئەوە لێکدەداتەوە بۆچی تەنیا لەسەرەتای ئەم سەدەیە بوو کە ڕاپەڕینە فێودالییەکانی کورد کە میر و بەگە کوردەکان ڕابەرێتییان دەکرد تەقینەوە و بۆچی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕین؟. بێگومان ڕووداوەکانی ناوچەکە: ڕاپەڕینی والی محەممەد عەلی پاشا لە میسر، جەنگی ئازادیی یۆنان 1820، بزووتنەوەی پان-سلاڤیزم، جەنگی ڕووسیا- تورکیا 1828- 1829 و هەروەها خزینی مسیۆنێر و پیاوە سیاسییەکانی ئاوروپایی، کەمێک شوورەی داخراوی کۆمەڵی کوردیان تێکشکاند.

لە سەرێکی دیکەوە چ دەوڵەتی عوسمانی و چ دەوڵەتی قاجاری هەم لە ڕووی سیاسی و هەم لە ڕووی ئابوورییەوە بوو بوون بە نیمچە کۆلۆنییەکی ئاوروپایی. دەوڵەتی عوسمانی لە دەورانێکی بێهێزدابوو و لەبەرامبەر باڵادەستی هێزی مۆدێرینی ئاوروپاییدا پێویستی بە نوێکردنەوەی دەسەڵات و ڕیفورمی زۆر هەبوو. ئەم ریفۆرمانە پێویستیان بە ناوەندیکردنی* ویلایەتەکانی عوسمانی

*Centralisation

هەبووە. بەم شێوەیە ئەم ڕیفۆرمانە بە توندی کوردستانیان بەدەستەڵاتی ناوەندەوە دەبەستەوە. بۆیە هەرزوو دەوڵەتی عوسمانی بەرەو ڕووی بەرهەڵستی میر و بەگە کوردەکان بۆوە و چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشی چەکداریی دەرەبەگایەتیی هەموو نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمیان گرتەوە. بەڵام یارمەتی سوپایی و لۆجستیکی ئاوروپایی بۆ دەوڵەتی عوسمانی، باڵادەستی هێزە نیزامییەکانی عوسمانی لە بەرامبەر هێزی غەیرە نیزامی کوردا، جگە لەوەش کێشەکانی ناوخۆ و خیانەتی ناو ماڵی کورد- خۆی، هەموو ئەم ڕاپەڕینانەی لەناو گۆمی خوێندا هەڵکێشا.

دیاریکردنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت، بە واتەی سەقامگیرکردنی دابەشدان و یەک نەگرتنەوەی کوردستان بوو. دابەشبوونی کورد لە هەردوو دیوی سنووری هەردوو دەوڵەت، جێگۆڕکێ و هەوار گۆڕینی هۆزە کوردەکان لەم دیو سنوورەوە بۆ ئەم دیوی سنوور، گێچەڵی زۆری بۆ هەردوو دەوڵەت دەنایەوە و زۆرینەی کێشەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانی لەو بنەوانەوە سەرچاوەی دەگرت. کورد سەرکەوتوو نەبوو لەوەی ئەم سنوورانە ڕەشبکاتەوە کە بەناو دڵی وڵاتەکەیدا دەڕۆیشت.

دیارە لەمەدا دەبێ هەردوو هۆکاری دەرەکی و ناوەکی لەبەرچاوبگرین. گەشەسەندنی سەرمایەداری پێویستی بە ڕاگرتنی هێمنی و دەسەڵاتی ناوەندی هەردوو دەوڵەت هەبوو. بۆیە هەردوو دەوڵەتی کۆلۆنیالی بەریتانیا و ڕووسیا زۆر بەگەرمی لەپێناو بەرژەوەندییە سیاسی-ئابوورییەکانی خۆیان هاتنە ناو بازنەی کێشەی سنووری ئێرانی-عوسمانی کە ئەمە بەهیچ شێوەیەک بەقازانجی پرسی کورد نەشکایەوە. کۆلۆنیالیزمی ئاوروپی لە لووتکەی هێزو گەشەکردنی خۆیدا بوو و بەتەواوی دەستی بەسەر هەردوو دەوڵەتدا گرتبوو. ئەمە لەگەڵ خۆیدا پرسی کوردیشی پابەندکرد بەسیاسەتی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپاییەوە. لە پێودانگی ئەم پرسگرەوە دەبینین بەم چەشنە بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم و

سەرەتای سەدەی بیستەم پرسی کورد، مەسەلەی گرەوی سیاسەتی بەریتانیا و ڕووسیا بوو. پەیماننامەی یەکەم ( 28 ی تەمموزی 1823 ) و دووەمی ئەرزەرۆم (31 ی ئایاری 1847) بەرەنجامی سیاسەتی دەوڵەتە ئاوروپاییەکان بوو و لە ئەنجامدا بوو بە هۆی بە عوسمانیکردن و بە ئێرانیکردنی پرسی کورد کە ئەمە بەتوندی مەسەلەی کوردی لە ناوچەکەدا بە سیاسەتی کوردیی بەریتانییەوە بەستەوە.

هەروەها لە هۆکارەکانی ناوەوەدا نابێ هۆکارە ناوەکییەکانی ناو کۆمەڵگەی کورد- خۆی لەبیربکەین: بەها خێڵەکییەکان، کۆچەری و ترانس هیومان، پروپووچی ئایینی و ناکۆکی نێوان میرنشینە کوردەکان کە لەو هۆکارە بابەتییانە بوون کە لە دایکبوونی هۆشیاری نەتەوایەتی کوردیان ئیفلیج کرد.

پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم، بەیەکجارەکی مەسەلەی سیاسی کوردستانی خستە ناو پەراوێزی دەوڵەتی عوسمانییەوە. دەستهەڵگرتنی ئێران لە پشتگیریکردنی میرەکانی بابان (بەپێی بڕگەی دووەمی پەیماننامەکە)، ڕێگەی بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی خۆشکرد تا دەسەڵاتی ناوخۆی کورد، بەدەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ناوەندییەوە ببەستێتەوە، بەم شێوەیە مەسەلەی کورد کەوتە ناو بازنەی بەعوسمانیکردن و بەئێرانیکردن و لەهاوکێشەی ناوەند/پەراوێزدا، کوردستان شوێنی پەراوێزی وەرگرت.

دەوڵەتە گەورەکان پێیان وابوو کوردستان بەو دابەشبوونە پڕ لە خێڵەکییەی بۆ چەند کانتۆنی بچووکی ناوخۆیی، دەشێ ئارامی ناوچەکەی زیاتر بشلەقێنێ، لە کاتێکدا کۆلۆنیالیزمی ئاوروپایی و نەخوازەش بەریتانیایی لە هەموو کاتێک زیاتر ئارامی و هێمنی ناوچەکەیان دەویست. بۆ ئەوان پاراستنی ستاتووی هەردوو دەوڵەت بەلاوازییەوە زیاتر خزمەتی پڕۆژە ئابووری- سیاسییەکانی ئەوانی دەکرد تا کوردستانێکی پڕ لە دابەشبوونی خێڵەکی. دواتر

گۆڕینی نەخشەی سیاسی ناوچەکە هەرگیز بەقازانجی بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەکانی ئەوان نەدەشکایەوە. ئەمە ئەوە لێکدەداتەوە بۆچی دەوڵەتە ئاوروپاییەکان بەتایبەت ئینگلیز و فەرەنسا پاڵپشتی هەردوو دەوڵەت بوون لە لێدانی کەمینە نەتەوەییەکان، گروپە ئیتنیکییە موسڵمانەکان و سەرکوتکردنی راپەڕینە میللییەکان، کە لە زۆربەی جاردا بە هاریکاری لۆجستیکی و سەربازی ئەوان دادەمرکایەوە.

بەڕوویێکی گشتی لەگەڵ کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، مەسەلەی کورد بەتەواوی بوو بەگەمەی سیاسەتی کوردیی بەریتانیای مەزن لەناوچەکە. کێشەکانی سنووری ئێرانی-عوسمانی وێڕای پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم کەچی هەر بە زیندوویی وەکو خۆیان مانەوە. کۆمسیۆنی چوارینەی هاوبەش کە بۆ دیاریکردنی سنووری نێوان هەردوولا دەستنیشان کرا بوو تا سەرەتای جەنگی قرم 1853-1856 هەر خەریکی توێژینەوە و نەخشەبوون بۆ دیاریکردنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت. دیاریکردنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت، تاوەکو کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانیی (نەتەوە)ی کوردی کرد بە دوو پارچە، لەسەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا هەشتایەکانی سەدەی نۆزدەهەم کوردستان هیچ راپەڕینێکی گەورەی بەخۆیەوە نەبینی. راپەڕین و نارەزایی خێڵ و تیرەکان دژ بەدەسەڵاتی ناوەندیی زۆر بەئاسانی دادەمرکانەوە. هۆزی هەمەوەند لە شێستەکانی سەدەی نۆزدەهەم دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی راپەڕین، لێژنەی نێونەتەوەیی کۆبوونەوە و بڕیاریاندا هێندێک لە سەرکردە و خانەوادەکانیان بۆ رۆمیلی-لیبیا ڕابگوێزنەوە. لەم کاتەوە سیاسەتی بەریتانیا لە ناوچەکە بریتیبوو لە یاریکردن بەمەسەلەی کورد و ڕێگەگرتن لە هەموو هەوڵدانێکی نەتەوەیی کورد بۆ ئازادی. بەم جۆرە ستاتووی سنووری ئێرانی-عوسمانی لەژێر هەڕەشەی بەریتانیا و ڕووسیا ڕاوەستا

بوو دواجار ئەم دوو دەوڵەتە ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە دەستبەسەرداگرتنی مەسەلەی کورد بۆ ناو بۆتەی عوسمانچێتی و ئێرانچێتی. بەمەدا مەسەلەی کورد چووە ناو کەشوهەوایەکی نێودەوڵەتی و زیاتر ڕەهەندیکی سیاسی بەخۆیەوە گرت کە ئینگلیز دەورێکی باڵایان بینی لە دەستبەسەرداگرتنی پرسی کورد. بۆیە دەکرێ بوترێت مەسەلەی کورد لە ڕووی جیهانییەوە دوو ڕەهەندی سەرەکی بەخۆیەوە گرت:

یەکەمیان: ڕەهەندی ناوچەیی بە عوسمانیکردن و بە ئێرانیکردنی مەسەلەکە.

دووەمیان: ڕەهەندی نێونەتەوەیی، واتە دەستبەسەرداگرتنی ناڕاستەوخۆی مەسەلەکە لەلایەن هێزە کۆلۆنیالەکانەوە بۆ فشار وگوشاری سیاسی بۆسەر هەردوو دەوڵەت. هەموو مێژووی سیاسیی کوردستان لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیش لەم دوو خاڵە کۆدەبێتەوە. بگرە ئەم ڕەهەندەی دوایی، دوای دابەشبوونی دەوڵەتی عوسمانیش هێزی خۆی لەدەست نەدا و هەر بەزیندوویی پرسی کوردی لە بوارە نێودەوڵەتیدا هێشتەوە.

## فەرهەنگۆک

**ئاغا**: ناسناوێکە بۆ گەورە ئەفسەرانی سوپای عوسمانی بەڵام لە سیستمی خێڵەکیی کوردیدا، ئاغا سەرۆك یان بەرزترین بەرپرسی خێڵ یان هۆزە.

**ئاقچە**: پارەیەکی بچووکی زیوی عوسمانی بوو لە سەردەمی ئۆرخان لێ دراوە، یەکەی دراوی سەرەکی بوو لە دەوڵەتی عوسمانی (لە 1325 تا 1828ز) و هەر سێ ئاقچە دەیکردە یەک پارە.

**ئاق قۆینلو**: (خاوەن مەری سپی) هۆزێکی تورکمانی گەورە بوون و لە تورکمانستانەوە هاتبوون بۆ ئازەربایجان و پاشان بۆ دیاربەکر و دواتر لەنێوان ئامەد و موسڵ جێگیر بوون و دەوڵەتێکیان پێکهێنا لە 1403 تا 1508 حوکمڕانی عێراق و ئێرانیان کرد.

**ئیرادە**: فەرمانێك بە ئیمزای سوڵتان بۆ کاروبارێك کە گرینگی کەمتر بێ لە خەتی شەریف یان خەتی هومایۆن.

**ئەیالەت**: گەورەترین یەکەی ڕێکخستنی لۆجستیکی دەسەڵات بوو لە دەوڵەتی عوسمانی و لەژێر حوکمڕانی (بێگلەربەگ)ێکدا بەڕێوەدەچوو. ئەم زاراوەیە بەشێوەیەکی ڕەسمیی دوای ساڵی 1591 ەوە بەکارهێنراوە و تا ساڵی 1864 بە ڕەسمیی بەکاردەهات و دوای ئەوە پاش ئەوەی سیتمی ویلایات خرایەکار، ناوی (ویلایەت) شوێنی (ئەیالەت)ی گرتەوە

**ئەلمەغاسی عەرەبی**: شێخ ڕاشد ئەلمەغاسی مەنەتفیکی، شێخی هۆزی مەنتەفیکی عەرەبی بوو و بەناوی دەوڵەتی عوسمانییەوە وەک یەکەم بەگلەربەگ بەناوی دەوڵەتی عوسمانی لە 1538 تا 1546 حوکمڕانی شاری بەسرەی کردووە.

**ئینکشاری**: وشەیەکی تورکییە و مانای (سەربازانی نوێ) دەگەیەنێ و بەو گرۆ سەربازە پیادەیە نیزامییانە دەگوترا، کە هەر لە سەدەی چواردەهەمینەوە گەورەترین بەشی سوپای عوسمانی بوون بۆ داگیرکردن و لەشکرکێشی.

**بەگلربەگ**: هاوواتای وشەی ئەیالەت یان ویلایەتە، گەورەترین یەکەی کارگێری بوو کە بەگلربەگێک حوکمڕانی دەکرد.

**بەگلەربەگی**: بەگی بەگەوات، میری میران.

**بابیعالی**: بارەگەی سەرۆک وەزیران یا بارەگەی حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

**دەفتەردار**: سەرۆکی کارمەندانی داهاتی دارایی جا چ لە پایتەخت بوبێ یان لە ویلایەتەکاندا.

**بەگ**: ئەفسەری باڵا لە سوپای عوسمانی یا لە ئیدارەی عوسمانی و پلەکەی لە پاشا خوارتر بوو.

**پادشاه**: ناسناوێکی شەرەفیی لەلایەن سوڵتانی عوسمانی بۆ حاکمانی دیکە بەکار دەهات.

**دۆقیە**: پارەیەک بوو لە ڤینیسیا لێ دەدرا و کێشەکەی لەنێوان دە بۆ دوانزە فرانک بوو.

**تیمار**: سیستەمێکی زەویدارییە بە کەسانێک دەدرا لە بەرانبەر خزمەتی عەسکەری یان وردتر جۆرێک لە دەرەبەگایەتی عوسمانی بوو، کە خاوەنەکەی ناچار دەبوو خۆیی و چەند سەبازێک کە لەگەڵ داهاتەکەی

دەگونجا لە کاتی جەنگ ئامادە بن بۆ بەرەکانی جەنگ و ئیلتیزامێکە نرخەکەی نابێ لە بیست هەزار ئاقچە کەمتر بێت.

**کەهیە**: لە وشەی (کتخدا) ی ئێرانیەوە هاتووە، واتەی وەزیری یەکەم لە حوکوومەتی ویلایەت دەگەیەنێ، کە پاشایەک لە پاشاکان بەرێوەی دەبەن. بەرپرسی ئاسایش و دوای والی دووەمین بەرپرسیاری ویلایەت بوو.

**مەمالیک** (کۆی مەملوکی عەرەبیی):

1- جۆرە کۆیلەیەك بوون لە ڕەگەزی تورك، چەرکەس و مەغۆل، ئەیوبییەکان بۆ خزمەتی سەربازیی هێنابوویان، دوایی توانییان لەسەر کەلاوەی دەوڵەتی ئەیوبییە دەوڵەتێکی ئیسلامی بەناوی بەناوی دەوڵەتی مەملوکی، دەسەلاتی مەملوکی یا دەوڵەتی مەمالیك لە میسر درووست بکەن و پاشان شام و حیجازیشی گرتەوە (1250-1517 ز).

2- بەو کۆیلە سپییانە دەگوترا کە لە لایەن والییەکانی بەغداوە بۆ خزمەتکردنی سوپای عوسمانی دەکردران. ساڵی 1749 لەگەڵ دەسەلات بەدەستگرتنی سلێمان پاشا (ئەبولیلە) وەکو والی بەغدا دەورەی مەمالیک دەست پێ دەکات تا ڕوخانی دەسەلاتی داود پاشا لە ساڵی 1831 درێژەی کێشا.

**موتەسەلیم**: جێگری حاکم لە سنجاق یان لە ویلایەت کاتێک چەند ویلایەتێک لە لایەن یەک پاشا ئیدارەبکرێن.

**موتەسەریف**: حاکمێک کە حوکمی سنجاقێک یا لیوایەک بکات.

**رۆملی**: ئەو ناوە گشتییە بوو کە بەسەر خاکی دەوڵەتی عوسمانی دەبردرا کە دەکەوتنە ئەوروپا.

**خەلعەت**: جلی شەرەف، جلی شەرەفمەندی

**میهردار**: بەرپرسی مۆرهەڵگری والی لە ویلایەتدا.

موتەسەریف: حاکمی لیوا یان سنجاق.

**سنجاق**: دووەمین دابەشبوونی لۆجستیکیی بوو دوای ئەیالەت لەژێر حوکمڕانی موتەسەریفێک دا بوو و هەر ئەیالەتێک بۆ چەند سنجاقێک دابەش کرابوو.

**سەر عەسکەر**: سەرکردەی گشتیی هێزەکانی عوسمانی و وەزیری حەربییە لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

**سەدری ئەعزەم**: وەزیری یەکەم، وەکیلی سوڵتان، سەرۆکی حوکوومەتی سوڵتان لە دەوڵەتی عوسمانی (سەرۆك وەزیران) بەرزترین دەسەڵات بوو دوای سوڵتان.

**سوباشی**: لە کارگێری ئیدارەی هەرێمە عوسمانییەکاندا واتەی سەرکردەی لە سوپای تیمار دەگەیاند و پلەکەی لە سوباهی بەرزتر و نزمتر بوو لە پلەی سنجاق-بەگی.

**فەرسەخ**: یەکەیەکی پێوانەیە بەرانبەر بە سێ میل دەوەستێ.

**فەرمان**: مەرسوومی سوڵتانیی، ئیرادەی مەلەکی لەلایەن سوڵتانەوە دەردەچوو بۆ دامەزراندن یان پێدانی شتێک بە کەسێک.

**قزڵباش**: وشە بە وشە واتای (کڵاوسوور) دەگەیەنێت و دەربرینێکە تایبەت بوو بە سەربازە تورکمانەکان کە کڵاوی سووریان لەسەردەنا لە ئەمارەتەکانی ئەنادۆڵ. هەروەها قزڵباش ئەندامانی تایەفەیەک بوو لەناوەراستی و ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، بەشی زۆری ئەم تایەفەیە لە بنەچەی تورکمان و پەیرەوکارانی باوەڕی شیعە مەزهەب بوون و زۆربەی جار یاخی بوون لە سیاسەتی سوننەگەرای ناوەندیی دەوڵەتی عوسمانی. ئەم کاروکردەوەیە گەیشتە ئێرانییەکان و زاراوەی قزڵباش بەو سەربازە ئێرانییانە دەوترا، کە لە

دەورانی سەفەوییەدا (1501-1736) بەو سەربازە ئێرانییانە دەوترا کە کڵاوی سووریان لەسەر دەنا.

**قایمقام**: حاکمی قەزا و سەرۆکی یەکەی کارگێریی لە قەزا.

**قەرەقۆینلو**: (خاوەنی مەڕە ڕەش) هۆزێکی تورکمانی بوون، کۆنفیدراسیۆنێکی خێڵەکی بە بنچینە تورکمانن و لە ناوچەکانی: ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات، ئەرمینیا، ئازەربایجان، ئازەربایجانی ئێران، عێراق، ئیلام، خوزستان و باکووری کوێت لە 1375 تا 1469 حوکمڕانیان کردووە.

**والی**: حاکمی گشتیی ویلایەت.

# بیبلیۆگرافیا

## یەکەم: سەرچاوە یەکەمینەکان

### 1- بەڵگەنامە و دەستنووس:


-Public Record Office, London

- F.O. 371, 18970.,*Perso- Iraqi frontier desputes: proces- verbaux of the conference of Erzurum.-*
- F.O. 371, 18970, *The (explantorey note) and the ratification of the treaty of Erzerum.*
- F.O. 371. *18970 Annex. V., Replay of the ottoman governement to the British and Russian ambassadors at Constantinople.*
- F.O. 371. *18970 Annex VI., Note from Mirza Mohammmed Ali Khan to the Russian and British ambasadors, dated January 14 th/ 31 st, 18, 184..*
- FO.881/10024, *Enclosure I in n° 10, In(Extracts from correspondence relative to the Turco-Persian boundary negotiations)* part I, 1843-184, p. 57.
- FO.881/10024, *Enclosure 2 in N° 10. (Extract from Note from Persian Prime Minister to Grand Vizier relative to Suleimanieh, dated July 20 (about), 1841.*

- خسرو بن محمد منوجهر: *لب التواریخ*، دەستخەتی کتێبخانەی نیشتیمانیی پاریس بەناوی: (مێژووی هۆزە کوردەکانی بەنی ئەردەڵان)[1] لە (107)


[1] Histoire de la tribu Kurde des Beni Ardelan.

پەڕەدا.
• محمد رضا نصيري (دكتر)، اسناد ومكاتبات تاريخى إيران (قاجارية)، انتشارات كيهان، تهران. (4) جلد (1366-1368).
• محەممەد حەمە باقي، میرنشینی ئەردەلان ـ بابان ـ سۆران لە بەڵگەنامەی قاجاریدا 1799-1847، دەزگای ئاراس، هەولێر، 2002.
• وزارت أمور خارجه: گزيده إسناد سياسى إيران وعثمانى دوره قاجاريه، (6) جلد، تهران، 1369.

## 2- سەرچاوەی کوردی:

• شەرەفخانی بەدلیسی: *شەرەفنامە*، وەرگێڕانی هەژار، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا، 1971.
• مەستوورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەلان، وەرگێڕانی، د. حەسەن جاف و شکور مستەفا. دەزگای بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری کوردی، بەغدا، 1989.

## 3- سەرچاوەی عوسمانی:

• اسماعيل عاصم كوچك چلبى زاده، تاريخ چلبى زاده، مطبعة عامره، استانبول 1282ه.
• هاممەر، دولت عثمانيه تاريخى، مترجمى: محمد عطا، ج9، اوقاف اسلاميه مطبعه سى، استانبول 1335.

## 4- سەرچاوەی عەرەبی:

• حسن الدجيلي، *العلاقات العراقية الفارسية خلال خمسة قرون*، دار الهدى، بيروت، لبنان، الطبعة الثالثة، 1991.
• درويش باشا: *تقرير درويش باشا، رئيس لجنة تحديد الحدود الفارسية*

*العثمانية*، بغداد، مطبعة الحكومة، ترجمة وزارة الخارجية العراقية، بغداد، 1953.

- رسول الكركوكلي( الشيخ)، *دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء*، ترجمة: موسي كاظم نورس، بيروت، دار الكاتب العربي، 1963.
- سليمان فائق: *تاريخ بغداد*، نقله إلى اللغة العربية: موسى كاظم نورس، مطبعة المعارف، بغداد 1961.
- سليمان فائق: كتاب حروب الإيرانيين في العراق، تعريب محمد خلوصي بن محمد سعيد الناصري التكريتي، مجلة "آفاق عربية" بغداد (3-4)، 1980.
- عثمان سند البصري (الشيخ) ، *خمسة وخمسون عاما من تاريخ العراق 1188هـ- 1242هـ*، القاهرة، المطبعة السلفية، 1952.
- مرتضي أفندي نظمي زاده: گلشن *خلفا*، ترجمة عن التركية: موسي كاظم نورس، النجف، 1971.
- *مذكرات* مأمون بگ بن بيّگه بگ: ترجمة محمد جميل الروژبياني و شكور مصطفى، مطبوعات المجمع العلمي العراقي- الهيئة كردية- بغداد، 1982.
- محمد بن السيد احمد الحسيني البغدادي: رحلة المنشيء البغدادي، ترجمه عن الفارسية: عباس العزاوي، بغداد، 1948.
- مجموعة محاضر جلسات قومسيون تحديد الحدود التركية –الفارسية للسنة 1913-1914، بغداد، 1948.
- ياسين العمري، غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، نشرة محمد صديق الجليلي، الموصل، 1940.
- ياسين العمري، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد داراالسلام، بغداد، 1968.
- ياسين العمري، زبدة الآثار الجلية في الحوادث الارضية، تحقيق: د. عماد عبدالسلام رؤوف، النجف .1974

### 5- سەرچاوەی فارسی:


- جان مالكم، تاريخ إيران، ت: على رضا شيرازى، هندستان 1323ه.
- حسن بيگ روملو، أحسن التواريخ، تصحيح: د. عبدالحسين نوائى، ج2، انتشارات أساطير، ج1، تهران 1384 ه. ش.
- عبدالرزاق مفتون دنبلي: مآثر سلطانية، تاريخ جنگهاى إيران و روس، انتشارات ابن سينا، تهران، 1351.
- مستوره: *تاريخ اردلان*، بامقدمة و تصحيح تحشيه ناصر ئازاد پور، چاپخانه بهرامي، 1946.
- مشير الدولة: *رسالة تحقيقات سرحدية*، انتشارات بنياد فرهنگ إيران، تهران، 1348.
- ميرزا محمد تقي لسان الملک سبهر: *ناسخ التواريخ دورة كامل تاريخ قاجارية*، انتشارات أمير كبير، تهران، 1337.


### 6- سەرچاوەی ئینگلیزی:


- C, J RICH., *Narrative of a residence in koordistan and the site of ancient Nineveh,* t I & II London. 1836.
- FRAISER, J, B., *Travels in Koordstan, Mesopotamia, including an account of parts of those contries and manners of the Koordistan and arab tribes*, t I&II, London, 1840.
- HUREWITZ, J C., *Diplomacy in the near and Middle east, a documentary record 1535-1956*.t l, London, Oxford, Edition Archive, 1987.
- Köhbach, M, "AMASYA, PEACE OF". *Encyclopaedia Iranica, Vol. I, Fasc. 9*, 1989.
- LORIMER, J, G., *Gazettier of the Persian golf, Oman, and central arabia,* England, lth edition Calcutta, 1915,, Historical, part I B, reprinted, London, 1984.

### 7- سەرچاوەی فەرەنسی:

- ALFRED DE GARDANE., *Mission du general Gardane en Perse sous le Premier empire*. Documents, historiques. Paris, 1865.
- F. Colombari, Organisation actuelle de l'armée Persane (quelques détails sur l'Etat des frontières turco-persane) in *Le Spectateur militaire*, 15 février 1854.
- HAMMER, DE., *Histoire de l'Empire Ottoman depuis son origine jusqu'a nos jours*, traduite de l'allemande surla deuxieme edition, paris, t II, 1844.
- Hammer-Purgstall J, Histoire de l'Empire ottoman, depuis son origine jusqu'à nos jours. Tome 4, traduit de l'allemand par J.-J. Hellert, Paris, ed :1835-1843.
- J-L Bacqué-Grammont, Les Ottomans, les Safavides et leurs voisins: Contribution à l'histoire des relations internationales dans l'Orient islamique de 1514 à 1524, Nederlands Historisch-Archaeologisch Instituut te İstanbul, Édit: Peeters, 1987.
- Rahmatollah, A,A, Le conflit de frontière irako-iranien, Paris, 1936.

## دووەم: ژێدەر

### 1- کتێبی کوردی:

- بوار نورەدین، میر عەبدال خانی بدلیس بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لەمێژووی کورددا 1587-1680، چاپی دووەم، سلێمانی، 2008.
- سالّح محمد ئەمین: *کورد و عەجەم، مێژووی سیاسیی کوردەکانی ئێران*، کوردستان، هەولێر، 1992.
- سەعدی عوسمان هەروتی (پ. د) ، چەند لایەنێکی مێژووی ڕامیاری و کۆمەلایەتی و ئابووری کوردستان لەسەردەمی عوسمانیدا، هەولێر 2013.
- شەمسی موحەمەد ئیسکەندەر (د)، *مێژووی کورد لە سەدەی 16 هەمدا*،

وەرگێڕانی لە ئازەرییەوە: شوکر مستەفا، هەولێر، 1988.

- کەمال مەزهەر ئەحمەد (د)، *مێژوو*، بەغدا 1983.
- نەوشێروان مستەفا ئەمین، *میرایەتیی بابان لەنێوان بەرداشی رۆم عەجەمدا*، چاپی دووەم، کوردستان، سلێمانی، 1998.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، بەدەم رێگەوە گوڵچنین، مێژووی سیاسی، کتێبی سێ یەم، بەرگی یەکەم، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت، 2014

**2- کتێبی عەرەبی و بەعەرەبیکراو:**

- احمد محمود الخليل (د)، تاريخ الكُرد في العهود الاسلامية، منشورات دار ئاراس و دار الساقي، بيروت، 2013.
- إبراهيم خليل أحمد (د)، و خليل علي مراد (د)، إيران وتركيا: دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، 1982
- إبراهيم الداقوقي (د)، أكراد تركيا، دار ئاراس، ط2،أربيل، 2008.
- ايناس سعدى عبدالله (د)، تاريخ العراق الحديث 1258-1918، دار عدنان، بغداد، 2014.
- بروس ماسترز، عرب الامبراطورية العثمانية تاريخ ثقافي واجتماعي 1516-1918، ترجمة: عبدالجكيم ياسين، دار الرافيدين، 2018
- بوكريطة سارة وبن رابح لامية، الدولة الصفوية (906 ه/1500 م-982/1576 هزم)، جامعة الجيلالى بونعامه خميس، 2017.
- جابر الراوي (د)، الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الفارسية، بغداد، 1975.
- توفيق حسن فوزي، رؤية الوثائق والمصادر التركية للصراع العثماني والصفوي ومقدماته في عهدى بايزيد الثاني وسليم الاول، رسالة ماجستير في الآداب من قسم اللغة التركية، جامعة عين الشمس، 1986.

- خليل اينجاليك، تاريخ الدولة العثمانية من النشؤء الى الانحدار، ترجمه: د.محمد الارناؤوط، دار المدار الاسلاميه، بيروت، 2002
- جميل موسي النجار (أ.د)، العلاقات العثمانية الإيرانية: تتطوراتها وتاثير العراق العثماني فيها وانعكاسها عليه 1823-1875، بيروت، 2016.
- روبيرت مانتران، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة: بشير السباعي، دار الفكر للدراسات والنشر والتوزيع، القاهرة،ج 1، 1993
- سعدي عثمان حسين، إمارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر، مؤسسة موكرياني، اربيل 2000.
- س. موستراس، المعجم الجغرافي للامبراطورية العثمانية، ترجمة وتعليق: عصام محمد الشحادات، دار ابن حزم، بيروت، 2000.
- سعدي عثمان حسين (د)، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اربيل 2006.
- سعدي عثمان هروتي (د)، كوردستان والامبراطورية العثمانية. دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان 1514-1851، مؤسسة موكرياني، دهوك 2008.
- ثريا فاروقي، الدولة العثمانية والعالم المحيط بها، دار المدار الاسلامي، 2008.
- سيار الجميل، حصار الموصل، الصراع الاقليمي واندحار نادر شا، صفحة لامعة في تكوين العراق الحديث، الموصل، 1990.
- شاكر خصباك (الدكتور)، الكرد والمسألة الكردية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الثانية، بيروت، 1989.
- شاكر صابر الضابط، العلاقات الدولية ومعاهدات الحدود بين العراق وإيران، بغداد، 1966.

- شوقي ابوخليل (د)، تشالديران، سليم الاول العثماني و أسماعيل الصفوي، دار الفكر، دمشق، 2005،
- طالب محيبس حسن الوائلي (د)، الصفويون. من الطريقة الصوفية حتى تاسيس الدولة، دار تموز، ط 2، دمشق، 2011.
- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، الجزء الخامس والجزء السادس، بغداد، 1954.
- عباس العزاوي: عشائر العراق، الجزء الثاني، العشائر الكردية، بغداد، 1974.
- عباس اسماعيل صباغ (د)، تاريخ العلاقات العثمانية الإيرانية، الحرب والسلام بين العثمانيين والصفويين، منشورات، دار النفاس، الطبعة الثانية، بيروت، 2011
- عباس حسن الموسوي (كمال السيد)، نشوء وسقوط الدولة الصفوية (دراسة تحليلية)، ايران، قم، 2005
- عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا إلى نهاية حكم مدحت باشا، منشورات دار الكاتب العربي، القاهرة، 1968.
- عبدالعزيز سليمان نوار، العلاقات العراقية-الإيرانية: دراسة في دبلوماسية المؤتمرات (مؤتمر أرضروم 1843-1844، دار الفكر العربي، القاهرة، 1974
- عبدالعزيز سليمان نوار، داود باشا، والي بغداد، منشورات دار الكاتب العربي، القاهرة، بغداد، 1976.
- عبد ربه إبراهيم الوائلي، تاريخ الإمارة البابانية 1784-1851، دار الزمان، دمشق، 2008.
- عبد الودود واد الشيخ، القبيلة والدولة في افريقيا، ترجمة: محمد بابا ولد أشفغ، منشورات الدار للعلوم والناشرين ومركز الجزيرة للدراسات، بيروت، 2013

- علاء نورس، حكم المماليك في العراق 1750-1831، بغداد، 1975.
- علاء نورس، العراق في العهد العثماني، دراسة في العلاقات السياسية 1700-1800م، بغداد 1979.
- علي شاكر علي، تاريخ العراق في العهد العثماني، دراسة في أحواله السياسية 1638-1750، الطبعة الأولى، نينوى، العراق، 1985.
- علي شاكر علي (أ.د)، ولاية الموصل العثمانية في القرن السادس عشر، دراسة سياسية-ادارية-اقتصادية، منشورات دار غيداء للنشر والتوزيع، عمان، ط 1، 2011.
- علي الوردي: لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، الجزء الأول، بغداد، 1969.
- عماد عبدالسلام رؤوف (أ.د)، عادله خاتون صفحه من تاريخ العراق، ط 1، بغداد، 1997.
- فالح عبدالجبار، القومية مرض العصر ام خلاصه؟ منشورات دار الساقي، لندن، 1995.
- فاضل بيات(د)، الدولة العثمانية في المجال العربي : دراسة تاريخية في الاوضاع الادارية في ضوء المصادر العثمانية حصرا (مطلع العصر العثماني-اواسط القرن التاسع عشر) مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 2007.
- كاميران عبدالصمد الدوسكي، كردستان فى العهد العثمانى، الدار العربية للموسوعات، بيروت، 2006.
- محمد أمين زكي، تاريخ السليمانيه وانحائها، ترجمة: محمد جميل الروذبياني، بغداد، 1951.
- المقدم الشيخ عبدالواحد، الأكراد وبلادهم (تاريخ الشعب الكردي من أقدم العصور إلى العصر الحاضر)، المكتبة العلمية، ليک الاهور، باكستان، الطبعة الثانية، 1970.
- محمد أمين زكي، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان منذ اقدم العصور التاريخية حتى الآن، ترجمة: محمد علي عوني، الجزء الأول، الطبعة الرابعة، بيروت، 1966.

- محمد عبدالطيف هريدي، الحروب العثمانية الفارسية واثرها في انحسار المد الاسلامي عن اوروبا، دار الصحوة للنشر والتوزيع، القاهرة، 1987.
- محمد جمال باروت، الصراع العثمانى-الصفوى وأثاره في الشيعية في شمال بلاد الشام، المركز العربي للابحاث ودراسة السياسيات، بيروت، ط 1، 2018.
- محمد فريد، تاريخ الدولة العلية، منشورات مؤسسة هنداوى للتعليم والثقافه، القاهره، 2014
- محمد سهيل طقوش، تاريخ الدولة الصفوية (في ايران) 907-1148 ه/1501-1736م، ط 1، بيروت، دار النفائس، 2009.
- محمود شاكر، التاريخ الاسلامي (العهد العثماني)، ج 8، ط4، بيروت، 2000.
- مينورسكى، مختصر تاريخ نادر شاه، ترجمه الى العربية: نظام عزالدين محمد على، بلا
- مهدي جواد حبيب (الدكتور)،"الصراع العثماني-الفارسي واثرة في العراق حتى أواخر القرن التاسع عشر"، في كتاب (*الحدود الشرقية للوطن العربي*)، بغداد، دار الحرية للطباعة، 1981.
- موسى بن محمد آل هجاد الزهراي (الدكتور) ، الدولة الصفوية إلاثنى عشرية: النشأة ، وآلاثار ، وعوامل الانهيار، مركز العصر للدراسات االستراتيجية والمستقبلية – لندن، 2016.
- ن. آ. خالفين، الصراع على كردستان، المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ترجمة الدكتور أحمد عثمان أبو بكر، بغداد، 1968.
- نجاة عبدالله (د)، الامبراطوريات، الحدود والقبائل الكردية، كردستان ونزاع الحدود التركي-الايراني (1843-1932) ، بنكەی ژین، طهران، 2020.

* وجيه كوثراني، الفقيه والسلطان: جدلية الدين والسياسة في تجربتين تاريخيتين العثمانية والصفوية-القاجارية، مركز العربي للابحاث ودراسة السياسيات، بيروت، ط 4، 2015.
* يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة: عدنان محمد سلمان، ج 1، منشورات مؤسسه فيصل للتمويل، تركيا، اسطنبول، 1988
* يوسف عزالدين(د) ، داود باشا ونهاية مماليک في العراق، منشورات دار البصري، بغداد، 1967.

### 3- توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بەزمانی عەرەبی:

* أنستاس الكرملي (الأب )، *اليزيدية*، مجلة المشرق، المجلد الثاني، بيروت، 1899.
* أبو وردة عبدالوهاب عطية السعدني، الصراع العثماني الصفوي نتائجه السياسية والعسكرية، في مجلة كلية اللغة العربية باسيوط (جامعة الازهر)، مصر، 1993.
* عبدالعزيز سليمان نوار (الدكتور)،"دور العراق العثماني في حرب القرم"، *المجلة التاريخية المصرية*، المجلد الثالث عشر، القاهرة، 1968.
* عبدالفتاح علي بوتاني، (ادريس البدليسي، دوره واثره في التاريخ الكوردي)، مجلة كاروان، العدد (24)، اربيل، ايلول 1984.
* علي شاكر علي (أ.د)، الاصول التأريخية للكيانات السياسية في الشرق الادنى الحديث (دولة الاق قوينلي (الخروف الابيض) في الاناضول والعراق 1378-1508م/780-914 هـ. مجلة جامعة كركوك للدراسات الانسانية، المجلد 7، العدد 3، لسنة 2012
* طه ثلجي الطراونة، النزاع الصفوي العثماني حول العراق، في حوليات آداب

عين شمس، مصر، المجلد 31 (يولية-سيتمبر 2003)،

- ى.أ.فاسيليفا (الكتاب الضائع عن تاريخ الكُردي)، ترجمة كاروان كاداني، مجلة (كولان العربي)، العدد (58)، اربيل، اذار 2001.

### 4- كتێبی فارسی:

- عبدالرضا هوشنگ مهدوي، تاريخ روابط خارجي إيران، انشتارات امير كبير، تهران، 1364.
- غلامر ضا ورهرام (دكتر)، تاريخ سياسي و سازمانهاي اجتماعي إيران در عصر قاجار، انتشارات معين، تهران، 1369.
- غلامرضا طباطبائي مجد، معاهدات وقرار دادهاي تاريخي در دورۀ قاجارية، تهران، 1373.
- فريدون ادميت، امير كبير و إيران، شركت سهامي انتشار، چاپ پنجم، تهران 1956/2535.
- فيروز منصوري، استعمار بريتانيا ومسئلة اروندرود، مؤسسة مطالعات تاريخ معاصر إيران، چاپ أول، 1376.
- فيروز منصوري،"تاريخ از تهاجم و همساية ازاري عثمانيان سخن مي گويد"، (إيران و قفقاز)، نوشتة، گرداورى و تنظيم: دكتر پرويز ورجاوند، چاپ أول، تهران، 1999/1378.
- محمود-محمود، تاريخ روابط سياسي إيران و انگليس در قرن نوزدهم، چاپ پنجم، تهران، ج (1)، انتشارات اقبال،1362.
- لارنس لاكهارت، انقراض سلسله صفويه، ت: اسماعيل دولتشهاهى، چ2، تهران 1380.

- نصرالله صالحي، اسناد از روند انعقاد عهدنامة دوم أرزنة الروم (1258-1268ه ق)، انتشارات وزرات أمور خارجة، مركز چاپ و انتشارات، تهران، 1998/1337.
- هاشم حجازى فر، شاه اسماعيل اول و جنگ چالدران، انتشارات سازمان اسناد ملى ايران، ج اول، تهران، 1995/1374.


### 5- کتێبی ئینگلیزی:


- Bendict Anderson, L'imaginaire national, réflexions sur l'origine et l'essor du nationalisme, traduit de l'anglais par Pierre-Emmanuel Dauza, éditions la Découverte, Paris, 1996.
- BRUINESSON, M, V, Aga, *Shaikh and State, The social andpolitical structures of Kurdistan,* Editions Zed Books Lid, London, 1992.
- Creasy, Edeard S., History of the ottoman Turks, London 1878, new published (Khayats Beirut 1961).
- EDMONDS J, C, , *Kurds Turks and Arabs, travel and research in North-Eastern Iraq 1919-1925*, London, Oxford University Press, 1957.
- Jackson, Peter and Laurence Lockhart, the Cambridge History of Iran: The Timur and Safavid Periods, Vol.6, Cambridge University Press, 1986.
- LONGRIG, S, H, *Four centuries of modern Iraq*, Oxford, London, 1925.
- MARK SYKES, « The kurdish tribes of the Ottoman empire », In (*The journal of the Royal anthropological institute*, vol XXXVIII, JULY TO DECEMBRE 1908.
- Michael J. McCaffrey;" ČĀLDERĀN ", *Encyclopaedia Iranica,* Vol. IV, Fasc. 6, 1990.


### 6- کتێبی فەرەنسی:


- AFCHAR, *La politique europeen en Perse ؟Quelques - Pages de l'histoire diplomatique,* paris, 1921.
- Anne-Marie Hattingois-Forner, Jean Hubac et Nadine Viver, Le Moyen Orient de 1876 à 1980, Amphi Histoire, Bréal, 2016.

- Bendict Anderson, L'imaginaire national, réflexions sur l'origine et l'essor du nationalisme, traduit de l'anglais par Pierre-Emmanuel Dauza, éditions la Découverte, Paris, 1996
- Hamit Bozarslan, (Diyarbakir), In : François Georgeon, Nicolas Vatin, Gilles Veinstein Dictionnaire de l'Empire Ottoman - XVe-XXe siècle, Paris, 2015.
- *Encyclopedie de lislam*, editions E. J. BRILL, Paris, 1983.
- Francis Richard, Le siècle d'Ispahan, Gallimard, Paris, 2007
- Chagnollaud, Jean-Paul et Souiah, Sid-Ahmed, Les frontières au Moyen-Orient, Ed. L'Harmattan, Paris, 2004
- Ernst Gellner, Nation et nationalisme, traduit de l'anglais par Bénédicte Pineau, Ed. Payot, Paris, 1994
- GUICHONNET, P & RAFFESTIN, C., *Geographie des frontieres*, PUF, paris, 1974.
- Jean-Paul Roux, Histoires des Turcs : deux : milles ans du Pacifque a la Meediterane, Ed. Fayard, Paris, 1984
- Jean-Paul Roux, Histoire de l'Iran et des Iraniens: Des origines à nos jours, Fayard, Prais, 2006.
- LE, R.D.M.A., *Le conflit Irake Iranien*, Editions du monde Arabe, Pais, 1982.
- Mohammad-Reza Djalili, Thierry Kellner, *Histoire de l'Iran contemporain*, Ed. La Découverte. Paris, 2010.
- Michel Foucher, *Fronts et frontières. Un tour du monde géopolitique*, Paris : Fayard, 1988.
- Nation et nationalisme, *les dossiers de l'Etat du mondeeditions*, Ed. la Decouverte, paris, 1995.
- Pierre-Charles Pupion, Stéphane Trébucq, La question des frontières : un enjeu majeur pour les managers publics et le management public, In *Gestion et management public* 2019/2 (Volume 7), n° 4.

- RAHMATOLLA, A, A, *Le conflit de frontiere irako-iranien*, Paris, 1936.
- Riccardo Bocco, Daniel Meier, Penser la notion de frontière au Moyen-Orient, in A contrario 2005/2 (Vol. 3)
- Soheila Ghaderi Mameli, *Quelles frontières pour le Moyen-Orient ؟Les frontières des États nés de la partie asiatique de l'Empire Ottoman 1913-1939*. Thèse de Doctorat sous la dir. de Jacques Thobie, Université de Paris I Panthéon Sorbonne, Paris, 1996.


### 7- کتێبی تورکی:


- Bekir Kütükoglu, *Osmanli-Iran siyasî münâsebetleri*, I (1578-1590), Istanbul, 1962.
- Azmi Özcan, Nâdir Sah, In Islam Ansklopedis, 32, 2008.

# پاشكۆكانی كتێبەكە

**پاشکۆی (1):**

دابەشدانی کوردستان لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بەگوێرەی پەیماننامەکانی: زەهاو 1639، کوردان 1476، ئەرزەرۆمی دووەم 1847.



## پاشکۆی (2) :

دابەشکردنی کوردستان بەگوێرەی پەیماننامەی زەهاو 1639.



## پاشکۆی (3) :

میرنشینە کوردییەکان لە سەدەی حەڤدەهەم تا ساڵی 1860.



## پاشکۆی (4):

کۆپی نوسخەی ئەسڵیی پەیماننامەی زەهاو (قەسری شیرین) بە زمانی تورکی عوسمانی 17 ی ئایاری 1639.



## پاشكۆی (5):

وەرگێڕاوی کوردیی پەیماننامەی زەهاو (قەسری شیرین) 17 ی ئایاری 1639.

بسم الله الرحمن الرحیم

لا حول و لا قوة الا بالله

لە پاشان:

لە بەر ئەوەی بە مەشیئەتی جەنابی ذو العرش المجید و ئیرادەی حەزرەتی فعالی مایرید، ئینتیزامی ئەسبابی عالەم و رتق و فتقی ئوموری بەنی ئادەم، بەند و بەستراوە بە تەوافوق و ئولفەتی سوڵتانەکانی روی زەمین و خاقانەکانی هیدایەت قەرینەوە، کە مەزهەری ئایەتی کەریمی "الذین جاهدوا" و میصداقی "والموفون بعهدهم اذا عاهدوا" ن.

لەژێر باڵی حیمایەتی ئەوان دا مەمالیکی ئیسلامیە لە شەڕوشۆڕ مەئمون و مەمالیکی موئمینین بە کەمالی ئەمن و سەلامەت مەرهونە، بە تایبەتی بە مەدلولی "انا جعلناك خلیفه في الارض" پلەی بەرزی سەڵتەنەتی کوبرا و پایەی بڵندی خەلافەتی عولیای ئێمەی مونتەهالغایاتی هەمو تەبەقەکان فەرموە، بە خۆشیی خزمەت کردنی حرمین الشریفین "شرفها الله تعالی" ذاتی قودسی صیفاتی ئێمەی شەرەف و عیزەت و، بە موتابەعەتی سوننەتی سوننیەی حەزرەتی رسول الثقلین "صلی الله تعالی علیه و سلم" دایرەی دەوڵەت و سەڵتەنەتی ئێمەی فراوان و بەرین کردوە، دەرونی صەفا مەشحونی ئێمەی بە ئەنواری موحیبەتی ئال و ئەصحاب موحەللا و موصەفا پێڕەوی ڕێی پڕ تۆفیقی ئەوانی کردۆتە هۆی ڕزگاری ڕۆژی جەزا.

ئێمەی بە فەحوای "فاحکم بین الناس بالعدل" مالیکی مەمالیکی عەدل و داد و بە ئەمری لازمولئیمتیسالی "جاهدوا في الله حق جهاده" سالیکی مەسالیکی غەزا و جیهاد فەرموە و، فەحوای شەریفی "ان تنصرو الله ینصرکم" بەردەوام لە بیری ئێمەی دایە و بزوتن بەپێی لوتفی خوداوەندی هەمیشە کار و پیشەی ئێمە بوە، شمشێری زەفەرقەرینی ئێمەی بۆ دەفعی کافران و موشریکان کردۆتە دیواری ئاسنین و لە دەوری سنوری مەمالیکی موسلیمین دا کردۆتە قەڵای پتەو، ڕۆژانی دەوڵەتی روزئەفزونی ئێمەی سەبات و دەوام و، سیلسیلەی سەڵتەنەتی هومایونی ئێمەی ئەبەدولدەهر ئیستیقرار و ئیستیحکام دا "جل مالا یعد نعمائه، قدمت ذاته و اسمائه" پاش پێشکەش کردنی تەسلیماتی وافیات و ئەتحافی دەعەواتی صافیات بە حزوری - موصافات زوهوری عالی حەزرەت، مەعالی مەنقەبەت، سامی روتبەت، گیرامی مەنزیلەت، مەسنەد نشینی ئیقلیمی ئێران، حامی فارس و مازندەران، فەرماندەی موڵکی عەجەم (شاه صەفی) - دام منظورا بعنایت ربه الوفی، انهاء مسالمت انتها - کە:

نامەی خلت خیتامەی ئێوەی بە هۆی عەینولئەعیان موحەممەد قولی - رزقت سلامته - گەیشتە عەتەبەی عەلییەی گەردون ویقار و سدەی سوننیەی عالەممەداری ئێمە، خولاصەی فەحوای بەلاغەت ئیحتیوای ئەو ئایەتی ئولفەت عینوان "وجعل بینکم موده" ی تەفسیر و بەیان کریمەی مەرامەت نیشانی "و القیت علیك محبه" ی تەقریر و عەیان کردوە، لە بەر ئەوەی بە سیراتی موستەقیمی موصافات موهتەدی و بە شیمەی کەریمەی قوددەما موقتەدی و تالیبی صولح و صەلاح و ڕاغیبی فەوز و فەلاح بوی، عومدەتولخەواص وەلموقەڕڕەبین صارو - زید رشدەتان وەکیلی خۆتان نارد بو لە گەڵ - دەستوری ئەکرەم، موشیری ئەفخەم، نیزامولعالیم، نازیمو مە نازیولئومە م - موستەفا پاشا - ادام الله اجلاله - کەوەزیری ئەعزەمی جەلیلولمیقداری ئێمە

و سەردار وسپاسالاری ڕۆژهەڵاتە، لە زەهاو یەکترییان بینی و، لە بارەی ڕێکخستنی کاروباری صولح و عهودی جێبەجێ کردنی کێشەکانی سنور دوان و، بڕیاریان دا:

لە سنوری لای بەغداد و ئازەربایجان دو شوێن بە ناوی جەصان و بەدرە هی ئێمە بن، قەصەبەی مەندەلی تا دەرەتەنگ، کە سەرمیل بە سنوری دیاری کراوە، لە گەڵ دەشتەکانی بۆ ئێمە بێ، شاخەکەی نزیکی بۆ ئەولا بێ، میلباشی بۆتە سنور، دەرەتەنگ و دەرنە هی ئێمەن. هۆزەکانی زیادین و هارونی لە ئێلی جاف هی ئەعلا حەزرەتی هومایونی ئێمەن و، پیرە و زەردویی یش بۆ لاکەی تر ماوەتەوە. قەڵای زنجیرە کە بە لوتکەی شاخەوەیە وێران بکرێ، ئەو گوندانەش کەوتونەتە ڕۆژئاوای قەڵای وێرانکراوی ناوبراو بۆ ئێمە ئەمێنێتەوە و ئەو گوندانەش ئەکەونە ڕۆژهەڵاتی بۆ ئەولا ئەبن. لە نزیکی شارەزور ئەو کێوەی کەوتۆتە ئەولای زەڵم هەرشوێنێکی بڕوانێ بە سەر قەڵای ناوبراودا لە لایەنی هومایونی ئێمەوە زەوت کراوە، قەڵای هەورامان لە گەڵ گوندەکانی دەوروبەری بۆ لایەنەکەی تر، گەردنەی چەقان دانراوە بە سنوری شارەزور. قزڵجە و دەوروبەری هی ئێمەن و مەریوان و دەوروبەری هی لایەنەکەی تر.

هەردولا بڕیاریان داوە قەڵای قوتور و ماکۆ لە سەر سنوری وان و، قەڵای مغازبرد لە لای قارس کاول بکەن. لەبەر ئەوەی لەو نامەیەدا ڕەزامەندی خۆتان بە قەول و قەراری باس کراو، بەو جۆرەی ڕون کراوەتەوە، ڕاگەیاند بو وە بەڵێنت دابو بە دواوە ئەم مەراسیمی موعاهدە و موصافاتە ڕیعایەت و مواسات و موالاتی لازم صیانەت بکەی و، بە ئیمانی خۆت وەفا ئەکەیت و لە کەسر و خەلەفی خۆت لا ئەدەیت. وە داوات کرد بو کە بەڵگەی مۆرکراوی گەیشتوی ئێوە، لە لایەنی هومایونی ئێمەوە قوبوڵ بکرێ، جا لە بەر ئەوەی "انجاز الوعد من دلائل المجد" لە پێناوی ئاسایشی خەلایەق و عیباد و ئارامی مەمالیك و

بیلاددا، ئەم صوڵحی موقەڕەڕ و صەلاح شمولە قوبوڵ کرا بەو مەرجەی تائیفەی قزڵباش دەس هەڵبگرن لەو مەحاڵ و شوێن و دەشت و ئەرزانەی کە بەشێکی مەمالیك و بیلادێ ئەژمێردرێ کە لە ناو سنوری دیاریکراوی ئەعلا حەزرەتی ئێمە دان و لە ژێر سایەی عەدالەتی پایەبەرزی ئێمەدان. بە پێ ی "الشی اذا ثبت ثبت بلوازمه" ئەو ئەرزانە ئیتر چ ئاوەدان بن یا چۆڵەوانی لە گەڵ تەوابیع و لەواحیقی دا لە دەستی تەصەڕوفی موەککیلاتی بارەگای بەرز و موتەعەهیدانی دەرگای بڵندی ئێمە دان.

سەرەڕای ئەوانەش کە ناویران، ئەبێ ئەوان دەستدرێژی نەکەنە سەر قیلاع و بیقاع ونەواحی و صەحاری و بەراری و تیلال و جیبالێ کە لە ناو سنوری ئاخسقە، قارس، وان، شارەزور، بەغداد، بەصرا دان.

بەپێ ی شەرتە موعتەبەرە صەریحەکانی ئەو پەیماننامانەی لە زەمانی سەعادەت ئیقتیرانی ئەجدادی عیزامی ئێمە دا - انار الله تعالی براهینهم - بۆ ئەسلافی ئێوە نێردراوە، وە بە مەدلولی قسەی: "الدینه النصیحه" ئەسافیل و ئەدانی کە لە ژێر دەستی حکومەتی ئیوە دان ئەبێ ڕێگە نەدرێن. دەمدرێژی بکەنە سەر شەیخەینی زولنورەین هاوسەری پاکیزەی رسول الثقلین و گشت ئەصحابی هەڵبژاردە و ئیمامە موجتەهیدەکان - رضوان الله تعالی علیهم اجمعین - حاشا، دیسان حاشا، ڕێگەی دەمدرێژی نەدرێن و، لێیان قەدەغە بکرێ و، بە هیچ جۆرێ ڕێ نەدرێن بۆ ئەوەی ئەم صوڵحە موقەڕەڕە، الی انتهاء القرون، سابیت و بەرقەرار بمێنێ.

مادەم لەلایەن ئێوەوە پێچەوانەی عەهد و میساق جوڵانی ناشایستە ڕو نەدا، لە قەرینولشەرەفی پادشاهانەی ئێمەشەوە، بە شێوەی باسکراو، شروت و قیود بەو جۆرەی نوسراون پێڕەوی ئەکرێ. پەلاماری ڕەعییەت و مەملەکەتی ئێوە نادرێ. لە بەرامبەر ئەو بەڵێننامەیەی ناردراوی ئێوەدا، ئەم نامە هومایونیە پڕ

لە ڕاستگۆییە نوسرا، کە دوژمنایەتی لە ناوا نەمێنێ و، لە جاران زیاتر ڕیعایەتی مەراسیمی ئولفەت موافەقەت بکرێ.

سەفیری مەئموری شەرەفی ماچکردنی بیساتی عیزەت ئینبیساتی شاهانەی ئێمەی موفتەخیر بو، دوای ئەوەی ئادابی ڕیسالەتی -کما هو حقه- بە جێ هێنا، بە ئیجازەی شاهانەی ئێمە ڕێگە درا بگەڕێتەوە لاتان، هاوڕێ لە گەڵ ئیفتیخارولئەماجید وەلئەکاریم موحەمەد، دامە مەجدوهو، کە لە خزمەتگوزارانی دەرگا و مەئموری تەبلیغی نامەی هومایونی ئێمەیە، ڕەوانە کران.

صەلاح ئەندێشانی دین و دەوڵەت هەردەم مەزهەری ئیحسانی ملکی مەننان بن، برب العباد و بالنبی واله الاماجد.

لە سەرەتای مانگی شەوالی ساڵی هەزارو چل و نۆی هیجری (کانونی دوەمی 1639) دا نوسرا.

سەرچاوە: مشیر الدوله، میرزا سید جعفر مهندس باشی: "رساله تحقیقات سرحدیه"، به اهتمام محمد مشیری، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، (تهران 1348 ش)، 74 - 81.

## پاشکۆی (6) :

ڕێککەوتننامەی ڕوسی -عوسمانی
(11 ی حوزەیرانی 1724)

پێشەکی:

لەبەر ئەوەی مەحمود ئەصفەهانی داگیر کردوە، شای هاویشتە زیندانەوە، گیروگرفتی گەورە لە ئێران ڕوی داوە، تورکیا ناچار بوە هێزێ بنێرێ بۆ دەس بە سەراگرتنی ئەو شارانەی گرتنیانی بە پێویست ئەزانێ. قەیسەر، دۆستی بابی عالی، دەربەند و باکی و چەند شارێکی گرتوە. ئەو مەسەلەی سپاردنی ئەم شارانە و ولایەتەکانی گەیلان و مازندەران و ئوسترابادی بەپێی ڕێککەوتنێ لەگەڵ تەهماسب تەئمین کردوە. قەیسەر و پاپ ڕێوشوێنێکیان داناوە کە یارمەتی تەهماسب بدرێ، وە ئەو تا دڵنیا نەبێ لە وەی کە تەهماسب، ئەو شارانەی تورکیا داوایان ئەکا بەو دەوڵەتە ئەسپێرێ، لە تەقەلا باشەکانی خۆی درێخی ناکا.

مارکی دوبنناك لەلایەن ڕوسیا و تورکیاوە بۆ کاری ناوبژی هەڵبژێردراوە.

مادەی یەکەم:

سنوری روسیا و تورکیا ئەبێ لەو شوێنەوە دەس پێ بکا بە ماوەی 22 سەعات سوارەڕێ لە دەربەندەوە بۆ ناوەوەی وشکایی. سنورەکە ئەبێ لەو کێلەوە کە لەم شوێنە دا دائەنرێ تا کێلێکی تر کە ئەکەوێتە سێیەکی ڕێگەی شەماخی بۆ دەریای خەزەر درێژ ئەبێتەوە. لە شوێنی دوەمەوە ئەبێ هێڵێکی ڕاست تا دواوانی ڕوبارەکانی کورا و ئاراس بکێشرێ. ڕوسیا و تورکیا، هەردوکیان لە نزیکایی ئەم شوێنەی دواییانەوە مافی دروستکردنی قەڵایان

هەیە، بەڵام جێگەکانیان ئەبێ 3 مەنزڵ لە سنورەوە دور بێ. کار پێ سپێردراوانی هەردو لایەنی پەیمانکار، لە گەڵ کار پێ سپێردراوێکی کە ئیمپراتۆری فەرانسە دای ئەنێ ئەرکی دیاری کردنی سنور هەڵ ئەگرن. هەردو لای پەیمانکار ئەتوانن لە ناوچەکانی خۆیان دا قایمکاری بکەن و بنکەی لێ دابمەزرێنن، بەڵام نابێ ئەم قایمکارییانە ماوەی 3 سەعات سوارەڕێ لە سنور نزیکتر بن.

مادەی دوەم:

شەماخی کە ئەبێ بارەگای خان یا حاکمێکی سەر بە شیروان بێ، بە هی تورکیا ئەناسرێ، بەڵام نابێ قایمکاری لێ بکرێ یا بنکەی تورکی لێ دابنرێ. لە کاتی ڕودانی ئاژاوەدا ئەشێ سپای تورکی بۆ بنێردرێ.

ماددەی سێیەم:

سنوری تورکیا و ئێران ئەبێ لە شوێنی تەواو بونی سنوری ڕوسیا و تورکیا، واتە لە دواوانی روبارەکانی کورا و ئاراسەوە دەس پێ بکا. ئەبێ لەم شوێنەوە هێڵێ تا شوێنێکیتر کە ماوەی 1 سەعات سوارەڕێ کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری ئەردەبیلەوە بکێشرێ، هەمو ئەو ئەرزانەی ئەکەونە ڕۆژئاوای ئەم هێڵەوە، ئەکەونە ژێر دەسەڵاتی تورکیاوە. لەم شوێنەوە کە دوراییەکەی تا ڕۆژئاوای ئەردەبیل 1 سەعات سوارەڕێیە، ئەبێ هێڵێکی ڕاست بۆ هەمەدان و لەوێشەوە بۆ کرماشان بکێشرێ.

مادەی چوارەم:

قەیسەر بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ تەهماسب کردویەتی بەڵێن ئەدا تا دڵنیا ئەبێ لە سپاردنی هەمو شارەکانی، کە لە مادەی سێیەمدا ناوبراوە، بە بابی

عالی، تەقەلای باش ئەدا. بەڵام ئەگەر تەهماسب نەچوە ژێر باری جێبەجێ کردنی ئەو ڕێککەوتنەوە، ڕوسیا و تورکیا هەردو بە جوتە بۆ گرتنی هەمو ئەو ئەرزانەی کە هی ئەوانە پێکەوە هەنگاو ئەنێن. دو دەوڵەتی گۆرین، پاشماوەی ئێران دوای ئەوەی ئاسایشی تێ گەڕایەوە، بە کەسێکی ئێرانی ئەسپێرن، کە زۆرتر شایستەیی فەرمانڕەوایی هەبێ. ئەو کەسە خاوەنی سەڵتەنەتی تەواو ئەبێ و سەربەخۆ ئەبێ.

ماددەی پێنجەم:

ئەگەر تەهماسب، لە ئەنجامی ناوبژی قەیسەردا، بە ئارەزوی خۆی ئەو شارانەی لە مادەی سێیەم دا ناو براون بە تورکیا بسپێرێ، تورکیاش ئەو بە شای ئێران ئەناسێ و، هەمو جۆرە یاریدەیەکێ ئەکا. قەیسەر بەپێی ڕێککەوتنەکەی خۆی لە گەڵ تەهماسب، یاریدەی کاریگەری ئەکا و هەمو گفتەکانی خۆی بەرامبەر ئەو جێبەجێ ئەکات، تا ئەو بە عینوانی واریسی قانونی بتوانێ ئیمپراتۆریی ئێران و ئەصفەهان لە دەستی مەحمودی داگیرکەر ڕزگار بکا. ئەگەر مەحمود، لەم بارەدا، هێرش بباتە سەر تورکیا، ڕوسیاش ئەکەوێتە کار بۆ یارمەتی دانی تا ئەو لە ئێران دەر بکرێ. تورکیا و ڕوسیا بەپێی ئەم پێکهاتنە بۆ دانانی تەهماسب لە سەر تەختی ئێران پێکەوە هەنگاو ئەنێن.

مادەی شەشەم:

ئەگەر تەهماسب لە سپاردنی ئەو شارانەی تورکیا داوایان ئەکات خۆی بوارد، ئەو وڵاتە و روسیا لە پێشەوە ئەکەونە گرتنی بەشەکانی خۆیان، وە کاتێ لەو وڵاتەدا ئارامی و ئاسایشیان دامەزران، فەرمانڕەواییەکەی بە کەسێکی ئێرانی ئەسپێرن، کە بە تەواوی سەربەخۆ بێ. ئەو کەسەیش لە لایەن دو دەوڵەتی

ناوبراوەوە لە سەر تەخت دائەنرێ و، گوێ نادرێتە هیچ نوێنەرێکی مەحمود و، هیچ جۆرە پێکهاتنێکی لە گەڵ ناکرێ. ئەبێ ئەم ڕێککەوتنە بە بێ هیچ لێ دەرچونێ پێڕەوی بکرێ بۆ ئەوەی ئاشتی هەمیشەیی دابین بکرێ و، بەم جۆرە ئەو شارانەی دراون بە تورکیا و ڕوسیا بە یەکجاری تا هەتایە لە دەستی ئەوان دا بمێنێتەوە و، ئێرانی لە نوێ دامەزرێنراو، بەهێز بێ. سوڵتان ئەم پێکهاتنە، پاش ئەوەی لە لایەن قەیسەرەوە پەسەند کرا، ئەویشپەسەندی ئەدا.

سەرچاوە: لگهارت، لارنس: "انقراض سلسله صفویه"، ترجمه: مصطفی قلی عماد، انتشارات مروارید، (تهران 1364 ه ش)، 269 - 270.

## پاشکۆی (7):

وەرگێراوی کوردیی پەیماننامەی کوردان (4ی ئەیلوولی 1746).

ڕێککەوتننامەی کردان
لەنێوان نادر شاە و سوڵتان مەحمود خانی یەکەم
بە هۆی:
وەکیلی ئێران حەسەن عەلی خان
ڕسپێردراوی عوسمانی والی‌ی بەغداد ئەحمەد پاشا
لە مانگی شەعبانی 1159ك (1746ز) دا بەستراوە
پێشەکی: دیاریکردنی سنوری هەردو مەملەکەت.
فەسڵی یەکەم: دەربارەی حاجییان.
فەسڵی دوەم: دانانی نوێنەرانی هەردو دەوڵەت لە دەرباری یەکتری‌دا.
فەسڵی سێیەم: دیلەکانی هەردو دەوڵەت.
فەسڵی پاشکۆ: دەربارەی سنوری هەردو مەملەکەت و هەندێ مەرج لە بارەی دین. چەن مەرجێ دەربارەی زائێران و ڕەعیەتەکانی ئێران لە عوسمانی دا - دانەوەی هەڵاتوان.

بنچینە:

ئەو ڕێککەوتنەی لە سەردەمی سوڵتان مورداخانی چوارەم دا لە نێوان هەردو دەوڵەت دا کراوە پێڕەوی ئەکرێ و، ئەو سنورانەی لە ڕێککەوتنی گۆڕین دا دیاری کراون بێ هیچ دەسکاری و گۆڕینێ وەکو خۆیان ئەمێنن.

مەرج:

لێرە بە دواوە ئەبێ فیتنە خەوتو بێت و تیغی دوژمنایەتی لە کێلان‌دا بێ،

ئەوەی شایەنی شانی هەردولا و چاکە و خێری هەردو دەوڵەت بێ. لە هەمو بوارێك دا جێبەجێ بکرێ و، هەرولا خۆیان لەو کارانە ببوێرن کە ئەبنە هۆی ناخۆشی و، پێچەوانەی تەبایی و هۆگرین.

فەسڵی یەکەم:

حاجیانی ئێرانی کە لە ڕێی بەغداد و شامەوە ئەچن بۆ بیت الله الحرام، ئەو والی و حاکم و ئەمیرحەجانەی لە سەر ڕێگەیان دان. ئەبێ ئەوانە بە ئەمینی و سەلامەتی لە شوێنێکەوە بگەیەننە شوێنێکی تر، صیانەتی حاڵ و ڕیعایەتی ئەحواڵیان بە لازم بزانن.

فەسڵی دوەم:

بۆ بەهێز کردنی دۆستایەتی و زیاد کردنی یەکێتی لە نێوانی هەردو دەوڵەت دا، هەر سێ ساڵ ئەبێ یەکێك لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە لە عوسمانی و یەکێك لە لایەنی عوسمانییەوە لە ئێران بێ، مەسرەفی ئەوانەش لە سەر هەردولا بێ.

فەسڵی سێیەم:

دیلەکانی هەردولا بەربدرێن، کڕین و فرۆشتنیان ڕەوانییە، هەر کەسێکیان ویستی بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی ڕێگەی لێ نەگیرێ.

فەسڵی پاشکۆ:

ئەو سنورەی لە سەردەمی سوڵتان مورادخاندا دیاری کراوە جێبەجێ بکرێ. دەسەڵاتدارانی سنورەکان کارێك نەکەن پێچەوانەی دۆستیی هەردولا بێ. سەرەڕای ئەمانە، لەبەر ئەوەی خەڵکی ئێران وازیان هێناوە لەو ئەحواڵە ناشایستەیەی، لە سەردەمی صەفەویەت دا، دایان هێنا بو، وە لە ئوصولی عەقائیدا چونەتە سەر ڕێگەی ئەهلی سوننەت، بۆیە خولەفای ڕاشیدین بە خەیری مەرزی ئەبێ یاد بکەن و، لێرە بە دواوە لە گەڵ خەڵکی ئێران کە

هاتوچۆی کەعبەی موکەڕەمە و مەدینەی مونەوەرە و سەرانسەری وڵاتانی ئیسلام ئەکەن، ئەبێ هەمان ڕەفتاریان لە گەڵ بکرێ لە گەڵ حاجییان و زائیرانی ڕۆم و وڵاتانی ئیسلامی تر ئەکرێ، وە بە ناوی دورومە یا بە ناوێکی ترەوە کە خیلافی شەرع و قانون بێ هیچیان لێ نەسێنرێ.

هەروەها ئەو زائیرانەی ئەچن بۆ عەتەباتی عالیات، مادەم مالولیتجارەیان پێ نەبێ حاکم و موباشیرانی بەغداد داوای باجیان لێ نەکەن و، هەر کەسێ مالولیتجارەی پێ بو بەپێ ی قاعیدە و عادەتی دێرینە گومرگ بدا و لەوە زیاتری لێ داوا نەکرێ. لەولاش لەگەڵ تاجیر و ئەهالی ڕۆم بە هەمان شێوە ڕەفتار بکرێ.

لەدوای تاریخی ئەم پەیماننامەیەوە ئەگەر لە خەڵکی ئێران بۆ ڕۆم و لە خەڵکی ڕۆم بۆ ئێران هەڵاتن داڵدە نەدرێن و، ئەگەر داوا کرانەوە بدرێنەوە دەست وەکیلەکانی هەردولا.

سەرچاوە: نوائی، دکتر عبدالحسین: "نادر شاه و بازماندگانش"، انتشارات زرین، (تهران 1368 ش)، 373 – 383

## پاشکۆی (8) :

سەربازێکی سەفەوی



**پاشكۆی (9) :**

سەربازێكی عوسمانی



**پاشکۆی (11) :**

فەتحعەلی شا (1797- 1834).



**پاشکۆی (13) :**

شاهزاده عەبباس میرزا-1821



**پاشکۆی (14) :**

دوو سەربازی کورد لە هەورەمان



## پاشکۆی (15) :
## پیاوێکی هۆزی جاف



## پاشکۆی (16) :
## فەرمانبەرێکی پاشای سلێمانی



AN OFFICER OF THE PASHA OF SULIMANIA.

*Published by Duncan Paternoster Row.*

## پاشکۆی (18):

وەرگێراوی کوردیی پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم (28ی تەمموزی 1823).

مەبەست لە نوسینی ئەم نامە ناوازەیە لەم چەند ساڵەدا بە هۆی ڕودانی هەندێ عەواریزوە لە نێوان هەردو دەوڵەتی بەرزی ئیسلام دا
پێوەندییەکانی صوڵح و صەفوەت و زەوابیتی دۆستی و ئولفەتی دێرین گۆڕا بە نیقار و خصومەت و بو بە هۆی جەنگ و کدورەت. بە موقتەزای جیهەتی جامیعەی ئیسلام و ڕازی نەبونی هەردولا بە ڕژانی خوێن و ڕودانی ئەو جۆرە قەوماو و غەوغایە، هەردو دەوڵەتی گەورە ئارەزو و موافەقەتیان دەربڕیوە بۆ گێڕانەوەی ئاشتی و مەوەدەت و نوێ کردنەوەی دۆستی و مەحەببەت.
بەپێی فەرمانی هومایونی "ئەعلاحەزرەت، کەیهان حیشمەت، موڵك بەخش، موڵك گیر، ئارایشی تاج و سەریر، خدێوی زەمین و زەمان، جەمالی ئیسلام و موسلیمین، جەلالی دنیا و دین، غیاسی حەق و یەقین، قارەمانی ئاو و گڵ، سێبەری خوای ڕاکێشراو بە سەر هەردو ئەرزدا، حافزی حەوزەی موسڵمانی، باسیتی بیساتی جیهانبانی، داوەری جەمشید جاە، سولەیمان دەستگاە، ئەنجوم سپا، ئیسلام پەنا، زینەت بەخشی تەختی کەیان، مەلیکی ملوکی جیهان، تاج بەخشی کامەران، شاهنشاهی مەمالیکی ئێران، خاقان کوڕی خاقان، غازی: فەتحعەلی شا، خلد الله ملکه و اقباله، وە حوکمی مەئموریەتنامەی ڕەفیعەی غوڕەی غەڕای دەوڵەت و شەهریاری، دەوحەی عولیای شەوکەت و جیهانداری، مالیکی ڕیقاب، گەردون جەناب، کەیوان هیمەت، جەرجیس فیتنەت، مولك فەزای، مولك ستای، ڕوکنی ڕەکین جەلال،

غوصنی ڕەتیب ئیقبال، شازادەی ئازادە، وەلیعەهدی دەوڵەتی عەلیەی ئێران عەباس میرزا، عز نصره، ئەم عەبدە مەملوك و چاکیرە جان نیسارەی بە وەکالەتنامە موباهی و، مەخصوص کردوە.

لە لایەن دەوڵەتی بەرزی عوسمانییشەوە، نامە و فەرمانی، ئەعلا حەزرەت، کەیوان مەنزیلەت، خۆری فەلەکی شەهریاری، مانگی ئاسۆی تاجداری، پادشاهی ئیسلام پەنا، سوڵتانی هەردو ئەرز و هەردو، خادیمی حەرەمەینی شەریفەین، خاوەن شەوکەت و شەهامەت، سوڵتانی کوڕی سوڵتان، غازی: مەحمود خان، ابد الله ملکه و اقباله، نامە بە جەنابی "عیزەت نیصاب، نەبالەت ئینتیساب، جەلالەت ئیکتیساب، تەواوکەری ئوموری جمهور بە بیری تیژ، تەختکەری قەواعیدی ئومور بە ڕەئی ڕاست، صەدری ئەسبەقی ئەکرەم، والی‌ی ولایەتی ئەرزەنەی ڕۆم، سەرعەسکەری لای ڕۆژهەڵات: موحەممەد ئەمین ڕەئوف پاشا، دامە مەجدوهو، عەتا و عینایەت کراوە.

ئەم عەبدە مەملوکە لە شاری ناوبراو لەگەڵ سەرعەسکەری ناوبراو، پاش ئاڵوگۆڕی وەکالەتنامە پیرۆزەکانیان بۆ ئەنجومەنی گفتوگۆ پێك هاتن، موصالەحەی پیرۆز بەم ئاینە تەرتیب و تەعیین کرا.

بنچینە:

پەیمانی ئاشتی کە لە 1159 دا بەستراوە، دەربارەی سنورەکانی کۆن و، مەرجەکانی پێشو سەبارەت بە حاجیان و بازرگانان و گێڕانەوەی ڕاکردوان و بەردانی دیلەکان و دانیشتنی کەسێکی دیاریکراو لە دەربارەکانی هەردو دەوڵەت دا بە تەواوی هەموی وەکو خۆیان ماون و کاریگەر و نرخداران و بە هیچ کلۆجێ خەلەلی تێ نەکەوتوە و، لە نێوان هەردو دەوڵەتی بڵندا مەرجەکانی دۆستایەتی و پێویستیەکانی تەبایی و خۆشەویستی هەمیشە ئەبێ کاری پێ بکرێ.

